# ئەدەب مێژوو

## چەپکێ لێکۆڵینەوە لە ئەدەب
## و
## بەڵگەنامەی مێژوویی کورد

**محەمەد حەمە باقی**




**هەولێر - ٢٠١٣**




**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **ئەدەب و مێژوو (چەپکێ لێکۆڵینەوە لە ئەدەب و بەڵگەنامەی مێژوویی کورد)**
- نووسین: **محەمەد حەمە باقی**
- نەخشەسازی ناوەوە: **رێدار جەعفەر**
- بەرگ: محەمەد قادر
- نرخ: (٥٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم: ٢٠١٣
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٥) ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧١١)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست


وەك بەرایی ........................................ ٧

نامەیەکی مێژوویی بۆ شێخ بەزایی تالەبانی و هەواڵی تازە ........ ٩

چەپکێ نامەی شێخ مەحموودی حەفید ........................ ٣٣

مزگێنیی دۆزینەوەی مێژووی مەرگی شاعیری ناودار ............ ١٠١

دیسان مزگێنی تازە و بەڵگەی تازەتر ........................ ١٠٧

دوونامەی نێوان شاعیری ناسراو (میسباح دیوان ـ ئەدەب) و دۆستێکی ........ ١١٥

نامەی یەکەم: ........................................ ١٢١

نامەی دووەم: ........................................ ١٢٩

دەقی نامەکەی میرزا محەمەد ساڵح بۆ عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب ........ ١٣٥

دەقی وەڵامنامەی عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب بۆ میرزا محەمەد ساڵح ........ ١٤١

وێنەی نامەی میرزا محەمەد ساڵح بۆ: عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب ........ ١٤٥

وێنەی وەڵامنامەی عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب بۆ: میرزا محەمەد ساڵح ........ ١٥١

دیتنەوەی (١٧) غەزەلی تازەی (ئەدەب ـ میسباح دیوان) ........ ١٥٥

مەستوورە مێژوونووس و مرۆڤ (١٨٠٥ ـ ١٨٤٧) ........ ١٨٩

نالی و مەستوورە ........................................ ٢١١

نالی لەسەفەرنامەی باڵوێزێکی فرەنسادا (١٩٠٦ ـ ١٩٠٧) ........ ٢٣٥

ئەنجام ........................................ ٢٤٩

مەولانا خالید (١٧٧٩ ـ ١٨٢٧ ز) ........................ ٢٥٧

بەشی یەکەم: ........................................ ٢٥٩

مەولەوی! یان گەڕانەوە بۆ سەرچاوە؟ ........................ ٢٧٥

مەولەوی تاوەگوزی و موزیك و گۆرانی ........................ ٢٩٩

مەحوی میراتگری پەیام و هەڵوێستی جوامێرانەی مەلانا خالید ........ ٣٦١

بەدواداچوونی وتارێکی مامۆستا تۆفیق وەهبی ........................................ ٣٧٥
هەندێ ئاشنای نامۆ ........................................................ ٣٨٩
ئەم کتێبەم خوێندەوە (شاری سلێمانی ـ ململانێی گروپە کۆمەڵایەتییەکان: ١٨٢٠ ـ١٩٢٠)....... ٤٠٣
هێمن موکریانی و رۆژنامەی کوردستان (١٩٥٩ ـ ١٩٦٣)................................ ٤٣١
دیاری خوێنەران نامەی (هێمن) .................................................. ٤٤٥
کوڕ: وەرگێراو لە کتێبی هەفتە ـ بەپێنووسی: مامۆستا هێمن ......................... ٤٥٦
مانای وشەی کوڕ................................................................ ٤٦١
شینی گۆران ..................................................................... ٤٦٤
بەرهەمی چاپکراوی نووسەر ......................................................... ٤٦٩
بەرهەمی داهاتوو ................................................................. ٤٧١

## وەك بەرایی

ئەم کۆمەڵە بەڵگەنامە و وتارانەی لەباوەشی ئەم کتێبەدا جێگەی خۆیان کردۆتەوە، لە سەرەتادا لە چەند ڕێبوارێکی لە یەکتر دوور و دابڕاو دەچوون، کە مێژووی هەنگاوهەڵگرتنی پێشینەکانیان، بۆ زیاتر لە (٢٥) بیست و پێنج ساڵ دەگەڕێتەوە و پاشان لە درێژایی ئەم (٢٥) ساڵەدا، بەرەبەرە، بەڵگەنامە و وتاری تریان شوێن کەوتووە، تا وایان لێهاتووە بەهەموویان کاروانێکیان پێکهێناوە. هەرچەندە هەر یەکەیان بەجیا، بۆنە و بابەت مێژووی نووسینیان لەیەکتر جیاوازە و ئەم جیاوزییەش، کەشوهەوای تایبەت و سەربەخۆی پێ بەخشیون و هەندێکیشیان، وەك بابەتەکانی: مەولانا خالید (١٧٧٤ ـ ١٨٢٧ز)، مەولەوی تاوەگۆزی (١٨٠٦ ـ ١٨٨٢ز)، نالی (١٨٠٠ ـ ١٨٧٣ز)، ئەدەب ـ میسباح دیوان (؟ ـ ١٩١٦ز)، سەرەڕای ئەوەی نەفەسی بابەتەکانیشیان کورت و خێراشن، بەڵام هەریەکەیان ڕەگەز و کەرەسە و هەوێنی کتێبی سەریەخۆیان لەخۆیاندا هەڵگرتووە. بۆیە ئەگەر مردن مەودا بدات، هەریەکەیان وەك کتێبی سەربەخۆ، دەگەنە بەر دەستتان. هەر بەو مەبەستەش لێرەدا، ئەم کەرەسە و ڕەگەزانەی ئەو چەند بابەتەم (بەر لەهەمووکەس زیاتر، بۆ بەرچاوی خۆم) بەرجەستە و یادداشت کردوون، تائەرکی لە ئەستۆگرتن و بە ئەنجام گەیاندنیان، وەك کتێبی سەربەخۆ، لەیاد و بیرەوەریی هەمیشەییمدا بژین و نەچنە خانەی لە بیرکردنەوەوە. چونکە ئەگەر لەمەودای نێوان نووسینی هەریەکە لەم بابەتانەدا، کتێبی ترم، نۆرە بڕیی لێکردبن، بەڵام دیسانیش هەرخۆم دەزانم کە چەند لەگەڵ کۆکردنەوە و تەتەڵەو تاوتوێ پێکردنی ئەم بابەتانەدا ماندوو بووم و شەونخوونیم لەگەڵدا کێشاون و چەند بەدژواریی و ڕاکەڕاك و تەقەللای بێ پشوو، ئەم کاروانی نووسینەم بەڕێ خستووە. بەتایبەتی بۆ تەواوکردنی هەندێکیان، وەك بابەتی: چەپکێ نامەی شێخ مەحموودی حەفید و نامە و بەڵگەنامەکانی شاعیری ناوداری موکریان: عەبدوڵڵابەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب (کە ئەم نموونانەی بەردەستتان لەبارەی

ناوبراوەوە، مشتێکی زۆر کەمی ئەو خەروارەن، کە لەسەر ئەم شاعیرە کۆمکردوونەتەوە) چەندان ماڵان و گوندانی خۆرهەڵاتی کوردستان بە دوایاندا گەڕاوم و دەستەودامێنی دۆست و نادۆست بووم و چەند رەنجی نەپساوم داوە و چەندیش تاسە و حەسرەتی چنگخستنیانم خواستووە!. چونکە هەریەکە لە کەرەسەکانی ئەم دوو بابەتەی ناوم هێناون، لەماوەی نزیکەی (٢٠) ساڵی تەمەنمدا، لەچەند ساڵی پچڕپچڕدا دەستم خستوون و سەریەکم ناون، کە دڵنیام هێشتا کەرەسە و نامە و بەڵگەنامەی بابەتی ئەمی دواییان (ئەدەب)، لە زۆر لەو گوندانە و قەڵەمڕەوی موکریاندا ماون و بەردەستی من نەکەوتوون و بە ئاواتی دەستخستنیانەوە دەژیم و خەونیان پێوە دەبینم. هەر بۆیەش ئەو کتێبەی بەناوی (نامە و بەڵگەنامە جێماوەکانی ئەدەب — میسباح دیوان)، لە دەمێکەوە ئامادەی چاپکردنم کرووە، بەو هیوایە دەستم راگرتووە و بەدوای دەخەم ، تا بەڵکو هەندێکی تریشم چنگ بکەوێ. جگە لە ئاواتی لە چاپدانەوەی سەرلەنوێی دیوانی (ئەدەب)، کە خۆشبەختانە، دوای دووجار چاپکردنەوەی دیوانەکەی، دیسانەوە شیعر و غەزەلی تریم دەست کەوتوون.



**محەمەد حەمە باقی**

**هاوینی ٢٠١٢ ـ هەولێر**

# نامەیەکی مێژوویی
# بۆ
# شێخ ڕەزای تاڵەبانی و هەواڵی تازە

**یەکەم:**

(کەوثـــەر) نازناوی: قازی (مەلا مەحەمەد کەریم)ی سەقزی یە، کەبە (قازی کەوثـــەر) ناسراوە، کوڕی مەلامستەفای کوڕی مەلا محەمەد سەلیمی کوڕی مەلا شەریفی قازی یە و سالی (١٢٥٦) کۆچی، بەرامبەر سالی (١٨٤٨)ی زایین، لەسەقز هاتۆتە دنیاوە.

لەسەرەتای خوێندنیدا، لای مامۆستایان: مەلا محەمەدی مودەڕیسی مزگەوتی سەقز و دواتر لای مەلا عەبدولسەلام مودەڕیسی (بانە) و ماوەیەکیش لە(بۆکان) لای مەلا محەمەد شەریف و دووساڵیش لە(ئوتومیش) لای مەلا عەبدوڵای پیرەباب و دووساڵیش لە(تورجان) لای مەلا عەلی قزلجی تورجانی خوێندویەتی...

دوای تەواوکردنی خوێندن لە(سەقز) بۆتە قازی، ناوناوەش دەرسی وتۆتەوە... لەدوای تەمەنی (**٦٢**) ساڵی، لە(**١٢**)ی جمادی الاخری ـ ی سالی (**١٣٢٨**)ی کۆچی، بەرامبەر (**١٩١٠/٦/٢١ی** ز) کۆچی دوایی کردووە. (کەوثـــەر) لە بنەماڵە کۆنەکانی سەقزـ ن، کە پشتاوپشت بەبنەماڵەی (شێخ الاسلام) بە

ناوبانگن. خۆیشی بە خەتخۆش و شاعیر و ئەدیب ناسراوە و دیوانێکی شیعری بە فارسی لەپاش بەجێماوە، کە هێشتا چاپ نەکراوە[1]

جگە لەم دیوانە، کۆمەڵێك نامەی لەدوا بەجێماوە، کە ئەمانیش هەموویان بەزمانی فارسی و بە پەخشانێکی ئەدەبیی زۆر باڵا دارێژراون و ئەم نامانە، وێنەی دووەمی ئەو نامانەن، کە لە ژیانی خۆیدا بۆ دۆستگەل و شاعیران و رووناکبیران و لێپرساوان و وەزیری قاجار و نامەیکیشی بۆ (ناسرەدین شای قاجار ـ **١٨٤٨ز ـ ١٨٩٦ز)** نووسیونی...

ئەگەرچی لە دیوانە شیعرەکەی و لە ئەلبوومی ئەو کۆمەڵە نامە ئەدەبییانەدا، کە لە قازی کەوشــەر جێماون، چ شیعرەکان و چ نامەکانیش هیچیان بەکوردی نین... بەڵام دیارە کە کوردییەکی باشی بەخوێندنەوە و نووسین زانیوە و شیعری شاعیرانی کوردی لەبەر بووە و لەگەڵ هێندێکیشیاندا سەروبەندێکی هەبووە... چونکە یەکێك لەم نامە ئەدەبییانەی بۆ شاعیری گەورە (شێخ رەزای تاڵەبانی **١٨٣٦ ـ ١٩١٠ز)** نووسیوە..

ئەم نامەیەی (قازی کەوشــەر)، بۆ (شێخ رەزای تاڵەبانی) مێژووی لەسەر نییە" بەڵام بەوەدا کە لە دووتوێی نامەکەدا، دێڕە شیعرێکی (شێخ رەزا) تێهەڵکێش دەکات، کە لەم شیعری خواستووە:

**خزمینە، مەدەن پەنجە، لەگەڵ عەشرەتی جافا**
**مێرووله، نەچێ چاکە، بەگژ قوللەیی قافا!**

وەك دواتریش باسی دەکەین، ئەم شیعرە، لە هاوینی ساڵی (**١٨٦٥ز**)دا نووسراوە، بۆیە دەبێ ئەم نامەیە، دوای ئەو ساڵە نووسرابێ.

---

(١) تاریخ مشاهیر کرد ـ تألیف: بابا مردوخ روحانی، (شیوا)، انتشارات سروش ـ تهران ١٣٦٦ ص ١١٨ ـ نامەکەم بەهۆی نەوەکانی بنەماڵەی بەڕێزی (قازی کەوشــەر)ەوە، لە سەقز، دەست کەوت. سوپاسیان دەکەم.

ئەم نامەیەی (قازی کەوثـــەر)، چەند لایەنێکی گرنگی تێدایە، کەجێی سەرنجن:

١ ـ نامەکە لەبارەی دارِشتن و هەڵچنینی بناغەی رستەسازیی و وێنەی شیعریی و رەوانبێژییەوە، پارچە پەخشانێکی ئەدەبیی زۆر باڵا و بەپیز و تۆکمەیە، کە نیشانەی شارەزایی و ئاستی تێگەیشتنی یەکجار بەرزی (قازی کەوثـــەر)ە. لە جیهانی ئەدەب و دەنگوباسی ئەدەبیی و ئاگاداربوونی لە باسوخواسی شاعیرانی کۆن و سەردەمی خۆی.

٢ ـ لەنامەکەدا، نیشانەیەکی ئاشکرای پێوەندی توند و تۆڵی نووسەرانی هەردوو بەشی کوردستانی دابەشکراوی نێوان قاجاری و عوسمانی تێدایە...

٣ ـ نامەکە، ئەوە دەسەلمێنیّ، کە شیعر و شاعیرێتی و ناوبانگی (شێخ رەزای تاڵەبانی ـ کە هێشتا خۆی لە ژیان و لە هەرِەتی لاوێتی و شاعیرێتیدا بووە، لە کوردستانی بندەستی قاجاریدا)، زۆر بەربڵاو و لەسەر زاران بووە و شیعری دەستاودەست و گونداوگوند و شاران گەرِاوە.. بۆیە بۆ رووناکیی خستنەسەر ئەو زانیارییانە، بەچاکم زانی لەناو نامەگەلە جێماوەکەی (قازی کەوثـــەر)دا، ئەم نامە گرنگەی لیّ بکەمە کوردی، کە زۆری پێوە ماندوو بووم و هەوڵیشم داوە بناغەی رستەکان و مەبەستی ئەدەبیی و پەیامی (قازی کەوثـــەر) وەك خۆی بهێڵمەوە.... ئەمەش دەقی نامەکەیە:

**بۆ خزمەتی جەنابی زمانپاراوترینی شاعیران: شێخ رەزا بەسەرگەردی وجوودی بەختەوەرت بم.**

دوای پێکەشکردنی ئارەزوومەندیی بێ برانەوە، لەبیری درەوشاوەی ئێوەی پایەبەرزدا، ئاشکرابێ و نادیار نەمێنێتەوە...

لەو رۆژەوە ئەم کەمینەیە، توانای ئەوەی بووە، مرواریی شایستەی شیعرەکانت و وتەی تەڕ و تازەی گەوهەری بیری دەست بۆنەبراوی ئێوەی بەڕێز (خواتەمەنیان درێژ بکات) لەسەدەف دەربهێنێ و لەگوێچکەی دلّدا بیکاتە گوارە و لەلاپەڕەی دلّەی خەمیندا ببنە مایەی سەردانەواندن و بەخشین و لەکۆشکی باخی بیری کەم و کورتیدا، ببنە حوور و غیلمانی بەهەشت و خزمەتگوزارانی سەردارانی تاجدار.. سەرومڕی سالّ و مانگ و سەعات و رۆژ و شەو، ئارەزووی ئەم چاوە فرمێسکاوییە، دیتنی روخساری ئەو زاتە داوێنپاکەیە.. دلّخوازی ئەم ستەمدیدەیەی رۆژگار، بۆ هەمیشە، خوێندنەوەی شیعری ئەو پیرۆزوتارەیە، کە بەزمان و گیان و دیار و نادیار، لە پێشگای یەزدانی پەروەردگار، لە سینەی پڕ بلّێسەدا، مایەی هێوربوونی کلّپەی ئاگری دووری و هاوڕاز و هاوخەمییە...

بەلّێ لەم ماوەیەدا ئەوەی توانای لە ئەستۆگرتنی باسی ژانی دووریی و باری ئاوات و تاسەی ئەم کەمینەیەی لەباردا بوو، لە پالّەوانی دەوران، برای میهرەبان، مەلا عەبدولّلا[٢]، زیاتر بە چاك نەزانرا... بۆیە هەلی لەدەست نەدا و بەناردنی ئەم کورتە ئاوات نامەیە، کەوتە پەلە و بەکلیلی دەروازەی خستنەڕووی سکالاّ و پوختەی ئەم رازەوە، قفلّی سنووقی ئاواتی مێژینەی خۆی کردەوە و بە پشتیوانی

(٢) بە داخەوە نەزانرا ئەم (مەلا عەبدولّلا)یە کێیە!.

**کردگار، جوڵای باڵای سروشتکار، تانوپۆی سێ غەزەلی[٣]، لە پاڵاوتەی بیری خۆی، داڕشت و چنی:**

**سازم مگر سیاهی چشمان خود مداد**
**تا در لباس نامه ببینم جمال دوست[٤]**

**هەرچەند پێشکەشکردنی ئەم غەزەلانە و ناردنی ئەم دیارییانە، بۆ مەڵبەند و هەرێمگەلی دەوڵەتی عوسمانی، وەك ناردنی وردە(زیر)ەو (شاڵ)ە، بۆ(کرمان)[٥]، یان وەك لافی خەتخۆشییە لای هونەرمەندانی ئەسفەهانی[٦] بە تایبەتیش بۆ وڵاتی (کەرکووك)، کە بەبوونی تەشریفی موبارەکی ئێوە (خوا دەوامی گەورەییتان بدات)، وەك زێڕی قاڵی کەمعەییاری بێبرەوە، کە شایستەی بەکارهێنان نەبێ.. بەڵام رەنگە لەکاتی ناوبردنی ئەم کەمینەیەدا، ببێتە مایەی یادگار و لەکاتی خوێندنەوەشدا، بە گوێرەی ئایەتی: (لا یکلف الله نفساً الا وسعها)... ببێتە مایەی یادکردنەوە، بۆیە ناردمە خزمەتتان... چونکە وتوویانە:**

---

(٣) ئەم سێ غەزەلەی (قازی کەوثـەر)یش نەزنرا کامانەن، چونکە لەناو شیعرە جێماوەکانی ناوبراودا، شیعری وایان تیا نەبوو، کە ئاماژەیان بۆ ئەم مەبەستە لەسەربێ.

(٤) **واتە:** مەگەر لە رەشایی چاوی خۆم، قەڵەمێك ساز بکەم، تا لە دووتوێی نامەکەدا، جوانیی ئەو دۆستەم ببینم، کە پێشتر وێنەی ئەو دۆستە لە رەشایی چاومدا بووە.

(٥) ئەمە پەندێکی فارسییە، چونکە شاری (کرمان)ی ئێرانی، لە (زیرە) و (شاڵ)دا بەناوبانگە. واتە: کاری بێهوودەکردن، وەك چۆن بڵێین:خورما بۆ شاری بەسرە دەبا!. "سالم" هەرلەم بارییەوە دەڵێ:

**زیرە، سەرمایەیە بۆ "سالم" و "کرمـــــان"ی دەبا**
**شیعری کوردی، کێ بدا جیلوە؟ لەلای شێخی کەبیر!**

دیوانی سالم، ل٦٩

(٦) ئەمەش هەر وەك پەندی سەرەوە وایە، چونکە هونەرمەندان و خۆشنووسانی (ئەسفەهان) وێنەیان کەمە.

**طاعت ار هیچ نباشد، گنهی باید کرد**
**در دل دوست بهر حیله رهی باید کرد**(۷)

منیش بەناردنی ئەم شیعرە ناڕێکانە، ڕێگەی دۆستایەتیم لە دڵی ئێوەدا کردۆتەوە.. جەنابیشتان بەوپەڕی سۆز و ویژدانی خواپێداوی خۆتانەوە، چاوپۆشیی و پەسندی چەشی گەوهەرباری بفەرموون... داخواز و تکاکاریشم چەند لاپەڕەیەك، لە مرواری شیعری خۆتان، کە لە بەردەستدان و ئامادەن، لەهەر بابەتێك بن، چ لە بابەت ستایشی خوا و چ پیاهەڵدان و چ قەسیدە و چ لاقرتێ و توانج و داشۆرین و چ پارچە غەزەل و چوارینە، کە لەم هەرێمانە لەبەردڵن و داواکارییان یەکجار زۆرە، بە تایبەتی لای ئەم کەمینەیە، وەك گۆگردی سوور وایە، بەناوی دیاری و خەڵاتەوە، کەلای چاو و دڵڕوونەکان، دیارییەکی بێهاوتایە و لەگەڵ وەڵامنامەکەدا، بە مەلا عەبدوڵلادا بۆمی ڕەوانە بفەرموون، تا بۆ بڵاوکردنەوە و برەوپێدانیان، کەسانێکی زۆر لە وێژەی ئێوەی بەڕێز و دەستڕەنگینیتان ئاگادار بکەمەوە... چونکە خۆت واتەنی (حەیفە بڕزێ تیغی مجەوهەر لە غیلافا)(۸)

---

(۷) **واته:** ئەگەر خوا پەرستیی هیچ دادێ نەدا، دەبێ گوناهێك بکەیت، تا بەهەر فێڵێك بێت، ڕێگەیەك بۆ ناو دڵی دۆست بکەیتەوە.

ئەم بەیتە، شیعری، (نەشاطی ئەسفەهانی ۱۷٦۱ز ـ ۱۸۲۸ز) یە، بەڵام بەیتەکە لە دیوانی (نەشاطی ئەسفەهانی)دا بەمجۆرەیە:

**طـاعـت ار دست نیاید، گنهی باید کرد**

**در دل دوست بهر حیله، رهی باید کرد**

بڕوانە: گنجینهء دیوان نشاط اصفهانی ـ با تصحیح و مقدمة دکتر حسین نجفی ـ چاپ دوم ـ چاپ تابش ـ ۱۳٦۲ شمسی ـ انتشارات شرق ـ ص ۹٦.

( **۸** ) ئاماژەیە بۆ شیعرێکی شێخ ڕەزای تاڵەبانی کە سەرەتاکەی ئەمەیە:

**خزمینە مەدەن پەنجە، لەگەڵ عەشرەتی جافا**

**مێروولە، نەچێ چاکە، بەگژ قوللەیی قافا**

لەکۆتاییدا خوا تەمەنتان درێژ بکات و هەمیشەش چاوەڕوانی مژدەی سەلامەتی و فەرمانتانم...

**بدون سابقه ابلاغ گفته‌اند خطا است**
**ولی بسوی هنرمند و اهل فضل، روا است**
**سؤال کردم، ازین نکته از وزیر خرد**
**جواب داد: که آری جناب شیخ رضا است[٩]**

---

**کێ بێ لە دلێرانی عەشایر، کە نەچووبێ**
**وەك تیری ئەجەل، نووکی رمی جافی بەنافا!**
**چونکو رەسەنن، ورد و درشتیان هەموو جەنگین**
**مەی سارییە نەشئەی، چ لەدوردا، چ لە سافا**
**وابێ خەم و پەروا دەچنە عەرسەیی هەیجا**
**تو ناچییە سەر دۆشەکی بووکێ لە زەفافا**
**خوێنرێژو شەرەنگێزو عەدوومەندو زەفەرمەند**
**کامیان کە گەنە، وەك شێرە لە مەیدانی مەسافا**
**عوسمان بەگیان، ئامرە، وەقتێ کە دەڵێ: دەی(*)**
**دێنە جەوەلان، هەروەکو ((حاجی)) لە تەوافا**
**یأتون الی الحرب صغاراً و کباراً**
**یسعون الی الامر ثقالا و خفافا**
**خواهم زخدا هرکه شود دشمن جاهت**
**کۆتی لەدەسا، دەس لەملا، من لە تەنافا**
**رەحمێ بکە با (( شێخ رەزا )) بێتەوە گوفتار**
**حەیفە بڕزێ تیغی مجەوهەر، لە غیلافا**

بڕوانە: دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، چاپی یەکەم ـ **١٩٤٦ز، ل ٣ و ٤**.

(٩) ئەم دوو بەیتەی دوایی، شیعری (قازی کەوپەر)ە.

واتە:

بەبێ پێشەکی، ئاگادار کردنەوە، خەتایە بەڵام بۆ هونەرمەندان و بەهرەوەران، ڕەوایە

لەم بارەیەوە پرسیارم لەوەزیری هزر کرد وتی: بەڵێ قەیناکە، جەنابی (شێخ ڕەزا)یە

❊ ❊ ❊

---

**سەرنج:** وشەی (کەمینە)م، لە جیاتی وشەی (حقیر)ی عەرەبی بەکاربردووە، بە پێودانی: سەنگین، دێرین، شیرین... تاد، دامڕشتووە، ئەگینا دەزانم وشەی (کەمینە) لە دیوی کوردستانی ئێراندا بۆ (مێینە) بەکار دێ.

(❊) ئەم نیوە بەیتە لەتێکڕای دیوانە چاپکراوەکانی شێخ ڕەزادا، بەهەڵەو بەجۆرێتر نووسراون.

**دووەم:**

هەر ئەو شیعرەی شێخ رەزا، کە لە نامەکەی (قازی کەوثـــەر)دا، نیوە دێڕێکی هاتبوو، واتە ئەو شیعرەی، کە سەرەتایەکەی بەم بەیتە دەست پێدەکات:

**خزمینە، مەدەن پەنجە، لەگەڵ عەشیرەتی جافا**
**مێروولە نەچێ چاکە، بەگژ قوللەیی قافا**

پێشتر، دەمێك بوو، هەمیشە لەخۆم دەپرسی: ئاخۆ مەبەستی شێخ رەزا لەم شیعرە و رووی دەمی و واژەی (خزمینە)ی بۆ کێ بێ؟ لە وەرامدا جارجارە ئەوەم بە بیردا دەهات، کە دەبێ مەبەستی لەخزمانی خۆی، واتە (تاڵەبانی) بێت... و تکایان لێ بکات، کە لەگەڵ عەشیرەتی ئازا و سەرکەشی (جاف)دا تێك هەڵنەچن... تا ئەم ساڵانەی دوایی، کە ژیانی ئاوارەیی، لە شاری جوانکیلەی (سەقز)دا گلی دامەوە. رۆژێ لەگەڵ هاوڕێیەکی ئەدەبدۆستمدا، (سەرهەنگ: رەشیدخانی ناهید)، لە هۆزی بەناوبانگ و بەربلاوی (فەیزوڵڵا بەگ)[١٠] لە

---

(١٠) فەیزوڵڵا بەگ (؟ ـ ١٨٨٢ز) کوڕە گەورەی ئەوڕەحمان بەگ بووە. بەو هۆیەوە کە منداڵی زۆر بووە، لە ناو بەگزادەکاندا لە هەموویان بەرچاوتر بووە. هەر بۆیە لەناو بەگزادەکاندا وەك تیرەیەکی تازە و جیاواز، پێیان وتوون: فەیزوڵڵا بەگی. نووسەری ئەرمەنی: ئەسکەندەر غۆریانس، کە دۆستایەتی نزیکی لەگەڵیدا هەبووە، دەڵێ: (١٥) پازدە کوڕی هەیە و (١٠٠٠) سوارە و تفەنگچی هەیە. ئەمە ناوی (٩) کوڕی فەیزوڵڵا بەگن: حاجی محەمەد، ساڵح بەگ، حاجی محەمەد حەسەن بەگ، شێر بەگ، حاجی سەلیم خانی سەرتیپ (کە شاعیریش بوو)، ئەمانوڵڵا بەگ، کەیخسرەو بەگ، عەبدولڕەحمان بەگ.

**بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە بنواڕە: محەمەد حەمە باقی:** ( شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵا لە بەڵگەنامەی قاجاریدا، چاپەمەنی موکریانی، هەولێر، ساڵی(٢٠٠٠)، ل **٥٥٩**)

سەقزەوە بە ئۆتۆمبێل بەرەو (بۆکان) دەچووین.. لەنیوەڕێدا لە ئاستی (پیر یوونس)دا هاوڕێکەم لایەکی بۆ لای ڕاستی ڕێگەکە کردەوە و پێمی وت:

ئا لێرەدا عەشیرەتی (جاف) و هۆزی (فەیزوڵلا بەگ)، شەڕە سەختەکەیان کردووە.

وتم: کامە شەڕ؟!

وتی: ئەو شەڕەی کە (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) شیعرە بەناوبانگەکەی بۆ وتوون...

وتم: کام شیعرەیان؟!

وتی: ئەو شیعرەیان کە دەڵێ:

**خزمینە! مەدەن پەنجە لەگەڵ عەشیرەتی جافا....**

ئیتر هاوڕێکەم کەوتە گێڕانەوەی چۆنییەتی ڕوودان و ئاکامی شەڕەکە، کە وەك دەزانن: عەشیرەتی کۆچەری (جاف) لە دێرزەمانەوە، تا سەرەتای هەڵایسانی شەڕی یەکەمی جیهان، بەو هۆیەوە کە ئاژەڵدارییان کردووە و ئەم پیشەیەش چونکە پێویستی بە دۆزینەوەی لەوەڕگەی بەردەوام هەیە.. بۆیە هەموو هاوینان لە دەشتی (شارەزوور) و (کفری) و (کەلار) و (شاکەل) و ئەمبەروئەوبەری ڕووباری سیروانەوە، ڕوویان لە ناوچە کوێستانەکانی خۆرهەڵاتی خۆیان کردووە و بە بناری (هەورامان)و (مەریوان) و (شلێر) و (ناوخوان) و (بانە) و (نەکەرۆز) و (سەر شیوی سەقز)دا هەڵگەڕاون و گەیشتوونەتە ناوچە ساردەسێرەکانی وەك: (چل چەمە)ی (سەقز) و (بۆکان) و (هۆبەتوو)ی نێوان سەقز و (دیواندەرە) و ناوچەی (سارال) و تا (بان لێلاخ)ی خۆرهەڵاتی شاری سنە، پەرت و بڵاوبوونەتەوە و بەهەزاران هۆبە ڕەشماڵیان بەم ناوچە بەرین و زۆزانانەدا هەڵداوە و بەدەم کۆچ و ڕەوت و گوزەرانیانەوە، لەم هەرێمانەدا، تووشی ماندووبوونێکی زۆر و دەستە و یەخەبوونێکی هەمیشەیی دانیشتووانە ڕەسەنەکانی ئەو ناوچانە بوون، کە لەوەڕگەی سەوزی تێدا بووە و بەڵگەنامەکان و ڕێکەوتننامەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی قاجاری و عوسمانیش پڕن لە باسی گێرە و کێشەی هۆز و تیرە پەرت و بڵاوەکانی (جاف) و گازندە و هاواری کۆچ و ڕەوی ئەو هۆزانەی هەمیشەیی جاف پێشێلی کردوون.. لاپەڕەکانی زنجیرە کتێبی (ڕشتەی مرواری)ی مامۆستا (عەلائەدین سەجادی)ش. پڕن لە باسوخواسی زۆر شیرین و دەوڵەمەندی ئەو

ڕۆژگارانەی (جاف).. لەبەرئەمە، ئەم داروباری ژیانە پڕ لە ڕووداوەی جافەکان، گیانێکی سەرچڵ و تووڕەی داونەتێ، کە ناچار بوون لەو کۆچە بەردەوامەیاندا، چەکی پێویست بۆ شەڕ و بەرنگاریی، لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرن و لەگەڵ زۆر هۆز و خێڵی نیشتەجێدا، تووشی شەڕ و بەرهەڵستی بێن و بەم هۆیەوە ناوبانگیان بە ئازا و شەڕانیی دەربچێ! کە دیارە ئەم شەڕەشیان لەگەڵ هۆزی گەورەی (فەیزوڵلا بەگی)دا، کە لە دەمێکەوە لە ناوچەکانی دەوروبەری (سەقز) و (بۆکان) و (موکریان)دا نیشتەجێن ـ یەکێکە لەو شەڕ و ڕووداوانەی لە مێژووی (جاف)دا بەسەریان هاتووە.

شایانی وتنە هۆزی (فەیزوڵلا بەگی)، جگە لە پیاوی ئازا و جوامێر و ناودار، گەلێ شاعیر و هونەرمەندی دەنگخۆش و گۆرانیبێژی ناسراویشیان تێدا هەڵکەوتووە، کە دەتوانم بڵێم: زۆربەیان شاعیر و هونەرمەندن و ئەوەی وەك تاقیکردنەوەش لە بارەیانەوە دەزانرێ، لە دەمێکەوە لە کوردستانی ئێراندا، هونەری نیگارکێشیان، لەسەر دەستی هونەرمەندانی ئەم هۆزەدا پەروەردە دەبێ کە بەسەرکردنەوەی یەکەیەکەی ئەو هونەرمەندانە، جێگەیەکی تایبەتی بۆ وتار و لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ، پێویستە. بۆیە دەگەڕێمەوە بۆ کاکڵی مەبەستەکە و دەڵێم: کاتێ جافەکان لەناوچەکانی سەقز و بۆکاندا، لەگەڵ هۆزی (فەیزوڵلا بەگی)دا تێهەڵچوون و بەگژ یەکدا چوون، شەڕەکەیان خایاندوویەتی و هەردوو لایان هێز و لەشکریان بۆ سەریەکتر کۆکردۆتەوە.. کە بەم کارە، هەواڵی لەشکرکێشی و عەشیرەت کۆکردنەوە، بۆ شەڕەکە، کە ڕەنگە چەند مانگێکی خایاندبێ، بەناوچە دوورەکانی کوردستاندا بڵاوبۆتەوە و (شێخ ڕەزای تاڵەبانی)ش وەك زۆربەی خەڵکی ئەو ڕۆژگارە، بە پەرۆشەوە بە هەواڵەکە سڵەمیوەتەوە و بە نەفەسێکی زۆر کوردانە و جگەرسۆزانە، لە پارچەیەکی تری کوردستانی بندەستی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە، بەواژەی (خزمینە)! ڕووی دەمی لە هۆزی (فەیزوڵلا بەگی) دەکات و داوایان لێ دەکات لەگەڵ عەشیرەتی (جاف)دا تێهەڵنەچن..

هەرچەند هەڵوێستەکەی (شێخ ڕەزا) زۆر دڵسۆزانەشە، بەڵام لەهەمان کاتدا جۆرێ لایەنداریی و ئاماژەی سووکە هەڕەشەیەکیشی بۆ ئەوانە (هۆزی فەیزوڵلا بەگ) تێدایە، کە دەیانەوێ لەگەڵ (جاف)دا بجەنگن. چونکە (شێخ ڕەزا)ش، وەك

خەڵکی تر، وەك لەسەرووتریش وتمان، ناوبانگی (جاف)ی بە ئازا و دلێر بیستووە.. کەچی دیارە جوامێرانی (فەیزوڵڵا بەگی)یش رادەی بێزاریی و تووڕەبوونیان لە دەستدرێژیی و بێپەروایی هەمیشەی جافەکان (وەك دەڵێن) گەیشتۆتە سەر ئێسقانیان و ئەوپەڕی سنووری ددان بەخۆداگرتن و ناچار بوون بۆ سنووردانان، بۆ زیادەڕۆیی و پێ لە یاسا نانی جافەکان، کە بەهۆی ئەوەی لەنێوان هەردوو سنووری قاجاری و عوسمانیدا ژیاون، لەهەر پارچەیەکی ئەو دوو دەوڵەتەدا، بێ یاساییەك بکەن، خۆیان بگەیننە پارچەکەی تر و نەکەونە بەر سزا و تۆڵە لێسەندنەوە.. لەگەڵیاندا بجەنگن و لە ئاکامیشدا بەسەر جافەکان دا سەربکەون و بیانکێشنن. بۆیە سەرۆکێکی ئەو سەردەمەی هۆزی (فەیزوڵڵا بەگی)یش، کەناوی (حاجی سەلیم خان) و لەهەمان کاتدا شاعیر و نازناوی (حاجی سەرتیپ) بووە،[11] دوای بڕانەوەی شەڕەکە و سەرکەوتنی هۆزی (فەیزوڵڵا بەگی)، بە شیعرێکی جوان و پڕ لەنەزاکەت، کە بەهەمان کێش و قافیەش دەست پێ بکات.. وەڵامی شیعرەکەی (شێخ رەزا) بداتەوە، کە تێکڕای شیعرەکەی (شێخ رەزا) وەك لە لاپەڕەکانی (٣، ٤)ی دیوانەکەی و زۆر جێگەی تر و دواتر لە ژمارە (٢٠)ی مامۆستای کورددا بڵاوبۆتەوە، (٩) نۆ بەیتە.. بەڵام ئەم وەڵامەی (حاجی سەرتیپ) لەهەموو ئەو سەرچاوانەدا، کە بڵاویان کردۆتەوە، هەر تەنیا (٧) بەیتە و ئەمە یەکەمجارە هەموو شیعرەکەی حاجی سەلیم خانی سەرتیپ، کە (٩) بەیتە و لە رێگەی ماڵباتی فەیزوڵڵابەگی یەوە چنگم خستووە، بە تەواوی و وەك خۆی بڵاودەبێتەوە، کە ئەمەیە:

---

(١١) سەفەرنامەیەکی هێشتا چاپنەکراوی بەفارسی لێ بەجێ ماوە و تایبەتە بەسەفەری ئەو رۆژگارەی (حەج)...

**نەیبیستووە چەند ساڵە، لەمەوبەر، لە مەسافا**
**هەر جافە، دەچوو نووکی ڕمی موکریی بە نافا**
**حازر نەبوو ئەو دەم، کە بەڕم حاجی سەلیم خان**
**دەیکرد جەوەلان هەر وەکو توفێ لە تەوافا**
**تیپی عەدوو، وەك پۆلی قولنگ، ئەو وەکو شەمقار**
**تێکی دەشکاند، یەك یەك و دەیخست لە مەسافا**
**(شێخ) بێخەبەرە، لەم قسە مەشهوورە، لە ئافاق**
**حەربەی ڕمی ئەو بوو، کە بەجێما لە غیلافا**
**هەر وا کوڕە جاف بوو، لەبەر زەربی دلێران**
**ناڵینی دەهات، هەر وەکو بووکێ لە زەفافا**
**یـــــــرمون من البأس تلالا و جـــــبالا**
**یکـــــــنون مـــن الـــــرّوع شـــــعاعاً و کفافا**
**زۆر کەس، لەجەوانانی ئەوان بوو، بە ئەسیر هات**
**دەست بەستەو و تەن خەستەو و گەردەن لەتەنافا**
**چاك وایە، نەکات مەدحی ئەوان، نەك بڵێ مونسیف**
**ئەم مەدحە، کە (شێخ) فەرموویەتی، لاف و گەزافا**
**بۆ مەدحی ئەوان، کافییە (شێخ) بێت و نەزەر کات**
**مەعلوومە کە مـەعنای لـە لوغەتدا چییە: (جافا)**

* * *

وەك وتمان، بەو هۆیەوە کە کۆچ و ڕەوی گەرمیان و کوێستانی ساڵانە و بەردەوامی (جاف)، بەو ناوچە بەرینانەدا، گیروگرفتی زۆری بۆ دروستکردوون و ماوەیەکە زۆریانم لەو بەڵگەنامانە لە بەردەستدان و زۆریانم بۆ کوردی تەرجەمە کردوون و پڕن لە سنووربەزندانی جافەکان.. بۆیە گەورە لێپرسراوانی هەردوو دەوڵەتی ناوبراویش، لەدەست (جاف) بێزاربوون و سەرئێشەیان بەدەستیانەوە زۆر

تووش بووه و پێیان خۆش بووه جافەکان تووشی تێکشکان و زیان بن، هەر لەبەرئەمەشە لە دوای ئەم شەڕەی نێوان ئەم دوو خێڵە گەورەیەی کورد (جاف و فەیزوڵڵا بەگی)، (ناسرەدین شای قاجار **١٨٤٨ز ـ ١٨٩٦ز**)، فەرماننامەیەکی لە شێوەی سوپاسنامەیەکدا بۆ (فەیزوڵڵا بەگی موکری ناردووە.. تیایدا دەستخۆشانەی (ناسرەدین شای قاجار) دەردەبڕێ، بەرامبەر بەو سەرکەوتنەی لەو شەڕەدا کە لەگەڵ جافەکاندا کردوویانە، وەك خەڵاتێکیش بەو سەرکەوتنە، فەرمان دەدا، کە مانگانەی (١٠٠) تمەنی ئەو رۆژگارە، بە سەرانی هۆزی (فیزوڵڵا بەگی) بدرێ.. کە تا ئێستا (فەرمانەکە) هەر وەك خۆی لە شووشە گیراوە و لە بەگزادە ماڵێکی (فەیزوڵڵا بەگی)دا لەشاری (بۆکان) بە دیواری ژوورێکیانەوە هەڵواسراوە و ئەوەی لەگەڵ ئەم چەند دێڕەدا (فۆتۆ)م کردووە، وێنەی ئەو **فەرماننامە ـ** سوپاسنامەی (ناسرەدین شا)یە، کە ئەگەرچیش **فەرماننامەکە**، دوای فۆتۆکردنەکەی من، بەباشی ناخوێندرێتەوە، بەڵام مێژوویساڵی (**١٢٨٢ی** کۆچی، بەرامبەر **١٨٦٥ز**)ی پێوەیە. بەمەشدا دەردەکەوێ، کە شیعرە ئاماژە بۆ کراوەکەی (شێخ رەزای تاڵەبانی): **خزمینە مەدەن پەنجە**... لە ساڵی (**١٨٦٥**)ی زاینیدا و لە جەنگەی شەڕی ناوبراودا وتراوە و ئەمەش هەواڵێکی تازەیە، بۆ زانینی مێژووی شیعری ناوبراو[١٢]، کە بەداخەوە شیعری زۆربەی زۆری شاعیرانی پێشینەمان، بۆنە و مێژوویان نازانین و مەگەر لەمجۆرە بۆنە و بەڵگانەدا بتوانین رووناکی بخەینە سەر تەمەن و بۆنەی شیعری رابوردوومان. بەڵام دیارە شیعرەکەی (حاجی سەرتیپ)ی فەیزوڵڵا بەگی، درەنگتر و داوی شیعرەکەی (شێخ رەزا) وتراوە.

---

(١٢) هەروەها بۆ زانینی مێژووی تەمەنی شێخ رەزا (١٨٣٦ ـ ١٩١٠ز)ش، کە شێخ رەزا لەکاتی نووسینی ئەم شیعری بۆنەیەدا، هێشتا تەمەنی نەگەیوەتە (٢٠) بیست ساڵ! و شاعیرێتی گەیوەتە لووتکە.

## دەقی (فارسی) نامەکەی قازی (کەوپـەر)، بۆ شێخ رەزای تاڵەبانی

**سواد کاغذیست که جناب مستطاب آقای ملا محمد کریم قازی خدمت جناب مستطاب أفصح الشعراء آقای شیخ رضا سلمـه‌الله نوشته**

*فدای وجود مسعودت شوم. پس از عرض سلام واشتیاق بی اختتام در ضمیر منیر جناب مستطابعالی دام فضله مکشوف باشد و پوشیده نماند*

*از روزی که حقیر ارادت تخمیر لألی کلام آبدار ودرّ شاهوار اشعار ونتایج افکار أبکار جنابعالی را دام بقائه در گوش دل گوشوارو وبرصحیفه ضمیر اندوه‌بار جای تعظیم ونثار قصور ریاض طبع پر قصور را حورعین وغلمان شهریار ونفوس سلاطین تاج دار قرار داده در عموم سال وماه وساعات لیل ونهار، آرزوی این دیده اشکبار بمشاهده جمال آن وجود فرخنده‌تبار وتمنای قلبی این ستمدیده روزگار باستدامت مطالعه اشعار آن خجسته شعار زباناً وجاناً وپوشیده وآشکار از حضرت خالق پرودگار در لوح سینه پرشرار ومسکّن التهاب نایره فراق وندیم وغمکَسار خود ساخته‌است.*

*ودر اینمدت کسی را که شرح درد فراق وبار آرزوی حقیر راحمل توان کرد بغیر پهلوان زمان برادر مهربان ملاّ عبدالله کسی را نیافت، لهذا روی ارادت از عنیمت وقت نتافت و بابلاغ این مختصر آرزونامه شتافت و بمفتاح تصویر این شکایت وکلید تحریر این مختصر حکایت قفل حقه آرزوی بسته دیرینه را شکافت باسنان نساج طبیعت شایقه به نسبج تاروپود دو سه غزل از نتایج افکار خود پرداخت ودریافت.*

**سازم مگر سیاهی چشمان خود مداد**
**تا در لباس نامه بەبینم جمال دوست**

* * *

هرچند اهدای این قطعات غزل وارسال ارمغانی به نقاط ومراکز ُبلدان در نواحی دولت عثمانی صورت ریزه زیره وکرمانی شال وادعّای حظ خط هنرندان اصفهانی دارد (علی الخصوص در ناحیه کرکوك باوجود جنابعالی دام فضلــه چون زرّ غیر مسکوك کم عیار وبی رواج محکوك مینماید). لکن چون امکان آن دارد که گاه بحث از حقیر یادگاری وهنگام مطالعه موجب تذکاری شود بمنطوق: لایکلّف الله نفساً إلاّ وسعها، اهدای خدمت شدند. یقین است چنانکه گفته‌اند:

طاعت از هیچ نباشد، گنهی باید کرد،

دل دوست بهر حیله رهی باید کرد). حقیر که بارسال این اشعار بی هنجار در دل جنابعالی راه دوستی را اختیار کرده، جنابعالی نیز درکمال مرحمت وانصاف خداداده خودتان از پستی پایه ابیات ونقص ارکان آنها صرف نظر فرموده ومقبول طبع گهربار خواهید فرمود)

مستدعی وخواهشمندم چند صفحه از لألی منظومهً کلام خودتان از هر قبیل که حاضر ونُسخه‌اش موجوداست خواه توحید وخواه نعت وخواه قصیده وخواه سخریه وخواه قطعه وخواه غزل وخواه رباعی که دراین صفحات بسیار مرغوب ومطلوبند خاصه در نزد حقیر صورت گوگرد أحمر دارد در صحابت ملا عبدالله برسم هدیه وارمغانی که در نظر ارباب بصیرت تحفه بی بدلند باجواب حقیر ارسال فرمایند، تا به نشر و ترویج آنها اکثیریرا در اینصفحات بلفظ جنابعالی ممنون و بدیع صنایع آنها بیدار نمایم چنانکه خودتان در مدح ایل جاف فرموده‌اند:

حەیفە بڕزێ تیغی مجەوهەر لە غیلافا)

زیاده تطویل مهربان تحویل باد همه وقت منتظر مژده سلامتی وجودتان وارجاع خدماتم والسلام علیکم ورحمة الله.

بدون سابقه ابلاغ گفته‌اند خطااست ولی بسوی هنرمند و اهل فضل رواست سؤال کردم ازین نکته، از وزیرخرد جواب داد، که آری جناب شیخ رضااست

* * *

سواد کاغذیست که جناب مستطاب آقای حاج محمد کریم قاضی
خدمت جناب مستطاب افصح الشعراء آقای شیخ رضا سلمه الله
نوشته

فدای وجود مسعودت شوم پس از عرض سلام و اشتیاق بی اختتام بر ضمیر منیر
جناب مستطاب عالی دام فضله مکشوف باشد و پوشیده نماند (
از روزی که حقیر ارادت تخمیر لآلی کلام آبدار و درشاهوار اشعار و نتایج افکار ابکار جناب عالی
دام بقاءه در گوش دل گوشوار و بر صحیفه ضمیر آنده بارجای تعظیم و نثار قصور ریاض طبع
قصور احور عین و غلمان شهریار و نفوس سلاطین تاجدار قرار داده در عموم سال و ماه و
لیل و نهار آرزوی این دیده اشکبار مشاهده جمال آن وجود فرخنده تبار و تمنای
ستمدیده روزگار باشد است مطالعه اشعار آن خجسته شعار زبانا و جانا و پوشیده
از حضرت خالق پروردگار در لوح سینه پر شرار مسکن التهاب نار بیوفراق و ندیم و همگساز خود
ساخته است (
در این مدت کسی را که شرح درد فراق و بار آرزوی حقیر را حمل توان کرد بهم نرسید برادر مهربان

تا عجب الفتحه کسی را نیافت لهذا روی ارادت از غنیمت تافت و با بلاغ این مختصر آرزو نامه
نشتافت و بمفتاح تصویر این شکایت و کلید تحریر این مختصر حکایت قفل حقه آرزوی
بسته دیرینه را نگشاد و با بستان نتایج طبیعت شایقه به نسیج تار و پود دو سه غزل از نتایج
افکار خود پرداخت و در بافت )

سازم مگر سیاهی چشمان خود مداد    تا در لباس نامه به بینم جمال دوست

هر چند ابدای این قطعات غزل را رسال این معانی به نقاط و مراکز بلدان و نواحی
دولت عثمانی صورت ریزه زیره و کرمانی شال دعای حفظ خط هنرمندان اصفهانی دارد
علی الخصوص ناحیه کرکوک با وجود جناب عالی دام فضله چون زر غیر مسکوک کم عیار و بی رواج
و محکوک مینماید ) لکن چون مکان آن دارد که گاه گاهی بحث از حقیر یادکاری و بکام مطالعه
موجب یادکاری شود بمنطوق لا یکلف الله نفسا الا وسعها اهدای
خدمت شده   یقین است چنانکه گفته اند   طاعت از دست نیاید گنهی باید کرد
در دل دوست بهر حیله رهی باید کرد )   حقیر که با رسال این اشعار بی انجام در دل جناب عالی
راه دوستی را اختیار کرده جناب عالی نیز از کمال مرحمت و انصاف خلق داده خودتان از
ابیات و نقص ارکان آنها صرف نظر فرموده و مقبول طبع گهربار خواهید فرمود )
سندی و خواهشمندم چند صفحه از لآلی منظومه کلام خودتان از هر قبیل که حاضر و نسخه اش موجود است
خواه توحید و خواه نعت و خواه قصیده و خواه مخمس و خواه قطعه و خواه غزل و خواه رباعی

**کۆپی نامەکەی: قازی کەوسەر ـ ی شێخ الاسلامی سەقز**

**بۆ: شێخ رەزای تاڵەبانی**

صفحات بسیار مرغوب و مطلوبند خاصه در نزد حقیر صورت گوگرد احمر دارد در صحابت ملا عبدالله

برسم هدیه و ارمغانی که در نظر ارباب بصیرت تحفه‌ای بدل‌اند با جواب حقیر ارسال فرمایید

تا به نشر و ترویج آنها اکثر از این صفحات بلفظ جناب عالی مخزن و مرجع صنایع را نما

پیدا رنمایم چنانکه خودتان در مدح ابن حاف فرموده اند    حیف به برزگی تیغ جوهر غلاف ( )

زیاده تطویل هجران تحویل باد به همه وقت منتظر مژده سلامتی وجودتان و ارجاع خدمات و السلام علیکم و رحمة

بدون سابقه بلاغ گفته اند خطاست    ولی بسوی هنرمند و اهل فضل رواست

سوال کردم ازین نکته از وزیر خرد    جواب داد که آری جناب شیخ رضا سلکیست



**فەرمانننامەی ناسرەدین شا سەبارەت بە بڕینەوەی مووچە بۆ سەرانی فەیزوڵلابەگی و دەستخۆشانەکردنیان**



**مۆر و ئیمزای سەرانی ئیلی فەیزوڵلابەگی، بۆ سوپاسی ناسرەدین شا (رووبەری ئەم دوو بەڵگەنامەیە، زۆر لەم قەوارە فۆتۆکراوەی ئێستا گەورەترە)**

# چەپکێ نامەی شێخ مەحموودی حەفید

## (١)

**وتەیەکی پێویست:**

سەرەتای بەهاری ساڵی ١٩٨٨ز، لەبەر شاڵاوی ئیقلیمگیریی ئەو هێرش و کیمیاویی بارانەی لەلایەن هێزەکانی (سەدام حسین)ەوە بۆ سەر ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی عێراق کرا، ناچاربووین بە هەر دەردەسەریی و دژواریی و لێبڕانێك بوو، لە بناری چیای (ئاسۆس)ەوە دەربازبووین و چووینە کوردستانی ئێران و لەوێش لە شاری (سەقز)ی شیرین و جوانکیلەدا گیرسامەوەو لەسەرەتادا هەر زوو بەهۆی هەندێ دۆستی دێرینەمەوە، لەگەڵ بنەماڵەی شێخەکانی گوندی (دۆزەخدەرە) ناسیاوییم پەیداکردو ئەوانیش لوتفیان نواند، نەوازشێکی زۆر کوردانەو جگەرسۆزانەیان کردین و لە سنووری توانای خۆیان بەدەر، یارمەتییان داین.

(دۆزەخدەرە)، گوندێکی زۆر بچکۆلەی سەر بە شاری سەقزەو نزیکەی (٥) کیلۆمەترێك لە خۆرهەڵاتی باکووری سەقزەوە دوور دەبێ. گوندەکە لە دەمێکەوە بەهۆی ماڵەباوانی بنەماڵەی سەیید عەبدولقادرەوە (١٨٧٣-١٩٥٧ز)، لەگەڵ بنەماڵەی کاك ئەحمەدی شێخ (١٧٩٢-١٨٨٧ز)ی

سـلێمانییەوە، دۆسـتایەتی دێـرین و ڕاسـتەقینەو پتـەویان پەیـدا کـردووە، ئـیتر نـەوە دوای نەوەو تائێستاش ئەم دۆستایەتییە هەر بەردەوامە.

ئـەم دۆسـتایەتییە لـە سـەردەمی شـێخ مـەحموودی حەفیـد (١٨٨١-١٩٥٦/١٠/٩)دا، زیـاتر گەشـەی کـردووە، کـە هاوتەمـەنی (سـەیید عەبـدولقادر) بووە. دۆستایەتییەکەیان ئەوەنـدە تونـدو پتـەو بـووە، زۆر جـار لـە سـنووری پێوەنـدی نێـوان شـێخ و خەلیفـەی تێپەرانـدووەو وەك نـەوەکانیان دەیگێڕنـەوە، لـە هـەموو کـات و سـەردەمێکی خۆشـی و ناخۆشـیدا، لـە سـەردەمی ئەوپـەڕی دەسـەڵاتی شـێخ مـەحموودا، کـە حوکمـداری کوردسـتان بـووە، تـا ئەوپـەڕی بێدەسـەڵاتیی شـێخی نـەمر، کـە لـەدوای ژیـانی ئـاوارەیی و دەسـت بەسـەرییەکەی، لـە بەغـداد هـەڵاتووەو بـۆ نیشـتمان گەڕاوەتـەوەو لـە گونـدی (داریکـەلی) گۆشـەگیر بـووە، هەمیشـە بەسـەر سـنووری تونـد داخـراوو قـایمکراوی هـەردوو دەوڵـەتی عێـراق و ئێرانـدا، نامـەی بـەردەوام و هاتووچـۆ لەنێوانیانـدا بـەردەوام بـووە، هـەر نـەوەکانی سەیید عەبدولقادر دەیگێڕنەوە، کـاتێ کـە هـەواڵی کۆچـی دوایـی شـێخی نـەمر، بـە شـێخ عەبـدولقادر گەیشـتووە، ئـیتر لـە سـوێی شـێخ مـەحموود، زۆر نـەژیاوەو نـەخۆش کـەوتووەو دوو مـانگ دوای کۆچـی شـێخ مـەحموود لـە (١٩٥٧/١٢/٢٣ز=١٣٤٩/١٠/٢هـەتاوی) کۆچـی دوایـی کـردووە، هـەر لەبـەر ئەمـە، ئەوانـەی لـە نزیکـی (شـێخ)ەوە ئاگـاداری دۆسـتایەتیی هەمەلایەنـەی شـێخ مـەحموود بـوون، چـاکتر شـارەزای ئـەم پێوەنـدیو دۆسـتایەتییە قووڵـە بـوون، بۆیـە شـاعیرێکی میللـی وەك: بەنگینـە- حـاجی بـاقی (١٩٠٨-١٩٧٢ز)، کـە شـێخیی نەمری خۆشدەویست، لـەو شـیعرە بڵاوەیـدا، کـە بـۆ کۆچـی دوایـی شـێخ مـەحمودی نووسیوەو سەرەتاکەی بەجۆرە دەست پێدەکات:

**ئەی دڵ ! کۆستی وا، هەر نەبینراوە**
**بۆ هەڵناقرچێی بەدەم جەفـاوە!**
**هاوار ! بەندی دڵ، بڕا بە جـارێ**
**قەڵای قەومی کورد، ڕووخایە خوارێ**

لــە بەیتێکیــدا ئامــاژەی بــۆ ئــەو دۆســتایەتییە تونــدەی نێــوان شــێخ مەحموودو ماڵباتی شێخانی (دۆزەخدەرە)ی کردووەو دەڵێت:

**ڕادیۆ بانگی دا، لە دۆزەخـــدەرە**
**(شێخ) وەفاتی کرد، بۆ کورد خەتەرە**[1]

* * *

لــەماوەی تەمــەنی دۆســتایەتیی (شــێخ مــەحموود) و (ســەیید عەبــدولقادر)دا، گــەلێ نامــەی شــێخی نــەمر، لای نــەوەکانی ســەیید عەبــدولقادر پــارێزراون، کــە شــێوەی پارێزگــاریی ئــەم نامانــە، ئەوەنــدە بــە پیرۆزیــی و ڕێــزەوە هــەڵگیراون، تەنانــەت زەرف (پاکــەت)ی نامــەکان وەك خۆیــان مــاون، بــەجۆرێکیش هــەڵگیراون، کە ئەگەر هــەر ســەیری پشــتی زەرفــەکان بکــرێ و ســەیری مێــژووی ســەر نامــەکانی ناویــان نــەکرێ، وا دەزانــرێ هــەر چــەند مانگێکــە نێــردراون، لەکاتێکــدا دوو نامــەیان، کــە هــی ســەردەمی حوکمــداریی کوردســتانە، مێــژوویان نزیکــەی (٨٠-٩٠) ساڵێك لەمەوبەرە.

ســەیر لەوەدایــە، شــێخی نــەمر ئەوەنــدە گونــدی (دۆزەخــدەرە)ی لا شــیرین بــووە، دڵــی نــەهاتووە لەســەر پشــتی زەرفــەکان و ســەردێڕی ســەرەتای نامــەکان بنووســێ: (دۆزەخــدەرە)، بــەڵکوو لای خۆیــەوە بــە (جەننــەت دەرە)ی ناونــاوەو تکای لە نزیکانی خۆیشی کردووە، تا هەر وای ناوبەرن[2].

شــایانی باســە، پێوەنــدیی شــێخی نــەمرو ماڵبــاتی شــێخانی (دۆزەخــدەرە)، لــە ســنووری ئــەم نامانــە بــەربلاوترو چــڕترە و (وەك پێشــتر وتمــان) دەگەڕێتــەوە بــۆ سەردەمی (کــاك ئەحمــەدی شــێخ)ی بــاپیری شــیخ مــەحموود و دواتــریش، کــە وەك

---

(١) دیوانی حاجی باقی (بەنگینە)، کۆکردنەوەو ئامادەکردنی عوسمان محەمەد هەورامی، سلێمانی، چاپەمەنی دیلان، چاپی یەکەم، ل٦٧.

(٢) بۆ دلنیایی زیاتر، بنوارە نامەی مێژووی (١٣/٦/١٩٢٢ز)

نــەوەکانی بنەماڵــەی (ســەیید عەبــدولقادر) دەیگێڕنــەوە، لــەکاتی جــەنگی یەکــەمی جیهانیــدا، کــاتێ لەشــکری ڕووســی لــە خۆرئــاوای ئێرانــەوە، ڕووەو (مــەریوان)و (پێنجــوین) بــەرەو کوردســتانی باشــوور هــاتوون، شــێخی نــەمر بــۆ بــەرپێگرتنیان بــە لەشــکری کــوردەوە هاتۆتــە نزیــك پێنجــوین و ژمارەیــەکی زۆر لــە جــەماوەری کوردســتانی ئێــران، لــە لەشــکری (شــێخ)دا پێشــمەرگە بــوون، کــە ئەنــدامان و خزمــانی ماڵبــاتی شــێخانی (دۆزەخــدەرە)ش لــەم هەڵوێســتەدا بــە دڵ و بــە گیــان لەگــەڵی بــوون... دوای ئەمــەش وەك بیرەوەرییــەکانی **زێــوەر** (١٨٧٥-١٩٤٦ز)[٢] ی شــاعیر لــە (گەنجینــەی مــەردان) و شــێخ لــەتیف حەفیــد (١٩١٧-١٩٧٢)[٣] دەیگێڕنــەوە، لــە تێشــکانەکەی شــەڕی (دەربەنــدی بازیــان)دا، کــە ژمارەیــەکی زۆری لەشــکرەکەو بنەماڵــەی شــێخی نــەمر، ئاوارەبوون و ڕوویــان لــە کوردســتانی ئێــران کــردووەو لــە مــەریوان و بانــەو ســەقزدا گیرســاونەتەوە، لەلایــەن بنەماڵــەی دۆزەخــدەرەوە پێشــوازیی شــایان کــراون و داڵــدە دراون و حەســێنراونەتەوەو ســەرلەنوێ بــۆ مەیــدانی خــەبات ئامادەکراونەتــەوە.. دواتــریش لــەکاتی حوکمدارییەکەیــدا، ڕوونــاکبیری ناســراوی وەك (ســەیید ڕەئــووفی ضــیائی)، کە ئــەویش هــەر (ســەقز)ییەو لەگــەڵ شــێخانی دۆزەخــدەرەدا خزمــە، لــە سلێمانی لای شێخ هەمەکارە بووە.

نــاوەڕۆکی ئــەم چــەپکە نامەیــەی شــێخ مــەحموود بــۆ ســەیید عەبــدولقادری دۆزەخــدەرە، کــە (١٧) نامــەن، هــەموویان بــاس و بابــەتی دۆســتایەتی ئــامێزن و

---

(٢) مەلا عەبدوڵڵای زێوەر، گەنجینەی مەردان و یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری، محەمەدی مەلا کەریم پێشەکی پەراوێزی بۆ نووسیوە، ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان، چاپخانەی (شرکة مطبعة الادیب البغدادیة)، بەغدا، ١٩٨٥، ل١٧٤، ١٨١، ١٨٩.

(٣) یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێح مەحموودی حەفید، شێخ مەحموودی کاوەی حەفید پێشەکی بۆ نووسیوە. ساغکردنەوەی کەمال نوری مەعروف، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان، چاپی یەکەم، سلێمانی ١٩٩٥، ل ٦٨

بـریتین لـە کاروبـاری تایبـەتی هـەردوو دۆسـت. بـەڵام ئـەوەی جێـی سـەرنج و دڵخۆشـییە، (٦) شـەش لـەم نامانـەی (شـێخ) بـە کـوردی، بـۆ دۆسـتێکی وەك عەبـدولقادر، لـە پارچـەیەکی تـری کوردسـتاندا نووسـراون، کـە لـەو سـەردەمەدا زمانی کوردی تێدا قـات و قـڕ کـراوەو نیشـانەی ئەوەشـە، کـە سـەیید عەبـدولقادر زانیۆیتی کوردی بخوێنێتەوە.

هاوکـات (٤) نامەشـیان لـەکاتی حوکمدارییەکـەی شـێخ مـەحموددا نووسراون، کە لـە دامێنـی هـەر نامەیەکیانـدا، لەسـەروو نـاوی خۆیـەوە دەنووسـێ: **مـەلیکی کوردسـتان**. ئـەم چـەپکە نامەیـەی بـۆ سـەیید عەبـدلقادری دۆزەخـدەرە نووسـراون، مێـژوویان لـە (١٩٢٠-١٩٥٦ز) دەخایـەنێ. هەرچـەندە لێـرەدا دەبـێ ئـەوەش بڵـێم، کـە چ ئـەو نامانـەی بـە فارسـی و چ ئەوانـەش بـە کـوردی بـۆ بنەماڵـەی دۆزەخـدەرە نووسـراون، (جگـە لەنامـەی ١٩٤٣/٣/١١، کـە بەدڵنیاییـەوە شـێخ مـەحموود خـۆی نووسـویەتی)، نووسـیارەکانیان کـوردی و فارسی زان نەبوون و ئاستی خوێندەواریشیان زۆر باڵا نەبووە.

وەك لەسـەرووتریش ئامـاژەم پێـدا، لەبەرئـەوەی نـاوەڕۆکی زۆربـەی ئـەم نامانـە، تایبـەتن بـە کاروبـاری دۆسـتایەتی هـەردوولاوە بـە پێویسـتم نـەزانی سەرنج و لەنگەری زۆریـان لەسـەر ڕابگـرم، بـەڵام دواتـر سـەرنجێکی گشـتی لەسـەر پوختەی ناوەڕۆکیان دەردەبڕم.

## (٢)

هەر لەو ماوەیەدا کە لە سەقز بووم، زۆر زوو لەگەڵ بنەماڵەی بەڕێزان کاکە سەیید عەبدولقادری (سیادەت)ی شاعیر و کاکە سەیید مستەفای تورجانی، کوڕانی خوالیێخۆشبوو: حاجی بابەشێخ (١٨٧٦-١٩٥٩ز)ی سەرۆك وەزیرانی کۆماری کوردستاندا، ناسیاویی و دۆستایەتی بەتین و بەتایبەتیش لەگەڵ کاك سەیید مستەفادا پەیدا کرد، کە بەهۆی پلەوپایەی دێرینەو ناوبانگ و پێوەندی کۆمەڵایەتی بەربڵاوی جەنابی باوکیانەوە، بەڵگەنامەیەکی هەمەجۆرەی زۆریان لەلا کۆبۆتەوە، لەناو ئەو بەڵگەنامانەشدا، وەڵامنامەیەکی شێخ مەحموود بوو بۆ "حاجی بابەشێخ" کە بە مێژووی (١٣/٩/١٩٣٠ز) نووسرابوو. نامەکە بە زمانی فارسی و خەتێکی خۆش و پەخشانێکی بەتین و چڕ داڕێژراوە.

لەم وەڵامنامەیدا دەردەکەوێ، کە پێشتر لەلایەن دەوڵەتی شاهەنشایی ئێرانەوە، تکا لە جەنابی حاجی بابەشێخ کرابێ، تا بەهۆی دۆستایەتییانەوە لەگەڵ شێخ مەحمووددا، داوای گرتن، یان بەدەستەوەدانی (حەمە ڕەشیدخانی بانە: ١٨٩٧- ٤/٢/١٩٧٨)[٤]، لە شێخ مەحموود بکات، کە لەو کاتەدا (١٩٣٠) لە دەست ئێران هەڵاتووە. لەم کاتەش دا ئەم هەردوو کەسایەتییە کوردە، پلەو پایەیەکی دەوڵەت و ڕێکخراوو حیزبێکیان نییە، چونکە وەك دەزانین لەو ساڵانەدا (شێخ) دەسەڵاتی حوکمداریی کوردستانی نەماوەو بە تایبەتیش لەکاتی نووسینی ئەم نامەیەدا، سلێمانی جێهێشتووەو لە ناوچەکانی شارباژێڕو پێنجویندا دەژی

(٤) بۆ زانیاریی لەبارەی حەمە ڕەشید خانی بانە — وە، بنواڕە: کەیوان ئازاد ئەنوەر، حەمە ڕەشید خانی بانە، چاپ و بڵاوکردنەوەی بەڕێوەبەراتی ڕۆشنبیری ـ سلێمانی، چاپی یەکەم ٢٠٠١، ل ٣٩، ٢٥٢

و ئـەم نامەیـەش ڕێکەوتـە لەگـەڵ هەڵچـوون و وڕژانـی جـەماوەری دەڤـەری سـلێمانی و دەوروبـەری بـە تایبـەتی و زۆربـەی ناوچـە کوردنیشـینەکانی کوردسـتانی عێـراق، چـونکە ئـەم نامەیـە هەفتەیـەك دوای خۆپیشـاندان و **ڕاپـەڕینی بـەردەرکی سـەرای سـلێمانی** (١٩٣٠/٩/٦ز) نووسـراوە، بەڵگـەی ئەوەیە، کە شـێخ مـەحموود لـەم کاتـەدا دەسـەڵاتی ئیـداریی و یاسـایی بەسـەر دەوڵەتی عیراقـدا نـاڕوات تـا داوا لـە هێـزو بەرپرسـانی عێـراق بکـات (حەمـە ڕەشـیدخانی بانـە) یـان بـۆ رادەسـت بکـات و بـە دەسـەڵاتدارانی ئێرانیـان بداتـەوە. هاوکـات (حـاجی بابەشـێخ)یش هێشـتا نەبۆتـە سـەرۆك وەزیرانـی کۆماری کوردسـتان. لەبـەر ئـەوە بەرپرسـانی دەوڵـەتی شاهەنشـایی ئێـران ئـەم هەلومەرجـەیان هەڵسـەنگاندووەو زانیویانـە لـەم سـەروبەندەدا شـێخ مـەحموود لـە دەوڵـەتی عێـراق تـووڕەو داخ لەدڵـەو خۆسازدانیشـە بـۆ تۆڵەکردنـەوەی قوربانیـانی ڕاپـەڕینی بـەردەرکی **سـەرای سـلێمانی** و ئەگـەر لـەم کاتـەدا سەرۆك خێڵێکی کـوردی وەك (حەمـە ڕەشـید خـانی بانـە)یش بـە نـاوی ئـەوەی لـە دەوڵـەتی ئێـران یـاخی ببـێ و بچـێتە پـاڵ دەوڵـەتی عـیراق، ئـەوا شـێخ مـەحموود بـە چـاوی ناحـەزو دوژمـنی کـورد سـەیری ئـەو سـەرخێڵە دەکـات و تۆڵـەی ئـەم هاوکاریکردنـەی دەوڵـەتی عێراقـی لێدەکاتـەوە. بۆیـە دەوڵـەتی ئێران بەزیرەکییـەوە ئـەم هەلـە دەقۆزنـەوەو لـەم دەرفەتـەدا داوایـان لـە حـاجی بابەشێخ کردووە، تـا تکـای دەسـتگیرکردنی (حەمـە ڕەشـیدخانی بانـە) یـان لـە شێخ مەحموود بـۆ بکـات، کـە لـەم سـەروو بەنـدەدا بـە خـۆی و لەشـکرەکەیەوە لە ناوچـەکانی شـارباژێڕو پێنجـوین دایـەو ئـەو هـەردوو ناوچـەیەیش سـەرەڕێی هاتوچـۆی دەربـازبوونی (حەمـە ڕەشـید خـانی بانە)یـە، لـە سـنوورەکانی هەردوو دەوڵەتی عێراق و ئێرانەوە.

نامەکـە جگـە لـەوەی بەڵگەیـە بـۆ پلەوپایـەو دەسـەڵات و ناوبـانگی ئـەم دوو کەسـایەتییە گەورەیـەی هـەردوو کوردسـتانی عـیراق و ئێـران، لای گـەورە بەرپرسـانی دەوڵـەتی ئێـران، هاوکـات بـە ناوەڕۆکەکەیـدا دەردەکـەوێ، کـە شـێخ مـەحموود هـەر لەبنەڕەتـەوە دەزانـێ کـە ئـەم داوایـە لەلایـەن دەوڵـەتی ئێرانەوە بـەرەو ڕووی (حـاجی بابەشـێخ) کراوەتـەوە، هـەر لەبـەر ئەمـە دەزانـێ

کـــە وەڵامەکەیشـــی بەرچـــاوی کاربەدەســـتانی ئێـــران دەگاتـــەوە، بۆیـــە بـــە گیـــانێکی دیپلۆماســـیانە، ســـەرەڕای ئـــەوەی گلـــەیی زۆر لـــە دەوڵـــەتی ئێـــران دەکات، لـە هـەمان کاتـدا خـۆی و (حـاجی بابەشێخ)یشـی لـەو داوایـە دەربـاز کردووە:

**"ســـەبارەت بـــە بابـــەتی نامەکـــەو محەممـــەد ڕەشـــیدخانی وێنـــەیی و ســـەرلەبەری بـــەگزادەی (بانـــە)یش، وردەکارییـــەکی واتـــان فـــەرمووە، کـــە بـــەگوێرەی بۆچـــوونی هێـــژاتان بـــێ، دەبـــێ نـــاوبراو لـــە عـــەمرو نـــۆی مـــنی خزمەتگوزارتاندا هەڵسوکەوت بکـات! هـەر لەبـەر ئەمەشـە هـۆی نەوازشـی ئەوتان، لە من داوا فەرمووە! پەنا بەخوا لـەم بوختانـە گەورەیـە، کـە دەبـێ لای ئـەم دڵسـۆزەی خۆتانـەوە ڕاسـتیی ببیسـتن و بـە دڵسـۆزییەوە عـەرزتان دەکەم، کە بەو هۆیەوە لە جەنابی هێـژاتان دۆسـتتر، کـەمتر گومـان دەکـەم، بۆیە دەبێ باوەڕ بفـەرموون، کـە هەرچـییان عـەرزکردوون، هـەمووی دەست هەڵبەستی ناحەزان و ناپاکان بـووەو هـەرگیزو بـۆ هـیچ کـارێکیش ڕووی لـە ئێمە نەناوە، تا ببمـە ڕاوێـژکاری، یـان بەرپرسـیان، ئـەگینا گومـان دەبـرێ، کـە پێشـتریش و دواتـریش خزمـەتی هەمـەجۆرەم بـە حکوومـەتی مـەزنی ئێران کردبێ و بە (با)ی بدەم! خۆشـتان دەزانـن کـە هـیچ پاداشـتێکی کـاری چـاکەم لـە حکوومـەتی مـەزن وەرنەگرتۆتـەوە، لەکاتێکـدا هەمیشـەیش تەقەللای ئەوە دەدەم تـا سـەرەڕای ئـەوەی ڕەزامەنـدیی دەوڵـەتی مـەزن بـە دەەست بهێنم، کەچی پاداشتەکەی هـەر بـە گـەوەرترکردنی ناحـەزانی مـن و نزمترکردنـەوەی دۆسـتانی مـن شـکاوەتەوە. لـەپاڵ ئەمانەشـدا هێشـتا تـا گیان لـە جەسـتەمدا بـێ، لـە چـاکەی دەوڵـەتی مـەزن .......... سـەرەڕای ئەوەی ئەو ئـامۆزا بـەڕێزەم دەیڵێـت، کـە هەرچـی لـەو بارەیـەوە بفـەرموێ، دەبێ بە گیان ئەنجامی بـدەم و بـە شـانازییەوە جێبـەجێی بکـەم. بـەڵام لـەم بابەتەوە ئەم دۆستەتان پۆزش دەخـوازێ، کـە ئەگـەر هاتوچـۆی خـەڵکی، بـە هۆیەك بـزانن، ئـەوا نـەخێرو خانـەدانی کـاك ئەحمـەد (خـوا ڕووی موبـارەك بکـات)، لـە هـەموو جیهـانی ئیسـلامییەوە زیـارەتی دەکـرێ و ئـەوەش پێچـەوانەی ڕەوشـت و ئایینـە، ئەگـەر ڕێگـە لـە خـەڵکی بگـرین، جگـە**

**لەوەی کە ناوبراو، ناوبەناوێك هەر بە مەبەستی زیارەت هاتووەو ئەمەش نەبۆتە مایەی پێوەندیی ئێمەو ئەوان و لە عەقلیشەوە دوورە، کە بەبێ سەردانی ڕاستەوخۆی ئەوان، خۆمان بە ئامۆژگاریکارو بەرپرسی ئەوان دابنێین. هیوادارم لەم ڕووەوە گلەیی نەفەرموون و بەندەی موخلیسیشتان بۆ هەمیشەو بۆ بەسەرکردنەوەی کاروباری هێژاتان ئامادەم. تکاو خۆزگەشم ئەوەیە، بەڵکو بە سۆزەوە عەرزتان دەکەم، کە ئەو پلەو پایەو ڕێزەی لە سایەی خواوە ئێستا هەتانە، بیقۆزنەوەو کاروباری موسڵمانانی پێ ڕاپەرێنن و نەبنە سۆنگەی تەنگ پێهەڵچنینتان، کە من پێم وایە ڕەزامەندیی خوای مەزن، دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەو مانەوەی هەمیشە. ئیتر (لوقمان)یش پێویستی بە فێرکردن نییە".**

## (٣)

لــە ســەرنجێکی گشــتیی نــاوەرۆکی ئــەم چــەپکە نامەیــەدا، دەگەینــە ئــەو ئەنجامــەی، لــە ســەرومڕی ڕســتەو کۆپلــەو پــەرەگرافی ئــەم نامانــەدا، گیــان و بــاوەڕی شــێخ مــەحموودی حەفیــد، بــە ئــایینی ئیســلامگەرایی، ڕەنــگ دەداتــەوە، کــە ئــەم بــاوەڕە لــە تەمــەنی چــارەکە ســەدەی ئــەم نامانــەو لــە قۆناغــەکانی ئەوپــەڕی دەســەڵاتی شــێخ مــەحموودا، لــە حوکمــداری کوردســتانەوە، بــۆ ژیــانی گۆشــەگیریی، لــە گونــدێکی وەك (داریکــەلی)دا، هــەمان هەســت لــە یەکــەمین ئــەم چــەپکە نامەیــەدا، تــا دوایــەمین نامــە، بــە هــەمان جریــوە دەدرەوشــێتەوە، کــە ئــەم بــاوەڕە چەســپیوە، دەشــێ بکرێتــە دەلاقەیــەك بــۆ ئەوانــەی فیکــری ئــەم ســەرکردە کــوردە بخوێننــەوەو بــزانن ئــەم فاکتــەرەی ئایینــە، زەبــرو کاردانــەوەی چــەند لەســەر چارەنووســی کــوردو ناســنامەی بزووتنەوەکــەی بــووەو لــەم بوارەشــدا ئــەم ڕســتانە، لــە دەقــی چــەند نامەیەکی شێخدا، وەك نموونە دەهێنینەوە:

"هــەموو ئــاوات و کۆششــێکی مــن، لــەپێناوی پاراســتنی ئــایین و ئــەم کۆمەڵــە کــوردە ئیســلامەدایە، بــە هیمــەتی پێشــینانی خۆمــان، کــە هــەر بــەمجۆرەیان کــردووە، تەقــەللای پارێزگــاریکردنی موســڵمان لــەژێر پەنجــەی کافراندا دەدەیــن. خــوای مــەزن ســەرتان بخــات و بــە پیشــتیوانی خــوا نائومێــد نــەبین. ئەوانــەش کــەوا ڕێبــازی تەریقــەت دەشــێوێنن و لەگــەڵ ئــەم زنجــیرەی بنەچــە پاکــەدا، دوژمنایــەتی دروســت دەکــەن، پیرانــی تەریقــەت، بــەگوێرەی حــەق، حــەقیان لێ دەســێنێ و بەســزای خۆیانیــان دەگەیــەنن و لــە بــاوك و باپیریانەوە لە دین بێبەشیان دەکەن"[٣]

---

(٣)- نامەی ٧ی مارتی ١٣٤٠.

یان:

"هەروەك چۆن ئێمە بۆ بووژاندنەوەی ئایین تێدەكۆشین، یان چۆن جەنابی هێژاتان لەم دنیا، كەوتوونەتە ناو دۆزەخەوە، بە پشتیوانی خوا لە دنیای دواییدا لە بەهەشتدا دەبێ، لە دوعای خێریش نابێ لە یادم بفەرموون".

بە پشتیوانی خوا هیواخوازم بە دوو ركاعەتی نوێژی سوننەت، لەسەر بەرماڵە موبارەكەكەتان، بە پلەی دەروێشی بگەم". [٤]

یان:

"قوربان، بەهۆی ئەو خەونەوە، كە پێشتر دیبووم، كاتێ خۆی بە خزمەت حەزرەتی سەروەریی جیهان گەیشتم، ئیتر لای خۆمەوە هیچ گومانێكم لە سەییدایەتی و نەجابەتی هێژاتانەوە نەماوە" [٥]

* * *

## (١)

## خالوی مدام مهربان شیخ عبدالقادر دام فضله

بعداز سلام و تحیات وافره محبتنامه اتان رسید از مژده سلامتی ان خالوی مسرور و متشكر شدم حمداً له نعمت صحت موجوداست أرجو جناب دارم دائماً از ادعیەی خیریه غافلمان نفرمایند و همه وقت به مژده سلامتی خودتان تسرمان سازند. وضعیت اینجا دائماً كمری مجاهده با اعد درمیدان كارزاری دیانت استادەایم خداوند عظیم عالم اسلامتیرا موفق ساز دیگر بەخداوند عالمت می سپارم

م

محمود

١٧/شوال/ ١٣٤٠

١٩٢٢/٦/١٣

---

(٤)- نامەی ٣ی نیسانی ١٩٤٧.

(٥) نامەی ١٣ی ئەیلولی ١٩٣٠.

## پەراوێزی نامەی سەربە مێژووی (١٧ی شەوالی ١٣٤٠ك)

**بە قوربانت بم.**

درین شبها از بارگاه کاکه احمد (دیدم) خیلی ان بارگاه علی (عالی) وشخصی معتدیل (معتدل) القامه ایستاده سراپاش سبز مرا خواست چنان معلومم گردید حضرت خضرالیاس است فرمود خبر چنان می باشد که (؟) سی کنم اشاره فرمود (؟) گل (؟) جمع فهموده درین مرقد و بسیار خلق (؟) جمع شره بودند و دران حالت دیدم تجدیدی شجره می فرمود عدد شجری تجدید نمود شجری حضرت علی بود خیلی اسمی بزرگ یعنی (؟) احسان فرمود اما افسوس درخاطرم نمانده (؟) شجره به پنجه مبارکش می نوشت. اما اینقدر درخاطرم مانده شیخ قادر جنت دره هم فرموند پس قبول ندرام کسی بگوید دوزخ دره إلا بجنت دره نباشد

م
محمود

**خاڵۆی هەمیشە میهرەبان شێخ عەبدولقادر**

**سێبەری هەمیشەی بێت**

دوای سەلام و سڵاوی زۆر. نامە خۆشەویستەکەتان گەیشت و مزگێنی سەلامەتیی ئەو خاڵۆیەمان بووە مایەی دڵخۆشیی و سوپاستان دەکەم. سوپاسیش بۆ خودا تەندروستیم باشە (؟) داواخوازم هەمیشە لە دوعای خێر، لەیادمان نەفەرموون (؟) لەم کاتەدا بە مژدەی سەلامەتیتان (؟) ساز. دەنگوباسی ئێرە هەمیشە پشتێنی جیهادمان لەبەرامبەر دوژمندا بەستووەو لەمەیدانی جەنگی ئاینیدا راوەستاوین. خوای مەزن و ئاگادار، ئیسلام سەر بخات و بیپارێزی (؟) بەخوای ئاگادارت دەسپێرم.

**خۆشەویستتان**

**مەحموود**

**١٧ی شەوالی ١٣٤٠ك**

**١٩٢٢/٦/١٣**

## (٢)

**بخدمت جناب شیخ عبدالقادر دام مجده**

**قوربان دەستت ماچ ئەکەم**

کاغـذت رسـید از مــژده سـلامتی آن محـب خیلـی مسـرور شـدم از خصـوص رفـع حـرج هـرچــندی ممکـن باشـد سـعی خـواهم کـرد ایـن کاغـذرا بـرای معتمـد خـودم جنـاب یوزباشـی ماجـد افنـدی نویشــته کـه در حکومـت سـقز سـعی و تسـهیلاتی بکند پاکترا بـلا تأجیـل روانـه فرمائیـد. حـال پـاره بـرای خریـدن امـلاك نـدارم آن پـاره کـه (؟) امـلاك صـرف مــیکـنم در راه جهـاد اکـبر و بـرای مجاهـدین صـرف میکـنم. زیاده درحفظ خدا باشید محبم.

**ملك كردستان**
**٢٥ تشرين اول ٣٩**

**بۆ خزمەتی جەنابی شێخ عەبدولقادر[٦]، خوا هەر سەروەریی بەردەوام بکات**

نامەکەتان گەیشت لە مژدەی سەلامەتیی ئەو خۆشەویستە، زۆر دڵشاد بووم. سەبارەت بە لابردنی خەرجییەکەش ئەوەندەی لەتوانامدابێ، دریغیم نەکردووە. ئەم نامەیەشم بۆ جێمتمانەی خۆم، جەنابی یووزباشی ماجد ئەفەندی[٧] نووسیوە، کە لە فەرمانڕەوایەتیی (سەقز)دایە، تا تەقەللا بداتو ئاسانکاری لەو ڕووەوە بکات. نامەکە بەبێ ڕاگیرکردن ڕەوانە بفەرموون. ئێستا بۆ کڕینی زەوی وزار، پارەم نییەو ئەو پارەیەی کە بۆ کڕینی زەوی وزاری سەرف دەکەم، لەپێناوی جیهادی گەورەو بۆ موجاهیدینی سەرف دەکەم. لەوە زیاتر، لە پەنای خوادا بن. خۆشەویستم.

**٢٥ی تشرینی یەکەمی ٣٩[٨]**
**مەلیکی کوردستان**

---

(٦) سەیید عەبدولقادری دۆزەخ دەرە کوڕی سەیید محەمەد کوڕی سەیید ئیسماعیلی دووەمە. پیوەندیی دۆستایەتیی لەگەڵ شێخدا هی ڕۆژانی شەڕی ڕووسە لە یەکەم جەنگی جیهانیدا. دوای بەدیل گیرانی شێخیش، کە بنەماڵەو کەس‌وکارو لایەنگرانی ئاوارەی ئەو دیو بوون، سەیید عەبدولقادر بەدەنگیانەوە هاتو هاوکاریو کۆمەکی کردن. دۆزەخدەرەیش، دێیەکی سەر بە شاری سەقزەو نزیك بە باکووری ڕۆژهەڵاتیەتی. شێخ لەبەر خۆشەویستیی سەیید عەبدولقادرو بۆ وەفاداری نواندن ناوەکەیی گۆڕیوە بە جەننەتدەرە.

(٧) مەبەست ماجد مستەفا (١٨٩٦ – ١٩٧٤/٨/٢)ی ئەفسەرێکی لەشکری شێخ مەحموودە.

(٨) ساڵەکە ڕۆمییەو دەکاتە ٢٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣

ئەدەب)ی باوکی نووسیبووی‌و ئەم بەڵگەنامەیەش وەك دەیان‌و سەدان بەڵگەنامەی تری بەجێماوی (ئەدەب)، کە (میرزا ساڵح)ی باوکی مەلا قادر و میرزای بەردەستی (ئەدەب)، بەدڵسۆزییەکی زۆرەوە پاراستبوونی‌و دواتر کەوتبوونە لای (مەلا قادر). پاراستنیشی تا ئەوکاتە (لە چاو ئەو هەموو سامانە کلتوورییەی **ئەدەب ـ میسباح دیوان** دا، کە زۆریان بەهەدەر لە ناوبردبوون) جێی سەرسوڕمان‌و لەهەمان کاتیشدا جێی بەختەوەریی مێژووی ئەدەبی کوردی بوو.

ئەگەرچی ئەم بەڵگەنامە گرنگە، زۆریش باش هەڵگیرابوو، بەڵام بەو هۆیەوە کە تەمەنی نزیك (٩٠)نەوەد ساڵ دەبوو، بۆیە کاغەزەکەی زۆر ناسك‌و تەنك‌و خەریکیش بوو دەپواو هەڵدەوەری.. لەبەرئەوە هەر لەگەڵ چنگخستنیدا، بەپەلە لەگەڵ دوو هاوڕێی ناوبراودا، گەڕاینەوە بۆکان‌و خۆمان گەیاندە ماڵی هاوڕێی نووسەر: کاکە ئیبراهیمی حەسەنی‌و بەئامێری (سکێن)ەکەی ئەوان، بەهەمان ڕەنگی خۆی (زەردێکی مەیلەو قاوەیی)، کۆپییەکی ڕەنگییمان لێگرت‌و ئەسڵەکەیمان بۆ **مەلا قادری کیانی** گەڕاندەوە.

لەم بەڵگەنامەیەدا (کە ڕووبەرەکەی ٢٧سم×١٩سم-ە)، شیعرەکەی (ئەحمەد)ی کوڕی عەبدوڵلا بەگ ـ میسباح دیوان، کە بۆ مێژووی مەرگی باوکی نووسیوێتی، بەزمانی فارسییەو بریتییە لە پێشەکی‌و (٤) چوار بەیت شیعرە:

**(قطعه ى است كه در تاريخ وفات مرحوم عبدالله خان مصباح ديوان مكرى طاب ثراه حقير سروده است وتمامى مصرع مقطع منظور است. كاتبه: احمد حيدرى يوم شنبه نوزدهم شهر جمادى الاخر تحرير شده، لوى ئيل[١٨] ١٣٣٤هـ– حرره ابن المؤرخ احمد العاصى الحيدرى[١٩] مكرى مصباح زاده).**

واتە:

قطعه ایست که در تاریخ وفات مرحوم عبدالله خان

مصباح دیوان مکری طاب ثراه حقیر سروده است

و تمامی مصرع موقع مسطور است کاتبه احمد

حیدری در یوم شنبه نوزدهم شهر جمادی الآخر

تحریر شد لوئی ئیل ۱۳۳۴

حرره ابن المورخ احمد الهامی حیدر زاده مکری

مصباح زاده

از جمادی دوم نوزده رفت چون تمام * در شب شنبه که ساعت سیم بود ز بام

همه در آن سال همانا که نهنگ آمده نام * همه آفاق پر از ظلمت گشته ظلام

لمعه روح ز مصباح تنش گشته جدا * سال تاریخ وفاتش ز خرد جستم و گفت

با بفردوس حرم امید در آنکه د مقام * از همان خلد برین قلب ادب بانی مقام

(پارچه شیعرێکه بۆ مێــژووی وەفــاتی خوالێخۆشــبوو عەبـدوڵڵاخان-میســباح دیوان موکری- گۆڕەکەی پڕ نووربێ- لەلایەن ئەم کەمینەیەوە نووســراوەو هــەموو نیوە بەیتێکیشی مەبەستێکی تێدا هەیــە. نووســەرەکەی: ئەحمــەد حەیــدەری. لــە ڕۆژی شەممە، نۆزدەیەمی مانگی جــەمادی دووەمــدا نووســراوە. ســاڵی نەهــەنگی ۳۳٤ کۆچــی، نووســیارەکەی: کــوڕە مێــژوو ڕاگرەکــەی: واتــە: ئەحمــەدی یــاخی حەیدەری موکری میسباح زادە).

ئەمەش (٤) چوار بەیتە شیعرەکەیە:

**١.از جمادی دوم نوزده چون رفت تمام**
**همد انسال همانا که نهنگ امده نام**
**٢.در شب شنبه کەساعت شش ونیم بود زمان**
**همه افاق  پر از ظلمت شب گشته ظلام**
**٣.لمعه روح ز مصباح تنش گشته جدا**
**تا بفردوس خرامید در ان کرد مقام**
**٤.سال تاریخ وفاتش ز خرد جستم وگفت:**
**از همان خلد برین قلب ادب جلی مقام.**

واتە:

١.کە نۆزدە ڕۆژی تەواو، لە جەمادی دووەم تێپەڕی
لەو ساڵەدا کە ناوی (نەهەنگ)ی لێ نرا
٢.لە شەوی شەممەدا، کە سەعات شەش‌و نیو بوو
ئاسۆ، هەمووی رەش هەڵگەڕاو تاریکیی شەوی داگرت
٣.بروسکەی ڕۆح، لە جەستەی (میسباح) جیابووەوە
تا بەرەو بەهەشت بچێ‌و لەوێ جێیەك بگرێ
٤.ساڵی مێژووی مەرگیم لە عەقڵم پرسی‌و وتی:
هەر لەبەهەشتی بەریندا، دڵی (ئەدەب) نیشتەجێ بووە.

بەم پێیە نیوەی دووەمی دوا بەیت (واتە: بەیتی چوارەم)، کە مێـژووی مـەرگی (ئەدەب)ی تێدایەو بریتییە لەم رستە فارسییە: (از همان خلد برین قلب ادب جـای مقام).

بەگوێرەی لێکدانەوەی بەیتیی ئەبجەد، ئاوا دەکات:

-از همان= ١٠٤

-خلد= ٦٣٤

-برین= ٢٦٢

-قلب= ١٣٢

-ادب= ٧

-جای= ١٤

-مقام= ١٨١

کۆی هەمووی= ١٣٣٤ هیجری قەمەری

ئەم مێژووی (هیجری)یەش، کە کردییە سەعات شەش‌و نیـوی شـەوی شـەممەی بەرامبـەر (١٩ی جـەمادی دووەمـی ١٣٣٤ی هیجـری)، لـە کـاتی گۆڕینـدا بـۆ مێژووی (هەتاوی)و (زایین)ی، ئاوای لێ دەردەچێ:

**-١٢٩٥/٢/٢ هەتاوی**

**-١٩١٦/٤/٢٣ زایینی**

ئیتر ئەم بەڵگە زیندووەو بەڵگەی پێشووتریش، کە لەلایەن نەوەکانی (میرزا ساڵح کیانی)ی نووسیارو میرزای خودی (عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان)ەوە چنگمان خستو لە چاپی یەکەمی دیوانی (ئەدەب)دا بڵاومان کردەوەو پێشووتریش ئاماژەمان پێکرد، چ لەڕووی یاساییو چ لەڕووی زانستەوە، دڵنیایی یەکجارییو ئەرخایەنی تەواون لەبارەی مێژووی مەرگی (ئەدەب)ەوە، کە نزیکەی (٩٥) نەوەدو پێنج ساڵێك بوو، لای مێژووی ئەدەبی کوردی، بەشاراوەیی مابووەوە.

**پەراوێزەکان:**

١.چاپی یەکەمی دیوانی (ئەدەب) کە (کۆکردنەوە، بەراورد، ساغکردنەوەو فەرهەنگ نووسینی لەلایەن ئێمەوە ئامادەکرا، دەزگای چاپو پەخشی (ئاراس)، لە ساڵی ٢٠٠٥ز-دا، چاپو پەخشی کرد.

٢.دیوانی ادب، عبداالله بگ مصباح، رواندز ١٩٣٦، ل(١)، پێشەکی حسین حوزمی موکریانی.

٣.عەلائەدین سەججادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەغدا چاپی دووەم ١٩٧١، ل٤٣٧-٤٤١.

٤.دیوانی ئەدەب، یادگاری عبدالله بەگی مصباح الدیوان، چاپی سێیەمین، هەولێر ١٩٦٦، پێشەکی گیوی موکریانی.

٥.ابوبکر خوانچە سپهرالدین، زندگینامەی عارف ربانی حضرت شیخ یوسف ملقب به شمس الدین برهانی، انتشارات صلاح الدین ایوبی، راومیە، چاپ اول ١٣٦٨ش، صص: ٣٦٢-٣٧٢.

٦.د. عزالدین مصطفی رسول، الواقعیة في الادب الکردي، بیروت ١٩٦٧، ص ٨١، حاشیة ٣.

٧.دکتۆر مارف خەزنەدار، عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان، چاپخانەی ئیرشاد، بەغداد ١٩٧٠، پێشەکی، ل٧-٨.

٨.د.عەبدوڵڵا یاسین ئامێدی، پەیدابوونی رەخنەی ئەدەبی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، هەولێر، ئاراس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣، ل.١٠٩

٩.دیوان مصباح الدیوان ادب، مستەفا ئێلخانی زادە، انتشارات محمدی، سقز، سال چاپ؟ پێشەکی، ل٦-١٠.

١٠.دیوانی مصباح الدیوان ئەدەب، شەرحو لێکدانەوە: محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ)، انتشارات صلاح الدین ئایوبی، چاپ ١٣٨١ش، پێشەکی: ل.١١

١١.واسیللی نیکیتین، کرد وکردستان، ترجمه (فارسی) محمد قاضی، چاپ اول، تهران ١٣٦٦ش، انتشارات نیلوفر، ص ٥٨٣-٥٨٤. دیسانیش تەرجەمەی

عەرەبی هەمان سەرچاوە، کە بەم ناونیشانەیە: باسیل نیکیتین، الکرد وکردستان، دراسة سوسیولوجیة و تاریخیة، نقلة من الفرنسیة الی العربیة الدکتور نوری طالبانی، منشورات ئاراس، الطبعة الاولی ٢٠٠٤، ص.٣٤٣

١٢.دکتۆر مارف خەزنەدار: عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان، شاعیری گەورەی خاکی موکریان، چاپخانەی ئیرشاد، بەغداد ١٩٧٠، پێشەکی، ل.٨

١٣.دکتۆر مارف خەزنەدار، دیسانەوە ئەم مێژووی هیجرییەیشی بەهەڵە بۆ مێژووی (زایین) گۆڕیوەو راستییەکەی ئەوەی سەرووترە، کە ئێمە گۆڕیومانە، نەك گۆڕینە هەڵەکەی ئەو، کە کردوویەتییە (١٣ی تشرینی یەکەمی ١٩١٦ز)و جیاوازیی لەگەڵ ئەوەی ئێمەدا (ساڵێكو رۆژێکە!).

١٤.لە چاپی یەکەمی دیوانی (ئەدەب)دا، بەهۆی هەڵەی چاپەوە- کە بەسەرماندا تێپەڕیبوو- بەتەنیا ئەم مێژووی زایینە، ئاوا نووسرابوو: ١٩١٦/٥/٢٢ز- کە راستییەکەی دەکاتە ئەوەی سەرووتر، واتە: ١٩١٦/٤/٢٣ز.

١٥.کتێبەکە ئەگەرچی زۆر جوان هەڵگیرابوو، بەڵام لەبەرئەوەی زۆر کۆن بوو، چەند لاپەڕەیەکی بەرو پێشی، پێوە نەمابوو، بۆیە نەمانزانی ناوی چییە.

١٦.(ئەدەب) چوار کوڕی بووە: محەمەد کەریم، محەمەد رەحیم، ئەحمەد، عەزیزخان. بەم پێیە (ئەحمەد) یان سێیەمین کوڕی عەبدووڵڵا بەگە، کە بە (ئاغا چکۆلە) بەناوبانگ بووە.

١٧.لوی ئیل: دوو واژەی لێکدراوی تورکییە، بەمانای: ساڵی نەهەنگ. فرهنگ دهخدا، جلد ١٣، ص١٩٨٤١.

# دوو نامەی نێوان شاعیری ناسراو

# (میسباح دیوان — ئەدەب)

# و

# دۆستێکی

## ڕونکردنەوەیەکی پێویست

ساڵی (٢٠٠٥ ز)، دوای گەڕان و ماندووبوونێکی پشوو درێژ و هاوکاریی دڵسۆزانەی چەندان هاوڕێی نووسەر لە خۆرهەڵاتی کوردستان، توانیم دیوانی شیعری شاعیری ناوداری موکریان: عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان — ئەدەب (؟ - ١٩١٦/٤/٢٢ ز)، بە لێکدانەوە و بەراورد و پەراوێزەوە ساغ بکەمەوە و لە دەزگای (ئاراس) بە چاپی بگەیەنم.. سەیر لەوەدا بوو هەندێ لە نەوەو نزیکەکانی میسباح دیوان (ئەدەب)، بەر لەوەی چاپی دیوانەکە، بەو شێوە جوان و قەوارە (٩٢٠) لاپەڕەییە چاپ بێت، زۆر سەخت و بە چەڵەمە، شیعر و نامە و نووسینەکانی ئەم شاعیرەیان لە چنگ دەردەهێنرا. بەتایبەتیش (وەك لە پێشەکی دیوانە چاپکراوەکەدا ئاماژەم پێ کردووە، ل ١٩)، مەلایەك بە ناوی مەلا قادر (١٩٤١ز)ی کوڕی میرزا ساڵح، لە گوندی (ئەرمەنی بلاغی — گوندەکەی ئەدەب)، شیعر و نامە و نووسراوێکی زۆری (ئەدەب)ی بەلاوەیە. چۆنیش ئەم شوێنەوارە بەنرخانەی (ئەدەب)ی کەوتۆتە لا، بەسەرهاتەکەی ئاوایە: باوکی ئەم مەلایە، واتە: میرزا ساڵح (؟ - ١٩٧٨ ز)ی کوڕی محەمەد ئەمین کوڕی عەبدولڕەحمانی کیانی، هەر بە لاوێتیی لەبەردەستی (ئەدەب)دا پەروەردە بووەو بەو هۆیەوە کە زیرەك و خەتخۆش بووە، زۆری خۆش ویستووە و برازایەکی خۆیشی لێ مارە کردووە. ئەم میرزا ساڵحە، کاری نووسیاریی — میرزایی لەبەردەستی (ئەدەب)دا کردووە و زۆرینەی شیعر و نامەی تایبەتی و شوێنەواری ئەدەبیی و هونەریی و کتێبخانەکەی (ئەدەب)ی بەلاوە بووە و دوای مەرگی (ئەدەب)یش، هەموو ئەو شیعر و نامە و شوێنەوار و بەرهەمانەی (ئەدەب)، هەر لای ئەم میرزا ساڵحە ماونەتەوەو بە شێوەیەکی زۆر جوان و بە ئەمانەتەوە لای خۆی پاراستوونی و وەك سەرمایەیەکی پیرۆز و بەهادار، نرخیانی زانیوەو نەیهێشتووە تەنانەت لەتە کاغەزێکیشی لێ بفەوتێ.. بەڵام مخابن! دوای مەرگی میرزا ساڵح، هەموو ئەو شوێنەوارانە کەوتوونەتە لای ئەم (مەلا قادر)ە نەخوێندەوارەی کوڕی و هەندێ لە خزم و نزیکانی هاوشێوەی ئەم مەلا قادرە.

ئەم مەلا قادرە، کە نرخی ئەم شوێنەوارانە نازانێ، لە بەرامبەر هەندێ دەستکەوتی زۆر کەمدا، بەم و بەویان دەفرۆشێ و لەناویان دەبات و جۆری لەناوبردنەکانیشیان ئەوەندە دڵتەزێنانەیە، هیچ کەڵکێکیان بۆ فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی و تەنانەت بۆ کڕیارەکەش نامێنێ، چونکە (بۆ وێنە) ئەگەر شیعر، یان نامەیەکی (ئەدەب)، بریتی بن لە چەند لاپەڕەیەك، ئەوا هەر تاکە لاپەڕەیەکیان بە کەسێك دەفرۆشێ و تەنانەت ڕوودەدات، هەر لەناو تەنیا لاپەڕەیەکدا، کە نامەیەك، یان شیعرێکی لاپەڕەی پێشووتری تێدا تەواو دەبێت، بە دوایدا چەند دێڕ لە نامەیەك، یان چەند بەیتێکی سەرەتای شیعرێکی تری تێدا نووسرابێ و هەر بەم شێوەیەش کاك یونس ئەمین پوور-ی گوندی (ڕەحیم خان)ی هاوسێی گوندی (ئەرمەنی بلاّغی)، توانیبووی هەندێ شیعر و نامە و تابلۆی نیگارکێشی (کاری خودی — ئەدەب)، لە مەلا قادر وەربگرێ و بە لوتفەوە هەندێکیانی بۆ من هێناو منیش چەند جارێك لەگەڵ ناوبراو و هاوڕێیاندا: کاکە ناسری وەحیدی چیرۆکنووس و یونس ڕەزایی شاعیردا، بۆ لای مەلاقادر لە ئەرمەنی بلاّغی چووین و بەهەر شێوەیەك بووبێ، هەندێ شیعری بڵاونەکراوەو چەند نامەیەکی تایبەتی (ئەدەب)مان لە چنگ دەرهێنا، کە دیسان هەر بە شێوەی پچڕ پچڕ و نیوەو ناچڵ بوون.

بەڵام دوای چاپی دیوانەکە و لەو قەوارە جوان و شایانەدا (کە وتمان)، زۆر لەو کەسانەی دڵخۆش و سەراسیمە کرد، کە هێشتا شوێنەواری نووسینی (ئەدەب)یان لای خۆیان گل دابووە و خۆیان لێ نەبان دەکرد. کە خۆشبەختانە بە دنە و هاندانی هەمان هاوڕێیانی دڵسۆز، کەوتنە دەرخستنی چەندان نامە و شیعری نەدیتراوی (ئەدەب) و بەڵگەنامەی گرنگ و لە ناویاندا بەڵگەنامەی مێژووی ڕاستەقینەی رۆژ و سەعاتی مەرگی (ئەدەب)، کە (ئەحمەد)ی کوڕی خودی (ئەدەب)، بە شێوەی شیعر نووسیبووی و پێش ماوەیەك کردمانە وتارێك و لە گۆڤاری (ئایندە)ی ژمارە (٨٢)دا بڵاومان کردەوە.

لەم نامەیەدا لەلایەکەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە (ئەدەب)یش پێش ساڵی (١٩١٤ ز) سەردانی تورکیای بەتێر و تەسەلیی کردووەو لە لایەکی تریشەوە، زانیاریی ئەوەشمان دەست دەکەوێ، کە (ئەدەب) لە سەروبەندی نووسینی ئەم

نامەیەدا (مانگی مایسی ١٩١٤ ز)، نیشتەجێی گوندی (ئەرمەنی بلاغی)یە.. لە سەروو ئەمانەشەوە، گیان و هۆشی کوردپەروەرانەی (ئەدەب)مان بە زەقیی و بە ئاشکرا لە رۆژگارێکدا بۆ دەردەکەوێ، کە هێشتا جەنگی یەکەمی جیهان رووی نەداوەو هێشتا ئەو جۆرە هۆشیاریی و بیروباوەڕانە لە خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا بلاونەبوونەتەوە، کە دواتر بوونە هۆی زەمینە خۆشکردن بۆ کرانەوەو گەشانەوەی بیروباوەڕی زۆرینەی خەلك، بۆ ئازادی و ژیانی سەربەستانە.. کە (ئەدەب) ئەم هەستەی بەر لە (٩٥) نەوەد و پێنج سالٚ دەربڕیوە.

بە مانایەکی تر: لە ڕێگەی ئەم نامەیەوە بۆمان روون دەبێتەوە، کە (ئەدەب) هەر بە تەنیا خەریکی (شیعر) و خەیالٚ کردنەوە لە وێنەی شیعریی نەبووە، بەلٚکو هاوکات ڕووناکبیرێکی هۆشیاری رۆژگاری پێش یەکەمین جەنگی جیهانەو پێش مێژووی ئەم نامەیەی(ئەدەب)یش، نامەی شاعیرێکی تری کلاسیکی کوردمان لەبەردەستدا نییە، تا بەمجۆرە و لە ڕێگەی (نامە — پەخشان)ەوە، هەستی کوردانەی خۆیان بۆ دەربڕێ.

# نامەی یەکەم

**نامەی میرزا ساڵح کیانی – بۆ:**

**عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان (ئەدەب)**

**بۆ: ئەرمەنی بلاغی – هەرێمی موکری**

**مێژوو: ١٨ی مانگی جەمادی یەکەمی ١٣٣٢ کۆچی (١٩١٤/٤/١٤) ز**

**نمرە: ٢**

لە دەوری دەرکەوتن و درەوشانەوەی پڕ سۆزتان گەڕێم دوای پێشکەشکردنی دوعای تەمەنی درێژو بەرزیی و شکۆمەندیی و دەسەڵاتدارییی، ئەم بەندەیەی حەزرەتی هێژا و پایەبەرز و رەسەنتان، دەست پێشکەریی و پڕکێشیی دەکات و ئەم پوختەنامەیەتان پێشکەش دەکات.

هەرچەندە هەفتەی پێشوو، هەر کە گەیشتمە کۆشکی بەختەوەریی: ئیسلامبول، باسێکی تێرو تەسەلم سەبارەت بە داروباری خۆم و چۆنێتی ڕێگەو بان بۆ نووسین و هاوپێچ لەگەڵ نامەکەی جەنابی حاجی میرزا عەبدوللەتیفدا ناردمە خزمەتتان و بە پشتیوانی خوا تا ئێستا گەیشتووەو ئێوەی پرشنگداری رازی کردووەو دیسانەوەش بەپێی بەجێهێنانی نوێکردنەوەی ئەرکی نۆکەرایەتیی، ئەگەر لوتف بفەرموون، سەرنجێك بە دەنگوباسی نۆکەردا دەگێڕن، چونکە هەروەك پێشتریش عەرزم کردبوون، بەو هۆیەوە کە بەدەم ڕێوە، سەرمام ببوو و جلوبەرگیشم گۆڕیبوو، ئەم یەك دوو ڕۆژە، هەڵامەتێکی درێژخایانم تووش هاتووەو بەکەڵکی چوونە دەرەوەو دەرچوون نەهاتووم. بەڵام ئێستا لە سایەی خوای گەورەو بەخشندەوە، چاك بوومەتەوەو لەگەڵ جەنابی هێژا و قیبلەم: مەلا عەبدوڵلا ئەفەندی برامدا، سەرقاڵی بەسەرکردنەوەی قسە و باسی ساڵانی رابووردووین و دوعاگۆی لەش ساغیی و سەلامەتیی، ئێوەی بەختەوەر و پیرۆزین. لە ڕاستیشدا ناوبراو لە باری پیاوەتیی و سۆز و میهرەبانیی خودا پێداویی جەنابتانەوە، کە بەرامبەر بەم نۆکەرەتان نواندوتانە، سوپاسگۆتانە و لە سایەی خواشەوە، پەژارەیەکمان نییە و لە هیچیشمان کەم نییە، جگە لە پەژارەی بێ تۆیی، کە لە تەکماندا نیت.

ئەگەر دەنگوباسی تری بەندەتان و جەنابی کاکی ناوبراوم، لوتف دەفەرموون، هەرچەندە روونکردنەوەی (...)(١)، یان لە سایەی نەفەسی پیران و لوتفی تایبەتی پایەبەرزتانەوە، لە هیچ روویەکەوە لە هیچمان کەم نەبووەو نییە و لەوپەڕی کامەرانیی و رابواردنی خۆشداین. بەڵام هۆگربوون بە نیشتمانەوە، شتێکی ترە. لە

خوای گەورەم داوایە، ئەوەی بووە سۆنگەی لەبەریەك هەڵتەكاندنی خێزانەكەمان و ئاوارەبوونی جەنابی براكەم(٢) و كوژاندنەوەی چرای بنەماڵەی باوانم و پەكخستن و چۆڵكردنی ئەم هەموو كتێبخانەیەی كە پشتاوپشت لە باپیرەوە بۆ باوك مابوونەوەو هەمووشیان كتێبی زانایانی ناوداری رۆژگاری خۆیان بوون، هەر بە ڕاستی سۆنگەی هەموو ئەمانەش: نا حاجی! (سەیید میرزا) بایەزیدی خالۆم بوو، خوا هەقی لێ بسێنێ.

لەم پەلە پەلەشدا شتێك لەبارەی ئەم قسانەوە، لەگەڵ جەنابیاندا باس نەكراوەو جارێ پەناش بۆ شتێك نەبراوە، تا بزانین لە داهاتوودا بە پشتیوانی خوای مەزن، چ چارەنووسێكی لە پشتی پەردەی غەیبەوە، دیاری فەرمووەو گەلاڵەی ئاییندەی ئێمە، لەلایەن هەڵسوڕێنەرانی قەزاو قەدەرەوە، بە چ جۆرێكیان داڕشتووە!. هیوادارین بە پشتیوانی خوا، بەم زووانە ئەم لەمپەری غەریبایەتییە بە یەكجاریی لابچێ و بە كامی دڵ و بە گوێرەی ئارەزوو، ئەم چەند رۆژەی تەمەن، بەدەم دوعاگۆكردن بۆ سەلامەتیی جەنابتان، بەبێ پەژارە بەسەر بەرین و بێگومانیش هەمیشە و هەموو كات، جەنابتان لە هەواڵی ئەم بەندەیەتان و دەنگوباسی كاكیشم بێبەش ناكەم و گەرەكیشمە لە هیچ كاتێكدا، درێغیم لە مەرج و ئەركی نۆكەرایەتیمدا نەكردبێ.

لە پاڵ ئەمانەشدا، پێویست بوو پوختەیەكی دەنگوباسی دنیای شارستانیی و پێشكەوتووی ئیسلامیی ئێرەتان بەرچاو بخەم، تا لەگەڵ داروباری ئێستای خۆماندا سەرنجی بفەرموون، كە هەرێمەكەی ئێمە و ئەم (كورد)ە نارێك و شپرزە و كلۆڵەی ئێمە، چۆن لە چاڵی نەزانیندا گیری خواردووە و لە تاریكیدا، سەرلێشێواو ماوەتەوە!. بەو هۆیەشەوە كە روونكردنەوەی ئەم شتانە، بە نووسین نەدەتوانرا، بۆیە بۆ ئەمە، سێ رۆژنامەتان پێشكەش دەكەم. هەرچەندە توركی ئێرە، لەگەڵ توركی(٤) ئەوێدا، جیاوازیی هەیە، بەڵام سوپاس بۆ خوا، بەهۆی سەلیقەی هەمیشە ئامادە و زیرەكیی زگماكیی خوداپێداویتانەوە، بەلاتانەوە گرنگ نابێ.

دوای ئەمانەش، كە بێگومان خۆتان پێشینەتان لەم بارەیەوە هەیە و دڵنیان، دەبێ لە بیری ئامادەكردنی جەنابی (ئاغازادەی چكۆلە)(٥)دا بن، تا بەڵكو بە پشتیوانی خوا، لە نێوان ئەو كرمانجانەدا ون نەبێ و هەرچۆنێك بێت، دەبێ لە

تەورێز خوێندەوارییەك بەدەست بهێنێ، تا وەك ئێمە چاوبەستراو نەمێنێ و سوپاسیش بۆ خوا، كە سێبەرێكی وەك جەنابی موبارەكتانی بۆ بەرزكردنەوەی ئاستی ژیانیان بەسەرەوە هەیە و خواش پلەو پایەی پێ دەبەخشێ. ئەی ئیتر بۆچی بۆ خوێندن نەچێ و نەبێتە مرۆڤ!؟ كە ئەگەر ئێستاكە نەچێ، لە دوایيدا، واتە: لە نێوان ئەم یەك دوو ساڵەدا، بۆی دەردەكەوێ كە دەبێ بەرد بە ئەژنۆیدا بدات[٦].

حەزرەتی پایەبەرزیشتان بۆ دەبێ بە قسەی ئەو بكەن و گوێی لێ بگرن؟!. لەبەرئەوە بە هەر شێوەیەك بێ، دەبێ هەتا زووە، چاكتر وایە رەوانەی بفەرموون. لە راستیشدا من لاپرەسەنیم كرد و داوای لێبووردن دەخوازم و لەبەر بەرژەوەندیی، پرِكێشیم كرد و چاكەی مەملەكەتیش، خودی دەسەڵاتدارانی دەیزانن[٧]

سەبارەت بە ماڵەوەی نۆكەریشتان، پێویست بەوە ناكات لەم بارەیەوە شتێ روون بكەمەوە. بەڵام خودی حەزرەتی پایەبەرزتان ئاگادارن، لە كاتی بەرِێكەتنمدا، بۆ ئەوەی ماڵەوەمان و خوشكەكەم نەگرین و دڵتەنگ نەبن. تا رادەیەك لەوەم دڵنیاكردن، كە سەفەری ئیسلامبول ناكەم و لای ئەوان هەر تەنیا باسی سەفەری ساوجبلاغ (سابلاخ) م كردووە و ئەم سەفەرەی بەندەتان، هەر بە تەنیا حەزرەتی پایەبەرزتان دەیزانێ، لەبەر ئەوەیە دەزانم كاتێ بۆیان دەردەكەوێ بۆ ئێرەوە هاتووم، خوشكم و خێزانەكەم، زۆر پەژارەیان دەبێ، بەتایبەتیش خوشكم، كە دەزانم چ حاڵەتێكی بەسەردا دێت. لەبەرئەوە لەم رِووەوە لە بەرامبەر پیاوەتیی جەنابی پایەبەرزتاندا تكاكارم، بەڵكو كەسێك لای ئێوەی دڵسۆزەوە، بچێتە لایان و دڵنەواییان بكات. چونكە ئافرەت بە دڵدانەوە ئارامی دەبنەوەو سەلامەتیی بەندە و جەنابی هێژای كاكمیان بگەیەنێتێ و دڵنیایان بكات و وایان بێنێتە پێش چاو، چۆن چوار ساڵ لەمەوبەر، بۆ ماوەی چواردە مانگ، لە خزمەت پایەبەرزتاندا لە سابلاخ، خەریكی خزمەتگوزاریی جەنابتان بووم، ئێستاش هەر وابزانن لە سابلاخم و لە بارەی منەوە پەژارە نەبن و لە سایەی خواوە، بەندە، بە سەلامەتیی، بە شەرەفی دیدەنی و دیداری جەنابی كاكی بەرِێزم گەیشتووم و پەناش بە خوا، لەمەودوا دڵئێشانێك روو نادات.

لە بارەی خەرجیی ماڵەوەمان، هەرچەندە بەهۆی میهرەبانیی هەمەلایەنەی جەنابتانەوە، بێ خەرجیی نەبوون و نابن، بەڵام بۆ ئەوەی لە رِووی پۆشاك و قەند و

چایی و شتی ترەوە، کەموکوڕییەکیان نەبیّ، با "محەمەد ئەمین"ی کوڕم، کە بەلای خوشکەکەمەوەیە، ئەمر بفەرموون بچێتە خزمەت ئاغازادەی مەزن: جەنابی محەمەد کەریم خان(٣) و لەو پارەیەی بەلایانەوەیە، بە پەلە (٣ — ٤) تمەنێك بداتە خوشکم و خودی جەنابی بەخشندەشتان، پسوولّەیەکی لە بەرامبەر پارەکەدا لیّ وەربگرن. دیسانیش ئەمر بفەرموون با سولّتان کوێخا ئیبراهیم، شەوان بچێتە مالّی ئێمە و لەویّ بخەویّ. ئیتر پێویست ناکات هیچی ترتان عەرز بکەم.

سالّی پاریش مالّەوەمان نەخۆش کەوتبوو، هەتا دەهات لاواز و بیّ هێز دەبوو. جەنابی خۆشتان چەند جارێك لوتفتان فەرموو (دژەتالّ) و هەندیّ شتی ترتان بۆ راسپاردبوو. ئەو کاتەش کە بەندەتان بەڕیّ دەکەوتم، هەر باسی بیّ هێزیی خۆی دەکرد. منیش هەرچی جاریّ بەخزمەتتان گەیشتووم، نەخۆشییەکانیم بە وردیی عەرزکردوون و ئەو دەرمانانەش کە دەبوایە لەسەر ئەمری جەنابتان بەکاریان بهێنیّ، نازانم تا ئێستا ئامادەکراون، یا نا؟ داواکارم ئەو دەرمانانەی بۆ چارەی دەست دەدەن، لوتف بفەرموون لە ڕێگەی (کاکەمەم) ەوە بیدەنیّ.

هەرچەندە شایانیشی نییە، بەلاّم هەر بۆئەوەی نامەکەم تەنیا نەبیّ، چواردە دانە کارت پۆستالّ-م لە پاکەتێکدا پێچایەوە و پێشکەش حزووری موبارەکتانی دەکەم. لەبەرئەوەش لەم پەلە پەلەدا، لە گەیشتنی ئەمانە دلّنیا نەبووم، بۆیە جاریّ زیاترم پێشکەش نەکردن. بەلاّم جەنابی هێژا: مەلا عەبدوللّا بڕیاری داوە لەمەودوا هەر جارەی چەپکیّ وێنەی گەورە و کارتی چاك و نایاب، کە شایانی بەڕێزتان بن، بە ناوی دیارییەوە، بە پۆستدا رەوانە فەرمووەو ئێستاش کە هیچ یەکێك لەمانەتان پێنەگەیشتوون، ئەوا لەم بارەدا بەندەتان وای بە چاك زانی، تا ئەو کاتەی بۆم دەردەکەویّ کە ئەوانەی تر گەیشتوون، یا نا! لە ڕاستیشدا بەندەتان زۆرم خەمی نەگەیشتن و لەناوچوونی ئەوانە خواردووە.

یەکێکیش لەو کارتانە، کە بە ناوی جەنابی (ئاغا چکۆلە)وە پێشکەشم کردووە، لوتف بفەرموون پێی بگەیەنن و بەمەش بەندەتان سوپاسگۆ و پێزان دەبیّ.

لە پالّ ئەمانەشدا داواکارم دەنگوباسی کێشەی گوندی گۆگتەپە، تا ئێستاکە بە کویّ گەیوە! پێمی بفەرموون، تا پەژارەم برەوێتەوە. بە پشتیوانی خوا تا ئێستا

دەبێ مشتومڕی لەسەر دوایی پێهێنرابێ و گەڕابێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆتان. ئەگەر جەنابی بەڕێز (شەمسە)ش لەوێیە، ڕێز و بچوکیی و عەرزی ئەدەب لە خزمەتیاندا پێشکەش دەکەم. خوا یاربێ مەسەلەی (کانی مەملی)ش خراوەتە بەر باس و دانوساندن.

هەر بەم ناونیشانەش نامەم لە سابڵاخەوە بۆ (میاندواو) ڕەوانە بفەرموون. بە پشتیوانی خوا بە جەنابیان دەگات و ئەوانیش بۆمی ڕەوانە دەکەن. منیش کە نامە دەنووسم، دەیسپێرمە ئەوانەی لە سابڵاخەوە دێن و دەیاننێرمەوە خزمەت قازی لەتیف و حاجیساڵحیش بچێ وەریان بگرێ و بەخزمەت جەنابتانی بگەیەنن.

**بەندەتان**

**محەمەد ساڵح**

# نامەی دووەم

**نامەی عەبدوڵلابەگی میسباح دیوان (ئەدەب)**

**بۆ: میرزا محەمەد ساڵح**

**بۆ خزمەت حەزرەتی سەروەرم**

**میرزا محەمەد ساڵح – سەروەریی زیاتر بێت**

**١٨ی جەمادی دووەمی ١٣٣٢ هیجری (١٥/٤/١٩١٤)ز**

سەرەتا سوپاسی ئەم نیعمەتە بێ وێنەیەی خوای مەزن دەکەم، کە کەڵکەڵەی دڵمی هێنایەدی، تا ئێوە بۆ ئەم سەفەرە خێرە بنێرم و جەنابتانیشی بۆ ئەمە رێنوێنیی کرد، کە دیارە بە هۆی دڵ و دەروون پاکیتانەوە بووە، تا ئەم سەفەرەتان بۆ کۆشکی بەختەوەریی: ئیسلامبول (ئەستەموولّ) بۆ بڕەخسێنێ و بە دەمیشییەوە شەرەفی دیدار و دیدەنی جەنابی بن و بنەچە سوپاسکراو: حاجی مەلا عەبدوڵلا ئەفەندی براتان (خوا بیپارێزێ) بکەن، کە سالأنێکە لە تاو ئارەزووی دیداری ئێوە، هەر بە تاسەتانەوە هەڵدەقرچێ و پێی شاد دەبێ و هاوکاتیش ئەوەندەی هەلتان بۆ هەڵدەکەوێ، گەشت و گوزار و سەیرانی گیانبەخشی هەر سێ شاری (ئاستانە)، یان بە واتەیەکی تر: (قوستەنتەنیە) دەکەن، کە بریتین لە (ئیسلامبول) و (بەگ ئۆغڵی) و ئۆسکۆدار) و بەدیتنیشیان بەختەوەر و دڵشاد دەبیت.

وەك دەزانین سەردانی (ئیسلامبول)یش، لەو سەیران و گەشتانەیە، کە وەك مانگی مایەی رۆشنایی چاوو رووناکایی گۆی زەوی دێتە ئەژمار، بێگومان خۆتان بەهای ئەم لایەنانە دەزانن و سەیران و دیتنی هەندێ لەو جوانییە پڕ لە شادی بەخشانە، لەوە بە چاکتر دەزانن، کە کاتەکانتان لە ماڵەوە بەسەر بەرن.

لە ناو ئەمانەشدا، سەردانی چەندان جارەی (بوغاز) لەدەست مەدەن و رۆژانەش هەر بە سەیری (بوسفۆر)ی بەسەر بەرە و تێپەڕێنە. (بۆسفۆر)یش واتە هەمان زەریاچەی گەردن و مل ئاسا، کە (زەریای رەش) بە زەریای (داردەنیل)، یان (زەریای مەڕمەڕە)، یان (زەریای سپی) بەیەك دەگەیەنێ و هێڵی جیاکەرەوەی نێوان هەرسێ شاری (ئاستانە)یەو لە هەمان کاتیشدا، ئەو سنوورە ئاوییەی نێوان هەردوو بەشی (ئاسیا) و (ئەوروپا)(٨)یەو دەبێ تێر لە سەیرکردنی نەخۆیت، چونکە ئەو رۆژەی کە رێبوار پێدەنێتە ئەمجۆرە جێگا تایبەتانە، ئاستی خوێندەواریی، هەرچەند بالأبێ و سەرنجیشی چەند تیژ و ورد بێت، کەچی هێشتا وەك ئەو کەسە وایە، کە نابینا، یان چاوبەستە بێت.

بۆیە بۆ کەسێکی وەك جەنابتان، کە خۆتان خاوەن قەڵەم و نووسین و لێکدانەوەن، لە سەرتان ئەرك و پێویستە، کە ئەگەر هەر ڕۆژێك بۆت رێکەوت، بە (...)(٩) بگەڕێیت، یان ئارەزووی گەشت و گەڕانت نەبوو، ئەوا هەر دوو، یان سێ

ڕۆژ جارێك، دوو سەعات، یان دوو سەعات و نیو بەر لە خۆرئاوابوون، بە سواری ئەو ئامێرە بچووکانەی کە تایبەتن بە گەشت و گەڕان، لە خزمەت جەنابی حاجی مەلا عەبدوڵڵا ئەفەندیدا، یان یەك دوو کەسی تری شارەزاو ئاگاداردا، کە جێی متمانە و بڕوای ناوبراوبن و لەم چەند ساڵەی مانەوەی خۆیدا لە ئیسلامبول بە دەستپاکیی و دیانەتەوە، تاقی کردبنەوەو هەڵێبژاردبن، بچنە سەردان و گەڕان و بە چاوی کراوەو سەرنجەوە، لەو هەموو کۆشك و تەلارە ڕەنگاو ڕەنگە ورد ببنەوە، کە سەر لە ئاسمان دەسوون و ئەو هەموو دارو درەختە بەردار و گوڵ و باخە لە ئەژمار نەهاتووە ببینن، کە بە درێژایی ڕۆخ و لێواری زەریادا نێژراون و چێژ لە دیتنیان وەربگرن و لە بەرامبەریاندا سوپاسی پەروەردگار بکەن و بڵێن: ئەی ئەو پەروەردگارەی کە کەس نەیدیویت، ئێمەی (کورد)، لەگەڵ خەڵکی ئەم وڵاتە، هەردوولامان، کە دەستکردی خۆتین، ئەی بۆچی بەشی ئێمەی داماو، هەر کلۆڵیی و سزادان بێ و بەشی خەڵکی تریش، کە هەر دەستکردی خۆتن، چ سەیرانگەیەکت پێ بەخشیون؟. ئێمەت چۆن خولقاند و چیت بە ئێمە ڕەوا بینی و بە خەڵکانی تریش، چیت پێ ڕەوا بەخشین؟ چ داماویی و تەنگانەیەکت بە ئێمە بەخشی و چ ژیانێکی پڕ سەروەریی و شکۆمەندیت بە خەڵکی تر بەخشی؟. ئێمە خراینە بەر چ تەقەللایەکی دژوار و خەڵکانی تریش، لە چ ژیانێکی خۆش و ئاساندان؟ ئێمەت لە چ دواکەوتوویی و خەڵکانی تریشت لە چ ژیار و پێشکەوتندا ئەفراند؟ چ ئاکارێکی ڕەق و دزێو، بەشی ئێمە و بەشی خەڵکانی تریش، چ نەرمیی و لێبووردەییەك؟. بەشی ئێمە، چ نزمیی و سووکایەتی و بەشی خەڵکی تریش، چ سەروەریی!. بەشی ئێمە، چ کەللە ڕەقییەکی زگماك و بەشی خەڵکی تر، چ خۆشەویستییەکی سروشتیی؟! بەشی ئێمە ، چ ناکۆکی و بەشی ئەوانیش، چ تەباییەکی گشتیت پێ ڕەوا فەرموون؟! الحكم لله واحد القهار.

دەبێ ئەوەش بزانیت کە ئەم هەموو حەسرەتە، بە دوای سامان و دەسەڵاتدا، رووکەش و ڕواڵەت نییە، چونکە ئەمە لە هەموو دنیادا هەیە و زۆرە. بەڵام ئەم حەسرەتە و مخابنە، کە ڕۆژ و شەو، لە قوڵایی دڵمدا دەکوڵێ، بۆ ئەو جیاوازیی و بەراوردەی نێوان دنیای پێشکەوتن و شارستانێتی هەمەجۆرەی میللەتانی ترە، لە چاو ئەم (کورد)ە کەمەدا(١٠)،کە لە دواوە ماوەتەوە و لە هەموو جۆرە

پیشەسازیی و داهێنانێکی نویٚ چێژ و کام لە زانست و هونەر وەرگرتن بێبەشە، کە هەڵبەتە لەم ماوە کورتەی مانەوەی خۆتاندا، ئەمەتان بۆ تاقی بۆتەوەو کەم تا کورتێك، دنیای ئێرەتان لە چاو دنیای ئەوێدا بەراورد کردووە.

ئەگەرچی خۆشتان پێشتر شارەزاییتان لە دارو باری ئێرەش هەیە، بەڵام بە گوێرەی ئەو قسەیەی کە دەڵێ: (قسە، قسە دێنیٚ)، منیش هەر بەدەم نووسینەوە، ئەمەم بە یاددا هات، تا لایەنێکی ژیانی (کورد) بە یادی جەنابتان بهێنمەوە.. بۆ نمونەش: ئەگەر لای ئێمە، خێزانی یەکێکی سامانداری دەگمەن (جیاواز لەو خاوەن زەوی و زار و داراییە لە رادەبەدەرانە)، دوای یەك ساڵ ئازار چەشتن بە دەست نەخۆشییەوە، بیەویٚ بچێتە لای پزیشك، یان بە ناوی میوانییەوە سەردانی جێگەیەك بکات، کە ماوەی نێوانیان نزیکەی پێنج — شەش (قۆناغ) فرسەخێك دەبیٚ، ئەوا لەگەڵ ئەوەشدا کە ئافرەتەکەی، لەسەر خواست و ئارەزووی خۆی، بەپێی پەتی لەگەڵ خۆیدا دەبات و دەبیٚ ئەو قۆناغە رێیەش هەر بە پیادە برِوات، بەڵام سەرباری ئەوەش، دەبیٚ بەپێی داب و بەلای کەمەوە، هەندیٚ دیارییش بۆ خزم و خوێشان و دۆستانی، ببات، کە ئەمانەش هەر بە ئافرەتەکەی، وەك کارەکەرێك هەڵدەگریٚ!.

**پەراوێزەکان:**

١- شوێنی ئەو واژەیە دڕاوە.

٢- مەبەستی لە حاجی مەلا عەبدوڵڵای برایەتی، کە لەو کاتەدا سەری خۆی هەڵگرتووە و لە ئەستەموول دەژی.

٣- ئەمیش هەر کوڕی عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان-ە (دووەمین کوڕێتی)

٤- مەبەستی زمانی تورکی ناو قەڵەمڕەوی عوسمانی و ناوچەی موکریانە.

٥- ئاغاچکۆلە: مەبەست لە (ئەحمەد)ی کوڕی (ئەدەب)ە، کە (ئاغاچکۆلە)ی پێ وتراوە و سێیەمین کوڕی (ئەدەب)ە.

٦- لە کوردیدا دەڵێن: کاڵەك بە ئەژنۆ دەشکێنێ.

٧- ئەمە پەندێکی فارسییەو لە دەقەکەشدا ئاوایە: صلاحی مملکت خویش خسروان دانند.

٨- لە دەقەکەدا ئەو شوێنانە لە کەوانەدا بوون.

٩- شوێنی ئەو واژەیە لە دەقەکەدا، دڕابوو.

١٠- لە دەقەکەدا (مشتێك کورد) نووسراوە.

# دەقی نامەکەی میرزا محەمەد ساڵح

# بۆ

# عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب

**الی ارمنی بلاغی ولایت مکری**

**١٨ شهر جمادی الاولی ١٣٣٣ ه.ق[١]**

تصدقی حضور مرحمت ظهور مبارکت شوم... بعداز عرض دعای بقای عمر و شوکت و دولت بندگان حضرت مستطاب اجل امجد بمقام عرض این مختصر مبادرت و جسارت میرود هرچند هفته قبل لدی الورد دار السعاده اسلامبول شرح مجملی را مبنی بر کیفیت احوال خود و وضع راه عرض و در لف پاکت جناب حاج میرزا عبداللطیف قازی روانه داشته و انشاءالله تابحال رسیده و خاطر انور مستحضر شده مجددا باقتضای وضایف چاکری تجدید مصادعت[٢]؟ مینماید مرحمتا حالات چاکر را تفقدی فرمایند چنانکه سابقا عرض شده بود بواسطه سرماخوردگی راه و تغیر البسه این یکی دو روزه بزکام مزمنی مبتلا و حالت بیرون آمدن نداشت لیکن حالاها از

---

١- ئەم مێژووە بە (زایین) دەبێتە: ١٩١٤/٤/١٤ز

٢- لە ساغکردنەوەی ئەم وشەیە بەگومان بووم.

یمن توجه بندگان اجل اکرم افاقه دست داده و باجناب مستطاب قبلەگاهی ام ملاعبدالله افندی اخوی مشغول صحبتهایی از سنەی سوابق دعاگویی وجود مسعود مبارک هستیم حقیقتا جناب معزی الیه نیز از آقائی و مرحمتهای بندگان اجل اکرم که نسبت بچاکر مبذول فرمودەاند متشکر میباشند و للەالحمد نگرانی بسوای محرومی از استفاضه حضور سعادت صدور صورت وقوع ندارد.

سایر احوالات چاکر و جناب اخوی معزی الیه را مرحمتا بخاهند هرچند از توضیح (.....)[3] ویا من انفاس پیران و توجه خاص حضرت اجل عالی از هیچ ممری قصوری نداشته و ندارد و در نهایت کامرانی و خوشگذرانی است لیکن الفت وطن چیز دیگراست از حق تعالی مسئلت است که باعث تفرقەی خانەی ما و اختیار نمودن غربت جناب اخوی خاموش شدن چراغ خانوادەی ابوی و تعطیل و خالی شدن آن همه کتبخانەی یک دودمان که ابا عن جد (عنجد) از مشاهیر علمای زمان و عصر خودشان بوداند حقیقتا باعث هم ناحاج (سید میرزا؟) بایزید خالوی ام بوده خدایش جزا دهاد.

عجالتة ازین مقوله چندان با جناب ایشان صحبت ننموده و موقتا بچیزی تشبث نشده تا در آتیه بنام خدا تعالی در پس پردەی غیبت چه تقدیری فرموده و لایحەی آینده ما را کارگزاران قضا و قدر به چه (بچه) منوال صحه گذاشتەاند امیدوار است که انشاءالله عن (عما) قریب حجاب فرقت و غربت از میان بکلی برچیده و باجناب ایشان حسب المرام در نقطەی آمال این چند روز عمر را بدعاگوی وجود مبارک صرف نموده بدون نگرانی و خیالی بگذرانیم بدیهی است که همه وقت خاطر مبارک از وضعیت چاکر و جناب صاحبی ام بی اطلاع نبوده و مسحضر خواهم بود و هیچوقت در ادای شرایط چاکری کوتاهی نمیشود.

---

٣- ئەم وشەیە نەخوێنرایەوە.

علاوه لازم است از مختصری از وضع عوالم ترقی و مدنیت اسلامی مسبوق گشته و بنظر دقت بوضع حاضره ملاحظه فرمایند که همین ولایت ما (واکرده؟) چشم بسته (نی تربیت؟ بی ترتیب؟) بیچاره ما در قعر چاه جهالت مانده در تیه ضلالت سرگردان میباشند چون کتبا عرض آن ممکن نبود لهذا این است سه جریده غزته یعنی روزنامه تقدیم داشت. هرچند ترکی اینجا بانجا تفاوتی دارد لیکن للهالحمد در نظر فطانت استعداد و ذکاوت فطری حضرت اجل اهمیتی ندارد.

بعداز اینکه خاطر مبارک کاملا مسبوق بدیهی است که در فکر تهیهی جناب آقازاده محترم (آقا کوچولو) بوده که بلکه انشاءالله در میان کرمانجها ضایع نشده و لامحاله در تبریز تحصیلی بنماید و مثل ماها چشم بسته واقع نشود خداوند للهالحمد چنین سایهی مثل وجود مبارک برای ترفیع احوال ایشان که خداوند پایدارش فرماید عطا فرموده چرا باید از رفتن بتحصیل و آدم شدن نکول نماید حالا که نمیرود در آخر یعنی همین اثنای یکی دو سال معلومش خواهد شد که باید سنگ بزانو بزند حضرت اجل عالی چرا باید گوش بحرف او بدهد بهر قسمی باشد زودتر اورا روانه فرمایند اصلحتراست حقیقتا فضولی نمودم عفو میطلبم باقتضای دولتخواهی جسارت نمودم صلاحی مملکت خسروان دانند.

در باب خانهی چاکر هرچند لازم نیست در آن باب چیزی عرض نماید لیکن خود حضرت اجل مسبوقند که حین عزیمت بملاحظهی اینکه خانه و همشیرهام گریه نکند و نگران نباشند تا یک درجه از سفر اسلامبول آنها را اطمینان داده و فقط در نزد آنها ساوجبلاغ را ابراز داده و عزیمت چاکر بسلام فقط ذات الحضرت اجل عالی مسبوق بودهاند ازآنجا کهمیدانم بعداز اطلاع از عزیمت چاکر همشیره و خانه از طرف چاکر نگران همشیره و خانه از طرف چاکر نگران شدهاند اجل علی الخصوص همشیرهام که میدانم حالش چه طور است در این صورت از آوائی حضرت مستطاب اجل عالی استدعا مینمایم که یکنفر از طرف ذیرآف نزد آنها رفته و استمالت که اقتضای حالت

طایفه‌ی نسوان است داده و سلامتی چاکر و جناب مستطاب اخوی را بانها رسانیده را اطمنانشان بدهد و چنین تصور نمایند مثل چهار سال قبل چهارده ماه در ساوجبلاغ مشغول خدمتگذاری حضرت اجل عالی بودم و از طرف چاکر نگران نباشند لله‌الحمد چاکر که سلامة بشرف ملاقات جناب مستطاب اخوی ام نایل آمده من بعد انشاءالله تکدری نخواهم داشت

در باب مصارف خانه اگر چه از مرحمت شامله بی خرجی نبوده و نخواهند بود لیکن بنده زاده محمدامین که در نزد همشیره‌ام میباشد محض اینکه در لباس و قند و چایی و غیره کسری نداشته باشند بجناب آقازاده معظم آقای محمد کریم خان قدغن فرموده از پولی که در خدمتشان میباشد عجالة سه چهار تمانی بهمشیره‌ام تسلیم فرموده و خود بندگان اجل اکرم باید قبض رسید آنرا مرحمت و روانه فرمایند و علاوه بسلطان کدخدا ابراهیم نیز قدغن فرمایند که شبها خودش در آنجا بخوابد در هیچ ممر لازم نیست چنیری عرض نمایم.

و خانه‌ی چاکر از پارسال مختصر ناخوشی داشتند که ضعیف و بی قوت واقع شده و خود بندگان حضرت اجل چند دفعه (دژه‌تاڵ) و غیره بایشان مرحمت میفرموده‌ند حالت عزیمت چاکر از ضعف خود تشکی داشت چاکر هردم که حضور آمده تفصیل را عرض نموده دوای که تجویز میفرمایند بخورد نمیدانم آمده یا خیر مستدعی است بتوسط کاکه مه‌م دوای که مستشفی است باو مرحمت فرمایند.

هرچند قابلیتی ندارد لیکن محض خالی نبودن عرضه چهارده (١٤) دانه کارت پوستال در لف پاکتی تقدیم حضور مبارک داشت چون عجالتاو در نرسیدن آنها نگران بودم زیادتر تقدیم نشد زیرا از قراری تقریرات جناب مستطاب ملا عبدالله افندی بدفعات متعدد رسمهای بزرگ و کارتهای خوب و اعلا برای آقائی دست میدارد بعنوان سوقات با پست روانه فرموده و حال آنکه هیچ یک از آنها نرسیده در اینصورت چاکر باینملاحظه از تقدیم داشتنی این قبیل چیزها عجالتا خود داری نموده‌ام تا ببینم آنها میرسند یا

خیر حقیقتا چاکر خیلی افسوس میخورم که آنها نرسیده‌اند و در میانه رفته‌اند.

و یکی از کارتها را که باسم جناب آقازاده‌ی محترم (آقا کوچولو) تقدیم نموده‌ام مرحمت فرموده باو عطا فرمایند که موجب امتنان و تشکر چاکر خواهد بود.

و علاوه مستدعی است مسئله‌ی قریه (گوکتپه) که تا حال بکجاها رسیده محض رفع نگرانی مرقوم فرماید انشاءالله تاکنون ختم گفتگو شده و در تصوف خودتان میباشد در خدمت جناب اقای شمسه اگر آنجا است عرض بندگی و ادای ادب دارم انشاءالله مسئله‌ی (کانی مملی) را نیز مطرح و مذاکره فرموده‌اند.

بهمین عنوان مرقوم از ساوجبلاغ با میاندوآب روانه فرماید انشاءالله خدمت ایشان رسیده و ایشان نیز بچاکر میرسانند و چاکر نیز که‌عریضه عریضه مینویسم آدمها که از ساوجبلاغ میایند هم خدمت قاضی لطیف هم حاجی صالح بروند عریضه گرفته حضور مبارک برسانند. چاکر محمد صالح.

# دەقی وەڵامنامەی عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب

# بۆ

# میرزا محەمەدساڵح

**١٨- جمادی الثانی ١٣٣٢ ه.ق[١]**

**مقرب الحضره اعزی میرزا محمد صالح زید عزه**

اولا شکر میکنیم بنعمه بی مثال خوداوند متعال که مرا ملهم و موفق باجازه آن سفر خیریه شما نمود چنانکه بصرافت طبع و طیب نفس شما را رخصت عزیمت به دارالسعاده اسلامبول داده که ضمنا هم بشرف ملاقات جناب محامد نساب حاجی ملا عبدالله افندی اخوی سلم الله که سالهاست در آرزوی دیدار شما در سوز و گداز است شاد و خرم گشته هم بقدر وقت و فرصت از سیاحت روح افزای مداین ثلثه (آستانه) یا بعبارت دیگر (قسطنطنیه) که متشکل است:اسلامبول و (بگ اوغلی) و (اسکودار) است محظوظ و مسرور شده باشید.

و از آنجا که سفر اسلامبول از جمله سیاحتهای قمارەی دیده گشای بهجت افزای کره ارض بشمار میآید البته شما هم قدر این (......)[٢] را جمیل

---

١- ئەم مێژووە بە (زایین) دەبێتە: ١٩١٤/٥/١٤ز

٢- ئەم وشەیە نەخوێنرایەوە.

شمرده انزوا و نشستن منزل را بر سیاحت فرح بخش غمزدای بعضی نقاط ترجیح ندهید.

از جمله از سیاحت مکرره‌ی (بوغاز) نگذرید و بتماشای روز عبور از (بسفور)، یعنی همان دریاچه‌ی گردن مانند که (بحر سیاه را) با بحر (دردانیل) یا (بحر مرمره)، یا (بحر سفید را) بهم وصل نموده و خط فاصل در بین مداین ثلثه‌ای (آستانه) و همچنین حد مائی در بین قسمتین (آسیا) و (اوروپا) است اکتفا ننموده زیرا که روز ورود مسافر بجائی خاص اینچنین سواد اعظم هر قدر دقیق و فهیم باشد باز بشخص میماند که چشمهای اورا بسته باشند.

پس بر شما که فی الجمله صاحب قلم و خط و ربط هستید واجب و حتمی است که اگر هر روزه را بر سپهر ستار فرصت نکرده یا راغب بگردش نبوده باشید اولادر دو، یا سه روز یک مرتبه بجهازچه‌های کوچک که مخصوص سیاحت است دو ساعتی یا: دو نیم بغروب مانده در خدمت جناب حاجی ملا عبدالله افندی، یا یکی دو نفر دیگر صاحب بصیرت و اطلاع که طرف وثوق و محل اعتماد جناب حاج معزی الیه بوده و در مدت توقف چندین ساله‌ی خود در اسلامبول ایشان را بامانت و دیانت ممتحن و آزموده باشد بگردش و تفرج بروید و با چشم بینا بآن همه قصور رفیعه سر به فلک کشیده رنگارنگ مشجر باشجار و بساتین مستطر از ازهار و مغاریس مجوهر باثمار و طریق بیشمار واقع در امتداد ساحل و شاطی را ببینید و حظ ببرید و ظمنا خالق پروردگار را شکرها گذارده و بگوئید ای آفریننده‌ی که ترا کسی ندیده ما اکراد و اهل این بلاد را حکمت صانعه تو آفریده بما بیچارگان چه مقام سزاوار دیده و باینها نیز که مخلوق تواند چه نزهتگاهها بخشیده بما چه خلقی روا، به اینها چه خلیقی عطا فرموده، بما چه ذلت و عشرتی داده، باینها چه معیشت با عزتی نهاده، ما را چه سان بزحمت تلاش

انداخته و اینها را تا چه درجه (....)[3] معاش پرداخته و همچنین مارا در چه سببیت و اینها را با چه مدنیت آفریده‌اید. بما چه قباحت اطوار، به اینها چه سماحت آثار بما چه حقارت، به اینها چه امارت، بما چه عناد فطری، به اینها چه وداد طبعی، بما چه نفاق نزومی، باینها چه اتفاق عمومی عطیه فرموده‌اید الحکم لله واحد القهار.

و دانسته باشید که اینهمه حسرت برای ثروت و مکنت ظاهری نیست، زیرا که ثروت و مکنت فقط در هرجای عالم بفراخور موجوده است بلکه اینهمه حسرت و افسوس که شبانه روز در کانون قلب میجوش تباین و تفاوت عوالم ترقی و تمدن ملل مختلفه نسبت باین یک مشت (کرد) در پشت درمانده‌ی محروم از هر گونه صنایع و بدایع جدیده و لذایذ علم و هنر است که البته در این قلیل مدت توقف بر خود شما هم واضح و مبرهن گشته کم و بیشی عوالم اینجا را بانجا میزان کرده‌اید،

هرچند خود شما از وضع ولایت کاملا مسبوقید ولی بمصداق الکلام یجرالکلام حین تحریر چنین بخاطرم رسید که یک شق زندگی ملت (کرد) را بشما یادآوری نمایم. مثلا اگر در ولایت ما عیال یکی از متمولین باستثناء (معدودی از ملاک و صاحبان املاک و ثروت بیحد) بمطب طبیبی بعداز یک سال گرفتاری بمرض، یا برسم مهمانی بجائی که تقریبا پنج و شش فرسخی مسافت داشته عزیمت نماید. پس ضعیفه مسافره پا برهنه علاوه بر اینکه پیاده‌روی این یک منزل راه را باکمال میل و رغبت بر خود هموار و ملایم شمرده بر حسب آداب دانی که اقلا مختصر سوقاتی برای اقوام واحبا برده باشد با حالت کلفت حمل هم

---

٣- ئەم وشەیەمان بۆ ساغ نەکرایەوە.

# وێنەی نامەی میرزا محەمەدساڵح

بۆ :

عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب

# وێنەی وەڵامنامەی

# عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب

**بۆ: میرزا محەمەد ساڵح**

یس
و تفرج برده‌اید و با چشم بینا باین‌همه قصور رفیعه سر بفلک کشیده رنگارنگ شبیه باشجار و بساتین مسطر از ازهار و منقّش

مجوهر بانهار و حدائق پر ثمار واقعه در امتداد سواحل و شاطی را به بینید و حظ ببرید و ضمناً خالق پروردگار را شکر

گذارده و بگوئید ای آفریننده که ترا کسی ندیده ما کرام و اهالی این بلاد را حکمت صانعه‌ات آفریده با چه کارهای چه

مقامی سزاوار دیده و با اینها نیز که مخلوق تواند چه نعمت کامها بخشیده با چه خلقی روا با اینها چه خلقی عطا فرموده با چه

ذلت و حقارتی داده با اینها چه معیشت با عزتی نهاده ما را چه سان بزحمت تلاش انداخته و اینها را با چه درجه سعهٔ

معاش پرداخته و همچنین ما را در چه پستیت و اینها را با چه مدنیت آفریده‌ای با چه قباحت اطوار با اینها چه

چه سماحت آثار با چه حقارت با اینها چه امارت با چه فقر و فقری با اینها چه وداد طبیعی با چه نفاق لزومی با اینها

چه اتفاق عمومی عطیه فرموده‌ای الحکم لله الواحد القهار.

دانسته باشید که اینهمه حسرت برای ثروت و بخت ظاهری نیست زیرا که ثروت و بخت فقط در هر جای عالم از جمله

موجودات بلکه اینهمه حسرت و افسوس که شبانه روز در کانون قلب هیچ پوشیده بجای تباین و تفاوت همه عالم بر ترقی دلان

ملل مختلفه نسبت باین نکبت (کرد) در پشت در مانده محروم از هر گونه صنایع و بدایع جدیده و فوائد علم و تجارت

که البته درین قلیل مدت توقف بخود شما واضح و مبرهن گشته و کم و بیشی همه عالم اخبار را با آنجا میزان کرده‌اید.

هر چند خود شما از وضع ولایت کاملاً مستبصرید ولی بمصداق الکلام یجر الکلام حین تحریر چنین بنظرم

رسید که یک شق زندگی ملت کردره شما یادآوری نمایم مثلاً اگر در ولایت ما عیال یکی از متمولین با استثنای

(معدودی از بیک و صاحبان املاک و ثروت بنجد) بمطب طبیبی بعد از یکسال گرفتاری بمرض یا به سم مهلکی

بسبب آنکه تقریباً پنج و شش فرسخی مسافت داشته عزیمت نماید پس ضعیفه مسافره پا برهنه علاوه بر آنکه

پیاده روی اغلب منزل راه را با کمال بیماری و زحمت بخود هموار ملایم شمرده برحسب آداب دانی که آقاش محترم

سوقاتی برای اکرام واجب برده باشد با حالت کلفت ...

## دیتنەوەی (١٧) غەزەلی تازەی

## (ئەدەب ـ میسباح دیوان)

ئەم چەپکە شیعرە تازە دۆزراوەیەی (ئەدەب)م لەسەرەتای مانگی حوزەیرانی (٢٠١٠)، لە رێگەی بنکەی هەمیشە پڕ بەخشین و خۆشەویستی (بنکەی ژین ـ سلێمانی)یەوە دەست کەوت، کە نووسەری دڵسۆز: د. ئەفراسیاب هەورامی، ماوەیەك بەر لەمەرگی کتوپڕ و چاوەنوارِنەکراوی، بۆ بنکەی ناوبراوی ناردبوو.

ئەم چەپکە شیعرە، (ئەدەب) خۆی و بە دەستنووسی خۆی و بەزەخرەفەیەکی رەنگاورەنگی زۆرجوان و هونەریی رازاندۆتەوە، کە بریتییە لە ژمارەی (١٧)هەڤدە غەزەلی خۆی بۆ کونسوڵی رووسیا لە سابڵاغ (مەهاباد) ناردووە لە کۆتایی غەزەلەکاندا ، بۆنەو مێژووی نووسین و ناردنی ئەم غەزەلانەی بەمجۆرە نووسیوە :

**(در شب سە شنبە دویم شهر ذیحجە الحرام مطابق سیچقان[1] ئیل[2] سنەو یکهزار و سی هجری قمری تسوید این اوراق کە عبارت از هفدە غزل اشعار کردی و و گفتەء این بندە عبداللە مکری متخلص ب (ادب) است باتمام رسیدە و تقدیم حضور مبارك جناب جلالتماب کاپتان دوپلاس کونسول مقیم ساوجبلاغ مکری گردید انشاءاللە مطبوع طبع اجل عالی خواهد شد. فی تاریخ فوق).**

واتە : (لەشەوی سێ شەممە: دووەمی مانگی زیحجەی حەرام، رێکەوتی ساڵی مشك: هەزارو سێ سەدو سی — ١٣٣٠ هیجری قەمەری — کە بە مێژووی زایین دەکاتە : ١٩١٢/١١/١٢ -، لە نووسینەوەی ئەم رووپەڕانە بوومەوە ، کە بریتین

---

١- سیچقان: واژەیەکی تورکی یە، بەمانای (مشك)

٢- ئیل: واژەیەکی تورکی یە، بەمانای (ساڵ) و هەردوو وشەکەش پێکەوە بە مانای (ساڵی مشك.)

له هه‌ڤده (١٧)غه‌زه‌لی شیعری كوردی و له‌لایه‌ن ئه‌م به‌نده‌یه‌وه: عه‌بدوڵڵای موكری و ناسراو به : ئه‌ده‌ب — بیژراون، پیشكه‌ش به حوزوری موباره‌كی جه‌نابی جه‌لاله‌تمه‌ئاب كاپتان دوپلاس، كونسوڵی نیشته‌جیی[٣] ساوجبلاغی موكری كراون. پشت به خوا، لای ئه‌و پله بالایه‌وه جیی په‌سند ده‌بی. له میژووی سه‌رووتر ئاماژه‌پیكراودا)[٤].

ئه‌م چه‌پكه غه‌زه‌له‌ی (ئه‌ده‌ب)، له‌كاتی سه‌رله‌نوێ چاپكردنه‌وه‌ی دیوانی (ئه‌ده‌ب)دا، به‌راوردیان له‌گه‌ڵ نوسخه چاپكراوه‌كانی دیوانی (ئه‌ده‌ب)دا پیدكرێ و لیكۆڵینه‌وه‌و په‌راوێزی پیویستیان بۆ ده‌نووسرێ.

---

٣- ئه‌گه‌رچی (ئه‌ده‌ب) ئه‌وه‌ی لیره‌دا ئاماژه پینه‌كردووه، كه كاپتان دۆبلاس — كه له سابلاخ نیشته‌جێ یه — كونسوڵی كامه ولاته ! به‌لام به‌وه‌دا كه ئه‌م چه‌پكی (١٧) هه‌ڤده غه‌زه‌له، د. ئه‌فراسیاب هه‌ورامی له ئه‌رشیفی رووسیاوه، بۆ (بنكه‌ی ژین)ی ناردووه، بۆیه ده‌بێ كاپتان دۆبلاس، له ساڵی (١٩١٢ز)دا، كۆنسوڵی نیشته‌جیی (رووسیا) بووبێ له سابلاخ.

٤ - له‌ناو ئه‌و (١٧)هه‌ڤده غه‌زه‌له‌دا، شیعریان تیدایه، كه له هیچ یه‌كیك له دیوانه پیشتر چاپكراوه‌كانی (ئه‌ده‌ب) و له هیچ ده‌ستنووسیككی تری (ئه‌ده‌ب) و تایبه‌ت به (ئه‌ده‌ب)دا به‌رچاو نه‌كه‌وتوون. جگه‌له‌وه‌ی به‌وهۆیه‌وه كه ئه‌م (١٧)هه‌ڤده غه‌زه‌له، به خه‌تی خودی (ئه‌ده‌ب) و وه‌ك هه‌ڵبژارده‌ی خۆی، له‌ناو تیكڕای شیعرو غه‌زه‌له‌كانی تریدا، نووسیونی و به‌دیاری ناردوونی، ئیمه‌ش هه‌ر ئه‌م ده‌ستنووسه‌ی (ئه‌ده‌ب)مان كرده بنه‌مای پیداچوونه‌وه‌و راستكردنه‌وه‌ی ئه‌و غه‌زه‌لانه‌ی تری (ئه‌ده‌ب)، كه هاوكات له‌م چه‌پكه ده‌ستنووس و له‌م لاپه‌ڕانه‌ی ئیستای به‌رده‌ستتاندان.

ئەی حەددی کبریات، وەرای فەهمی ماسیوا
وەی حەصری ئیعتیلات لە وەهمی مە، ماوەرا
چبکەم! ئەگەر نەکەم سەری نامە، بەنامی تۆ
چ بڵێم! ئەگەر نەڵێم سەری دەفتەر: هُوَ العُلا
ئەووەڵ ئەتۆی و ئاخر ئەتۆی، هەرچی هەی، ئەتۆی
نەت ئیبتیدا لە ئەووەڵ و نەت ئاخر، ئینتیها
خەللاقی ئینس و جانی یو ڕەززاقی دام و دەد
سەتتاری عەیب پۆش وخەتا بەخشی(ذُو العَطا)
تۆی سانیعی بەدیع، لە یەك قەترە ئاوی خام
چەندین هەزار چیهرە، دەکەی: یەك لە یەك جودا
تۆی موبدیعی موحیتی سەماواتی سەرنگوون
تا کەشتی یی کەواکیبی تێدا بکەن شەنا
سەتح و فەزا، ئەگەر بەنەزەر پڕ مەئاثیرن
(لا شَيَء غَير ذاتك في السَّطح والفَضا)
گەر دوو جیهان بەضدی قەزا، مەشوەرەت بکەن
ئانێ بە غەیری حوکمی قەدەر، ناگەڕێ قەزا
گەر نۆ سیپهر و حەفت زەمین ببنە یەك زبان
یەك زەڕە، کەی سەنایی سیفاتت دەکەن ئەدا!

**خوانێکە نیعمەتت، بەسەراپایی دوو جیهان**
**لەو خوانە، هەرکەسێ بەقەدەر قیسمەتی دەبا**
**تۆی خالیقی غەفوور و ئەمە عەبدی پڕ قسوور**
**تۆی واهیبی عەتا وو ئەمە: ساحێبی  خەتا**
**گەر تۆ، گوناهی ئێمە نەبەخشی، بەمەغفەرەت**
**کێی دی هەیە بچینە پەناهی بەئیلتیجا؟**
**غەیرەز ئەوەی موقیڕڕە، بەحەققییەتت (ئەدەب)**
**کوا تاعەتێ کە بیبێ بەڕۆژی جەزا، سزا!**
**خۆت دەستگیری گومڕەهـ و عاسیی، بەڕەحمی خۆت**
**هەر خۆت مەگەر ئەمە، لە مەعاصی بخەیتە: لا**

ئەگەر تووبایە وەك تۆ، جەننەت ئارا
لە سایەی قامەتی تۆیە، نیگارا
چە سیحرێکە! بەدوو زولفی چەلیپات
کە مەقبوولّی، بەئیسلام و نەصارا
لە دلّدا: ئاتەشێکی عالەم ئەفرۆز
لە دیدە: گولّشەنێکی عالەم ئارا
هەتا دوورم، دەلّێم دەتگرمە باوەش
کە دێمە ڕووبەڕووی تۆ، نیمە: یارا
نەهانیی بوو لە دلّدا سوزی عیشقت
لە دوودی سەرمەوە بوو ئاشکارا
بەدیدارت، ئەگەر تارێ لە زولفت
بەمولّکی (کەی) بدەم، یا تەختی (دارا)
بەخوێنی من، ئەگەر سەرخۆش دەبی تۆ
وەکوو جامی صەبوحت بێ گەوارا
لە جەوری تۆ، دلّم نەشکاوە، قەت من
عەجەب لەو شیشەیەی نەشکا، بەخارا
دەلّێم: جانا، مودارایەك، دەفەرموی !
دەگەلّ عاشق، ئەگەر بووبێ مودارا
(ئەدەب)، بەو غایەتی تۆ پای بەندی
بە فریادت بگا شاهیبوخارا

ئەبرۆیی کەشیدەت لە پەنا طورڕەیی سەودا
ماهێکی نەوە، گۆشەیی کێشاوە لە شەودا
فەرمووتە: دەبێ گیان بەفیدای تیغی برۆکەم
ئەی ماهی دوو هەفتە، بەمنت موژدەیی نەودا
خاڵ و خەتی رەنگینی بەر ئەو گەردەن و سینەت
شایستەیە سەد تەعنە، لە خاڵ و خەتی کەو دا
ئەمشەو، کە گوتم: دەردی دڵم، چی هەیە دەیلێم
حەیفێ، کە دەمی وەسڵەتی تۆ، کورتە لە شەودا
نەمزانی چییە سیڕڕی دەهانی وەکوو نوقتەت
خۆی نوقتەیی مەوهووم و جیهان قەیدییە لەودا
هەمدەرس کەنین: بەختی من و چەشمی سیاهت
بۆچی وەکوو یەك ڕۆژ و شەون، هەردوو دەخەودا!
سۆفی، کە دوێ مەنعی ئەمەی کرد و مەلامەت
ئەمڕۆ لە خەراباتە، عەمامەی لە گرەودا
هەرچەندە مەتاعی سوخەن، ئەم عەهدە کەسادە
ئەمما گوهەری شیعری (ئەدەب) هەر لە برەودا

قەت بووە دڵبەری مە، جارێ لەمە یاد نەکا؟
بەسەلامێ، بەپەیامێ، دڵی مە شاد نەکا؟
ئەی خودا عەشقی .... بەچە دڵ خۆزگە بەوەی[5]
کەس خەرابەی دڵی خۆی قەت بووە ئاباد نەکا ؟
ڕەهڕەوی بادیەیی عیشق، بەپێی شەوق ئەوەیە
فیکرەتی ڕەحمەتی ڕێ و ڕاحیلە و زاد نەکا
عاشق و مەنزل و مەئوا! ئەمە لافێکە درۆ
عاشقی سادق ئەوەیە: خانە لە بونیاد نەکا
وەك دەڵێن مەیلی بەئازادیی بەندانە، گوڵم
گەر منم بەندە، خودایە قەتم ئازاد نەکا
چی دەبێ جارێ ئەگەر ڕێ بخەیە خەستە دڵان
با لە دووری، دڵی هێند ناڵە و فەریاد نەکا
سایەیێ لەو قەد و باڵایە بخە سەحنی چەمەن
تا چ کەس سەیری قەد و جیلوەیی شمشاد نەکا
جەورەکەت خاریجی قانوونە ، دەفەرمووی: مەکە داد
چی بکا جەورکەشت ، جارێ ئەگەر داد نەکا
تا نەسیمێ لەسەری زولفەوە دێ، چاترە سوز
بۆیە سووتاو دەبێ، ڕوو قەت بەتەرەف باد نەکا
هەر کەسێ دیدەیی وەك شەتتی منی دیبێ (ئەدەب)
ڕەنگە قەت سەیری(کۆڕ)و(دیجلەیی بەغداد) نەکا

5 - ئەم نیوە بەیتەم بە تەواوی بۆ ساخ نەکرایەوە.

**گەر مەتڵەعە بۆ ماهی موقەننەع، چەهی نەخشەب**
**ماهی مە، تلووعی لە چەهی غەبغەبە هەر شەب**
**گولزاری جەماله، موتەشەککیل بەدوو سونبول!**
**یا بەدرە درەخشەندە، لە مابەینی دوو عەقرەب؟!**
**ئەی سەروی چەمانی قەمەری نووری ، قەمەر ڕوو**
**وەی خونچە دەهانی شەکەری نوتقی شەکەر لەب**
**تاکەی بەجەفا، ئێمە خەتابار و گونەهکار**
**تاکەی بە ستەم، ئـێمە گرفتار و موعەززەب؟**
**گەر لوتفە، هەتاکەی دەگەڵ ئەغیارە خیتابت !**
**گەر قەهرە، هەتاکەی منی بێچارە موخاتەب**
**سەد حەیفێ کە بۆ دەردی دڵی مە، دەمی وەسڵت**
**فرسەت کەم و شەو کورتە و توولانییە مەتڵەب**
**گەر بادە، فەرحبەخشە، بەیادی لەبی تۆیە**
**نەشئەی چییە، بێ شەهدی لەبت: جامی لەبالەب!؟**
**گەر لۆمەیە، گەر مەنعە، ئەگەر کفرە، گەر ئیسلام**
**گەر تابعی قانوونە، ئەگەر خاریجی مەزهەب**
**تا جان لە بەدەندایە، (ئەدەب) تۆ دەپەرستێ**
**زونناری ملم: زولفی خەمت، قیبلەمە: غەبغەب**

سەروبەندی تەواوکردنی "مێژووی ئەردەڵان"دا ـ بەر ئەم پەرتەوازەبوونە کەوتوون و لەگەڵ کۆمەڵێکی نزیك هەزار کەسیدا ـ بە ناچاریی ڕوویان لە شارەزوور و دواتر لە سلێمانی کردووە و هەر مەستوورەش خۆی، وردەکارییەکانی ئەم ڕووداوانەی ساڵانی دوایی قۆناغی هەرەسهێنانی هەمەلایەنەی ژیانی سیاسی، ڕووناکبیریی، کۆمەڵایەتی هەردوو میرنشینی ئەردەڵان و بابانی، زۆر زیرەکانە و ئاگادارانە، بۆ مێژووی ئەردەڵان و بابان تۆمار کردووە و وەك ڕاستگۆترین شایەتحاڵێکی ئاگادار و هوشیاری ڕۆژگاری خۆی، دوا لاپەڕەکانی "مێژووی ئەردەڵان"ەکەی، بە دەم ئەم دوا کۆچە پڕ لە کارەساتەوە تۆمار کردووە[٣٦].

گێڕانەوەکانی مەستوورە لە "مێژووی ئەردەڵان"دا، هەروەك سەدان جار لەو گێڕانەوە و یادداشتکردنانە بە نرختڕن کە لە بەڵگەنامەکانی قاجاری و عوسمانیدا هاتوون، لە هەمان کاتیشدا چارەنووسی میرنشینەکەی خۆیشیان: (ئەردەڵان) هەروەك ئەو جۆرە کەوتەوە، کە پێشتر هەر مەستوورە خۆی پێشبینی بۆ دەکرد و لە مێژووەکەی خۆیدات نووسیبووی:

"شا، واتە: محەمەد شای قاجار، هاتە سەر ئەو باوەڕی، کە بناغەی ئەم بنەماڵەیە تێکدا و داری بەسەر بەردەوە نەهێڵێ"[٣٧*].

---

٣٦ - بۆ زیاتر زانیاریی لەبارەی وردەکارییەکانی ئەم ڕووداوانە، بنواڕە:

ـ میرنشینی ئەردەڵان، بابان، سۆران لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، محەمەد حەمەباقی.

ـ مەستوورە، میرنشینی ئەردەڵان.

٣٧ - مەستوورە، میرنشینی ئەردەڵان، ل٢٣١.

* گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردستان، ژمارە (٦)

# نالی

# و

# مەستوورە

مەستوورە (**١٨٠٥ز ـــ ١٨٤٧ز**)، کە ناز ناوی ماهشەرەفخانم، کچی ئەبولحەسەن (**محەمەد بەگ**)ە و ئەگەرچی دیوانێکی شیعریی بە زمانی فارسی و چەند کتێبێکی مێژوویی، لەربارەی مێژووی ئەردەلان و شەریعەتی ئیسلام لە دوا بەجێماوە[٢٩]؛ کەچی تا ئێستاش لای زۆربەی کوردناسانی خۆرهەلات و خۆرئاوا و مێژوونووسان و نووسەرانی کوردش، زۆرتر هەروەك شاعیر باسدەکرێ. لە کاتێکادا شانازیی مێژووی فەرهەنگی کوردی، لەوەدایە کە نزیکەی (**١٨٠**) ساڵ لەمەوبەر، لە سەرتاسەری خۆرهەلاتی ناوەڕاستادا، تاقانە ئافرەتێکە، مێژووی نووسیبێ.

هەرچەندە لە پاڵ دیوانە شیعرە فارسییەکەیدا، بڕە شعرێکی عروزئامێزی بە زمانی (کوردی)ش، بە ناوی مەستوورە ـــ وە، بلاوبۆتەوە. وەك نموونەی ئەمجۆرە شیعرانەی، کە ئەمە سەرەتایەکەتی:

٢٩ لە وتاری دواتردا ناوی بەرهەمەکانی مەستورە دەنووسین.

**گرفتارم، بە نازی چاوەکانی مەستی فەتتانت**
**بریندارم، بە تیری سینە سووزی نێشی موژگانت**[30]

لە کاتێکدا ئەم شیعرە، غەزەلێکی (**٧**) بەیتی شاعیری ناسراو:ئەمین ئاغای حەوێزی، واتا:ئەختەر (**١٨٣٩ ـــ ١٨٨٨ز**)ە[31]، بۆیە من دڵنیام ئەو شیعرە کوردییە عروز ئامێزانەی تریش کە تا ئێستا بە پاڵ مەستوورە دراون، شیعری مەستوورە نین؛ چونکە لە لایەکەوە ئەمجۆرە شیعرانە، جگەلەوەی (پیاو) وتوونی، لەلایەکی تریشەوە مەستوورە خۆی، لە مێژووەکەی خۆیدا، کە لە ئاخر و ئۆخری ژیانیشیدا نووسیویەتی، کەم و زۆر باسی ئەوە ناکات کە شیعری کوردی نووسیبێ، لە هەمان کاتیشدا، کە باس دێتە سەر مەستوورە و ئەدەبی کوردی، لە سەردەمی مەستوورە و لە ئەدەبی باوی ئەو سەردەمەی میرنشینی ئەردەڵان؛ دەبێ ئەوەمان لە یادبێ کە ئەو ئەدەبەی لەو رۆژگارەدا بە زمانی کوردی، لە جوگرافیای میرنشینی ئەردەڵان دا سەقامگیر بووە، ئەدەبی دیالیکتی گۆران بووە، کە بە کێشی خۆماڵیی، واتە: کە بە وەزنی هیجا (بڕگەیی) بووە، لەبەرئەوەی ئەم دیالیکتەی گۆران، زۆر لە پێش دروستبوونی شاری (سنە)شدا، زمانی (ئایین)یش بووە. چونکە ئەگەر کوردناسانی وەکو: (ئەلیکسەندەر ژابا، مارتن، هارتمان،

---

سەرنج:

ئەگەر هەندێ فاکت و پەرەگرافی ئەم وتارە و وتاری پێشوو لە یەکتر بچن، پێویستی وتارەکان وا بووە.

٣٠ مێژووی ئەردەڵان ـــ نووسینی: مەستوورەی کوردستانی ـــ گۆڕینی بۆ کوردی: دکتۆر حەسەن جاف و شکور مستەفا ـــ چاپی یەکەم ـــ بەغدا ـــ دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی کوردی لاپەڕە (٧) ـــ هەروەها: تأریخ مشاهیر کورد ـــ جلدی یەکەم ـــ تالیف بابە مردۆخ رۆحانی ـــ چاپ أول (١٣٦٤) ـــ انتشارات سروش ـــ ص (٣٦٧ ـــ ٣٧٢).

٣- بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە بنواڕە:ئەختەر، شاعیری جوانیی و دڵداری، ئامادەکردنی ئازاد عەبدولواحید، هەولێر، چاپخانەی شارەوانی ١٩٧٦، لاپەڕە ١٦ ـــ ٢٣، ل.٥١

ڕۆژەلیسکۆ، لیرخ، فیلچیڤیسکی، ڕۆدینکۆ و ... هتد)، ئەوە بسەلمێنن کە ئەدەبی کوردی، لە سەرەتای دەست پێکردنیەوە، بە دیالیکتی باکوور دەستی پێکردبێ و بە تایبەتیش لە عەلی حەریری (سەدەی یانزەیەمی زایین)، ئەوا لەم دیالیکتەدا، (لە سەدەی دەیەمی زایین) و ڕەنگە پێشتریش، کتێبی (ماریفەت و پیرشالیاری زەرتوشتی)[32] پێ نووسراوە، کە لە بارەی ئایینی (زەرتوشت)ەوەیە و دوای ئەمیش کتێبی ئایینی (سەرئەنجام)ی پێ نووسراوە، کە لەناو خەڵکدا، بە سروودی (یارسان)ناسراوە و کتێبی ئایینی (ئەهلی هەق)ە[33]. لە پاڵ ئەمانیشدا وەك لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی چاپی ئینگلیزییەکەیدا هاتووە، (باباتاهیری هەمەدانی)ش، شیعری بە دیالیکتی گۆران، بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئەهلی هەق، لە ناو گۆرانە نەخوێندەوارەکاندا نووسیوە[34]. جگە لەو (**٣٩**) شاعیرەی کە ئی. بی. سۆن، لەو وتارەیدا سەبارەت بە شیعری گۆران، لەسەری نووسیون و نموونەی لە (**٢٧**) شاعیریان هێناوتەوە، کە کاتی خۆی (د. سەعید سنەیی)، ئەم دەستنووسانەی پێشکەش کردون و ئێستا لە مۆزەی بەریتانی پارێزراون و هەمووشیان پێش ساڵی (**١٧٨٨ز**) ژیاون[7].

ئیتر ئەم ئەدەبە، لە تەمەنی ئەم هەزار ساڵ بەخشینەیدا، بێ پشوو، بە تەوژم و تین و درەوشاوەیی هاتووە و بە دەم ڕەگ داکوتانی زیاترە وە هەر لە بە خشیندا

---

٤- دانای هەورامی ـــ پیرشالیاری زەردەشتی ـــ بەغدا (١٩٦٨ز).

٥- سرانجام (ماشەڵڵای سووری) چاپ اول، تاران (١٣٤٤ش) هەروەها:سرانجام(ایین یارسان)، پژوهش ونوشته طیب طاهری، انتشارات انستیتو فرهنگی کرد، سلیمانیه، چاپی اول، چاپخانه اراس، اربیل.٢٠٠٧

٦- لیریکای شاعیری گەورەی کورد (مەولەوی) ئەنوەر قادر محەمەد، ستۆکهۆڵم (١٩٩١) لاپەڕە (٣٢).

**٧**- مینۆرسکی (گۆران) وەرگێڕانی ناجی عەباس (گۆڤاری گەلاوێژ)، ژمارە (٥ ـتا ١٠) بەغدا (١٩٤٤ز).

**سەرنج:** ئەو (٢٧) شاعیرەی کە (ئی. بی. سۆن) لە بارەیانەوە نووسیوێتی، لە بنەڕەتدا لە دووتۆی کەشکۆڵێکدان، کە نموونەی شیعری (٣٩) شاعیری تێدایە، ئەم کەشکۆڵە ساڵی (١٩٩٨ز) لەلایەن کاك ئەنوەری سوڵتانی یەوە، لە بەریتانیا ئامادە و چاپ و بڵاوکرایەوە و دووبارە لە ساڵی (٢٠١٠ز)دا، لەلایەن (بنکەی ژین) لە سلێمانی چاپکراوەتەوە.

بووه، کە کۆمەڵێك شاعیرانی گەورە و ناوداری ئەدەبی کوردی، هەر بەم دیالیکتە شیعریان نووسیوە، وەك: مەلا پەرێشان (سەدەی چوارەیەمی زایین) بێسارانی (**١٦٤١ ـــ ١٧٠٢ز**)، صەیدی هەورامی (**١٧٨٤ ـــ ١٨٣٥ز**)، میرزا شافیعی جامەڕێزی (**١٧٨٥ ـــ ١٨٤٨ز**)، ئەحمەد بەگی کۆماسی (**١٨٣٥ ـــ ١٩٠٧ز**)، مەولەوی تاوەگوزی (**١٨٠٦ ـــ ١٨٨٢ز**)، میرزا قادری پاوەیی (**١٨٣٥ ـــ ١٩٠٧ز**)...هتد، کە ئەم بەردەوامییە، پێچەوانەی ئەدەبی دیالیکتی باکوورە، چونکە ئەگەر لە قۆناغەکانی دەرکەوتنی شاعیرانی وەك: فەقێی تەیران (سەدەی چواردەیەمی زایین) و مەلای جزیری (سەدەی پانزەیەمی زایین) و ئەحمەدی خانی (**١٦٥٠ ـــ ٦٢ز**)دا لە لووتکەدابووبێ؛ ئەوا دوای ئەحمەدی خانی، ئیتر وزەی بەردەوامیی و درەوشاوەیی، وەك تین و تاوی پێشینەی نەما.

بەڵام ئەدەبی دیالیکتی گۆران، جگە لەو تەمەنە درێژەی و بەردەوامییەشی، ژمارەیەکی زۆریش داستان و چیرۆکی دڵداری پێ نووسراوە؛ کە لە چاو داستان و ئەدەبی دیالیکتەکانی تری زمانی (کوردی)دا، یەکجار زۆرن و کەم وێنەن. بۆیە دەڵێین ئەم دیالیکتە، رەگ و ریشەی لە مێژینەیەکی زۆر کۆندا داکوتاوە و هەر ئەمیش بووە، بۆتە یەکێك لەو هۆکارانەی لە تەمەنی زیاتر لە شەش سەدەی میرنشینی ئەردەڵان دا، کردوویەتی بە زمانی رەسمی و ئەدەبیی ئەم میرنشینە و (هەر دەسەڵاتی سیاسی ئەم میرنشینەش، ئەدەبی بە دیالیکتی **گۆران** پێشخست و گەیاندییە لووتکەی داهێنان و گەشەسەندن)[٣٥]، بە رادەیەك کە زەبر و دەسەڵاتی داهێنەرانەی ئەدەبی ئەم دیالیکتە، هەمیشە لە سنووری میرنشینی ئەردەڵانیشی تێپەڕاندووە و وەك (گۆران)ی شاعیر دەڵێ: (لە کاتی شکۆیدا، جار بووە سێ کوچکەی ناوەندی کەرکووك، هەمەدان و کرماشان هەمووی بگرێتەوە)[٣٦].

لە کاتێکدا شێوەزاری ئاخاوتنی دانیشتووانی ناوچەکانی کەرکووك و هەمەدان و کرماشان، هەردووکیان بە جیا، لە دیالیکتی گۆران جیاوازترە. کەچی ئەدەبی

٣٥ محمد أمين زكي ( تأريخ الدول و الأمارات الكردية في العهد الاسلامي ـــ ترجمة: محمد علي عوني (القاهرة) (١٩٤٥) صفحة (٢٧٦).

٣٦ یادی پیرەمێرد ـــ وتاری مامۆستا (گۆران)، بەغدا ساڵی (١٩٤٥)، لاپەڕە (٧٨).

دیالیکتی باکوور، لەوپەڕی درەوشانەوە و دەسەڵاتیشیدا، لە سنووری ناوچەی دیالیکتی خۆی تێنەپەڕاندووە.

ئەم بەراوردەشمان ئەگەر هەر بەرامبەر دیالیکتی کرمانجی باکوور بووبێ، هی ئەوە بووە، کە دیالیکتەکانی تری زمانی کوردی، یان بەرهەمی ئەدەبیان زۆر کەم پێ نووسراوە، یان زۆر درەنگانێ کەوتنە بەخشین و درەوشانەوە؛ وەك ئەدەبی دیالیکتی باشوور (شێوەی سلێمانی)، کە بەرهەمی شیعریی، شاعیرانی سێ کوچکەی بابان: نالی و سالم و کوردی و هاوڕێکانیان؛ واتە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمی زاییەنەوە، کەوتە بەخشین و خۆنواندن..و کەوتە رەواندنەوە و تەنگ پێهەڵچنینی سێبەری جوگرافیای ئەدەبی دیالیکتی گۆران، کە چەندان سەدە بوو، دەنگی دیالیکتی کرمانجی باشووری کپ کردبوو، کە وەك بەڵگە مێژووییەکان و دەقگەلی ئەدەبی دێرینە بۆمان دەسەلمێنن، ئەم دیالیکتەی کرمانجی خواروو لە کاتێکیشدا کە ئەدەبی نووسراوی دیالیکتی گۆران، لەو تەمەنە درێژەشدا سێبەری بەسەرەوە کردبوو، بەڵام ئەدەبێکی دەوڵەمەندی لە فۆلکلۆری بەیت و شیعری سەرزار، بە کێشە خۆماڵییەکان پێ نووسراوە.

بۆیە کە **نالی** و هاوڕێکانیان بۆ یەکمجار ئەم دیالیکتەیان بۆ قوتابخانە عروز ئامێزەکەی خۆیان رام کرد؛ ئیتر ئەم دیالیکتە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا، وەك ئاگرێکی بەتین، بە ئاقاری خۆیدا تەنییەوە و زۆر خێرا بۆ گەرمیان و کوێستان پەڕییەوە. کە لێرەدا پێویست دەکا ئەوە بڵێین: هۆی خێرا تەنینەوە و گەشانەوەی ئەم دیالیکتە بەر لە هەموو شتێك و لە سەروو هەموو شتێکەوە، (وەك چۆن دەسەڵاتی سیاسی میرنشینی ئەردەڵان، ئەدەبی بە دیالیکتی گۆران پێشخست و گەیاندییە لووتکەی داهێنان؛[37] هەر بەو جۆرەش پشتیوانی گەورە و بە هێزی میران و سەرانی میرنشینی بابان بوون، کە دراوسێی نزیك و تێکەڵاوی هەمەلایەنە و راستەوخۆی ئەردەڵانەکان بوون و بۆ چاولێکەریش لە میرنشینی ئەردەڵان، لەوەدا کە وەك وتمان: نزیکەی شەش سەدە، زمانی رەسمیی و ئەدەبییان، شێوەزاری **گۆران** بووە؛ بۆیە میران و سەرانی (بابان)یش، بۆ تەواوکردنی پێویستییەکانی

---

٣٧ لیریکای شاعیری گەورەی کورد (مەولەوی)، لاپەڕە (٣٨).

هاوسەردەمانەی پێتەختی تازەکەیان، کە تازە لە (قەلاچوالان)ەوە، بۆ سلێمانی گواستبوویانەوە (١٧٨٤ز)و لەبەرئەوەش کە ئاخاوتنی جەماوەری میرنشینی **بابان** تێکڕا، بە شێوەزاری کرمانجی خواروو بوو؛ بۆیە پێکهێنانی شێوە زمانێکی هاوسەردەمانەی، بۆ ئەوەی ببێتە زمانی ئەدەبیی و رەسمیی، تایبەت بە میرنشینی **بابان**، بووە پێداویستییەکی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و ئەو بەرنامەیەی کە بۆ پێشخستنی میرنشینەکەیان، لەم پێناوەدا رەنگیان بۆ رشتبوو؛ هەر لە بانگهێشتنی زانایانی ئایینی و ئەدیبانی بە ناوبانگەوە، بۆ نیشتەجێبوون لە سلێمانی تازە پایتەختیاندا، تا خانەقا و قوتابخانە کردنەوە بۆیان، کە ئەم پشتیوانییە، هاندەرێکی بە گوڕ بوو، بۆ سەرخستنی ئەم بەرنامەیە.

هەرچەندە لە پاڵ ئەم پشتیوانییەشدا، قوتابخانە شیعرییەکەی **نالی** و هاورێکانی و بە تایبەتیش **نالی**، کە هاتە مەیدانەوە، بە دەسەڵاتێکی بەهرەمەندانەی شاعیرانەوە، بە شارەزاییەکی بەربڵاوەوە لە رەوانبێژیی عەرەبیدا. بە وردەکاریی و وشە ئاراییەکی پڕ پەرداخ و ئارایشی تازەکراوەوە، بە لێزانیی لە زمانی کوردی و دەسەڵاتی بەسەر شێوەزارەکانی تری رێزمانی کوردی و هونەری موتوربەکردنیاندا، بە ئەندازەیەك کە جێپەنجە و کاری **نالی** لە دیالیکتەی خوارووودا، گەیشتۆتە سنورێك، بە خۆی رەوا ببینێ و بەم دیالیکتە بڵێ:زمانی خۆکرد!.. ئەمانە هەمووی بوونە هۆی ئەوەی لە ماوەیەکی مێژوویی زۆر کورتدا، ببێتە شێوەزمانێکی مەودا بەرین و ئیقلیمگیر و سەرمەشق، بۆ تێکڕای نووسەرانی باشوور، بە جۆرێك کە سەرەڕای ئەوەی ئەم شێوەزمانە، لە چاو شێوەزمانی گۆران دا، زۆریش ساوابوو؛ بەڵام بە پێچەوانەی دیالیکتی (**گۆران**)ەوە، کە بە هەرەس هێنانی میرنشینی ئەردەڵان، زۆر بە خێرایی پووکایەوە، کەچی ئەدەبی دیالیکتی باشوور، دوای هەرەس هێنانی میرنشینی (**بابان**)یش، کە لەگەڵ هەرەس هێنانی ئەردەڵان دا هاوکات بوو، نەك هەر نەلەقی؛ بەڵکو لەتین و تەوژم و هەڵچوونی خۆی نەکەوت و بە سەرانسەری ئەو ناوچانەشدا تەنییەوە، کە پێشتر ئەدەبی دیالیکتی گۆران، دەسەڵاتی مێژینەی بەسەریاندا هەبوو. تەنانەت بە جوگرافیای گۆران نشینەکانیشدا بە رادەیەك تەنییەوە، کە وەك ئێستا دەیبینین، نووسەرانی ناوچەی (هەورامان)یش، هەر بە دیالیکتی باشوور دەنووسن.

بەڵام لە رۆژگاری ژیانی **مەستوورە** دا، هێشتا ئەدەبی دیالیکتی **گۆران**، لە گوڕ و گوژمی خۆیدا بەردەوام بووە و بە تایبەتیش کە ژیانی مەستوورە، هاوسەردەمی پۆلێك لەو شاعیرە گەورانەی ئەم دیالیکتە بووە، کە پێشتر ناومان هێنان و لە ناویشیاندا مەولەوی تاوەگوزی، کە بە دەسەڵاتی شاعیرانەی خۆی، ئەدەبی دیالیکتی (گۆران)ی گەیاندە چڵەپۆپەی داهێنان و زیاتر گەشانەوەی و لە هەمان کاتیشدا کە مەولەوی و مەستوورەش هەردووکیان هاوجوگرافیای ئەو هەرێمەن، کە دەسەڵاتی ئەدەبی دیالیکتی گۆران؛ نەك هەر سێبەری بەسەرەوە کردووە، بەڵکو هەر لەو بنەماڵەیەشدا، کە مەستوورەی تیدا ژیاوە، شاعیری وەك:غولامشاخانی (**١٨٢٢ ـــ ١٨٦٧ز**) زڕ کوڕی مەستوورە، شیعری بە دیالیکتی گۆران نووسیوە و نامەی شیعریی لەگەڵ مەولەوی دا ئاڵوگۆڕ کردووە.

بۆیە بێ سێودوو دەڵێین: ژیانی مەستوورە دەکەوێتە سەردەمێکەوە، کە دوو قوتابخانەی ئەدەبیی تێکڕا جیاواز، بە دوو شێوە دیالیکتی جیاواز، لە دوو ناوچەی هاووسنووردا، کەوتوونەتە ململانێ و بگرە گەرمەی سەرەتای تەنگ پێهەڵچنینێکی ئاشکرا؛ کە دیاردەکانی ململانێ و تەنگ بە یەکتر هەڵچنینەکە، لەسەرومری بنچینە و روخسار و ناوەڕۆکی هەردوو قوتابخانە ئەدەبییەکەدا، بە زەقی و بە تایبەتیش لە شیعرەکانی مەولەوی و نالی دا، رەنگیان داوەتەوە؛ کە هەر یەکەیان نموونەیەکی زۆر باڵای هەردوو قوتابخانە جیاوازەکەن. چونکە ئەگەر بۆ بەڵگەی سەلماندنی ئەم بۆچوونە، لە نامە شیعرییەکانی مەولەوی، کە لە دیوانە چاپکراوەکەیدان، و لەو (**٣٨**) نامەیەی وردبینەوە، کە لە بەرگی دووەمی یادی مەردان دا، چاپکراون، بۆمان دەردەکەوێ کە **مەولەوی** بەم هۆیەوە کە میراتگری ئەدەبێکی تەمەن درێژی تان و پۆ خۆمالییە، بە هیچ جۆرێك دۆستایەتی و نامە گۆڕینەوەی لەگەڵ ئەو شاعیرە کوردانەدا نییە، کە شیعرەکانیان بە کێشی عرووز نووسیوە و **نالی** سەردەستەیانە.

تەنانەت مەولەوی لەگەڵ شاعیرێکی گەورەی سۆفی و نەقشی مەشرەبی وەك:مەحوی (**١٨٣٢ ـــ ١٩٠٦ز**)یشدا، هیچ سەروبەندێکی نییە، لە کاتێکدا کە هەردووکیشیان سەر بە رێبازگەی (نەقشبەندی)ن و خەلیفەی بنەماڵەی شێخ

عوسمانی سیراجوددین (**١٧٨٠ ــــ ١٨٦٦ز**)ی ئەوێڵەن. هۆیەکەش هەر ئەوەیە کە (مەوحوی)ش شاعیرێکی سەر بە قوتابخانە شیعرییەکەی نالی و هاورێکانێتی.

بە هەمان پێودانیش، کە لە سەرتاسەری شیعرەکانی نالی ورد بینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە پلار و توانج و تەشەرێکی زۆر دەگرێتە ئەوانەی بەدرۆ! سەر بە (تصوف)ن. کە وەك دەشزانین زۆرینەی شیعری شاعیرانی دیالیکتی گۆران، بە روالەت! شیعری (تەسەوف و عیرفان)ە. جگە لە چەندان نموونەی تر، لە شیعری هەردوو قوتابخانە ئەدەبییەکە بەرامبەر بە یەکتر؛ وەك ئەو هەموو هەلۆیست و وەرگرتنەوەی مەحوی، بەرامبەر ئەوانەی کە هێرش دەکەنە سەر تەسەوف و عیرفان، یان ئەو لاقرتی و گالتە پێکردنە بێ پەردەیەی سالم (**١٨٠٠ ــــ ١٨٦٦ز**)، بە دیالیکتی گۆران و لەشکری (ئەردەلان)یش، کە ئاخاوتنیان (گۆران)ە؛ وەك نموونەی ئەو قەسیدە درێژەی بە بۆنەی لە ئەستەمولێ هاتنەوەی عەبدوللا پاشای کوری سلێمان پاشا(**١٧٩٠ ــــ ١٨٣٨ز**)ی بابان، بۆ بە دەستەوەگرتنەوەی میرنشینی بابان، لە سلێمانی پایتەختدا، کە ئەمە سەرەتاکەیەتی:

**تیرەوەش دێمە گوزەشت و عەهدی نیسان هاتەوە**
**بلبلی بێ دڵ لە دەوری گوڵ با فیغان هـــاتەوە**

تا دەگاتە:

**کەروفەر با کەم بکا، (والی)[38] بە فەوجی (چێش کەرۆ!)**
**پشت بەندی لەشکری وەندات و جافان هـــاتەوە[39]**

---

٣٨ والی:مەبەست لە (رەزا قولیخان)ی والی ئەردەلانە.

٣٩ د. فوئاد، کەمال شیعری بلاونەکراوەی سالم، گۆڤاری نووسەری کوردستان، ژمارە٢، سالی یەکەم١٩٨١، ل٤١ تا ٥٢.

لە بەسەرکردنەوەی پێشینەی ئەم دوو قوتابخانە ئەدەبییە جیاوازە و ناوهێنانی مەستوورەدا، یەکسەر ئەو قەسیدەیەشمان بیر دەکەوێتەوە، کە نالی (**١٨٠٠ ــــ ١٨٧٣ز**) لەسەر مەستوورە نووسیوێتی. چونکە هەر کە ناوی مەستوورە، یان (نالی)مان دێتە یاد، دەم و دەست ئەو قەسیدەیەشمان دێتەوە یاد.

ئەم قەسیدەیەش لە سەردەمی نووسینەوە تا ئێستا، هەر جێی باس و خواس بووە و هەر زووش شاعیری گەورەی سابلاخ؛ وەفایی (**١٨٤٧ز ــــ ١٩١٦ز**) و دواتریش عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان (**؟ ــــ ١٩١٦ز**)، چاویان لێکردووە و هەریەکەیان شیعرێکی بە پێودانی ئەم قەسیدەیەی نالی نووسیوە؛ کە شیعرەکەی وەفایی، قەسیدە بە ناوبانگەکەی (شیرین تەشی دەڕێسێ) [٤٠] و (میسباح دیوان)یش شیعرێکی درێژی پێنج خشتەکی نووسیوە؛ کە ئەمە سەرەتاکەیەتی:

**دوێ شەو، شەوی شەنبە، کە لە شەمع و مەهو ئەختەر**
**ئاراســـــتە بوو سەحنی ســــــەراپـــــەردەی ئەخزەر** [٤١]

شایانی باسە، شیعرەکەی مسباح دیوان ئەوەندە ویستویەتی شوێن پێی **نالی** هەڵبگرێ و لاسایی بکاتەوە؛ جگەلەوەی هەر بە خەون دەست پێدەکات، دیسان بە هەمان وەزن، ناوی مەستوورەشی ئاخنیوەتە شیعرەکەیەوە:

**گەنجینەی (مەستوورە) بەبێ خازەن و گەنجوور**
**ئایینەی بلوورە، بەبێ ســــــــنعەتی مزدوور** [٤٢]

---

٤٠ دیوانی وەفایی، لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرداخی، چاپی یەکەم، چاپەمەنی کۆڕی زانیاری، بەغدا١٩٧٨، ل١٩٢ تا ١٩٨.

٤١ دیوانی ئەدەب (میسباح دیوان)، کۆکردنەوە، بەراوورد، ساغکردنەوە و فەرهەنگ بۆ نووسینی:محمد حەمە باقی، بڵاوکراوەی دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٥، ل١٠٨

تا ئەو رادەیەی لە هەندێ جێگەی تری ئەم قەسیدەیەدا، وێنەی شیعریی و قافیەکانی هەمان (شیعری مەستوورە)ی نالی بە کاردێنێ:

**وەك تازە هەڵوژێ کە لـــە ناو دوو لقە دابێ**
**وا رێك گوشرابێ، کـــە لە دوو لاوە قوپابێ**
**هێندێکی قوپابێ و کـــــەمێکی قەڵەشابێ**
**قەڵشانێ، نەوا بێ کە بە چاو فەرقی کرابێ**[43]

لەم یەك دوو ساڵەی دواییشدا، کاك رێبوار سیوەیلی، بە بۆچوونی خۆی، لێکۆڵینەوەیەکی لە دوو توێی نامیلکەیەکدا[44]، سەبارەت بە هۆی نووسینی ئەم قەسیدەیەی **نالی** نووسیوە.

ئێمەش، بۆ ئەوەی بتوانین لە نزیکترەوە بڕوانینە ئەم قەسیدەیەی نالی و هۆی نووسینی؛ پێویستیمان بە زیاتر نزیکبوونەوە هەیە، لە مێژووی ژیانی **مەستوورە** و لە نزیکەوە ناسینی سەردەمەکەی.

وەك لەسەرووتریشەوە وتمان سەردەمی ژیانی **مەستوورە**، هاوسەردەمی **مەولەوی** بووە، کە (مەولەوی)ش، هاوسەردەمی نالی بووە، کە بە هەمان شێوە مەستوورەش دەبێتە هاوسەردەمی **نالی**. بەڵام **مەستوورە**، **(٥)** ساڵ لە **نالی** بچووکترە، چونکە نالی ساڵی **(١٨٠٠ز)** لە دایك بووە و مەستوورە، ساڵی **(١٨٠٥ز)** لە دایك بووە و هەر لە شاری سنەشدا، لە باوەشی بنەماڵەیەکی بەرێز و ناودار و دەسەڵاتداردا گۆشکراوە؛ کە **محەمەد** ئاغای باپیری **مەستوورە**، لە

---

٤٢ هەمان سەرچاوە، ل١١٦.

٤٣ هەمان سەرچاوە، ل١١٧.

٤٤ رێبوار سێوەیلی، کتێبی نالی، چاپەمەنی دەزگای موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

سەردەمی دەسەڵاتداریێتی ئەمانوڵڵاخان (**١٧٧٥ ـــ ١٨٢٤**ز)ی گەورەدا،، هەمەکارە و راوێژکاری ئەمانوڵڵاخان و **ناظری** صندوقخانەی میرانی **ئەردەڵان** بووە، کە جار جارەش بە هۆی ناکۆکی و ناتەبایی ریزەکانی ناو میرنشینەکە و بنەماڵەی (ئەردەڵان)ەوە، لە ئاکامی هەراو ئاژاوە کەوتنەوەدا، **محەمەد** ئاغای باپیری (مەستوورە)ش، لەو هەرایانە گلاوە و زۆر جاریش بۆتە دەستەی نەیارانی ئەمانوڵڵاخان و دووبارە ئاشتبوونەوەیان، کە دوای مردنی ئەمانوڵڵاخان و هاتنە سەرکاری (خەسرەوخان)ی کوڕی (**١٨٠٠ز ـــ ١٨٣٤ز**)، ئیتر دەلاقەی ئەو ناکۆکییانە گەورەتر بوون و بنەماڵەی (مەستوورە)ش وەك جاران کەوتوونەتە ناو یەکێك لە بەرەکانی ئەو پشێوییە و بە تایبەتیش بەرەی ململانێ و سەنگەرگرتن لە دەسەڵاتداریێتی خەسرەوخان! کە لە ئاکامدا و بۆ دڵنەوایی کردنی بنەماڵەی (ئەبولحەسەن)ی باوکی مەستوورە و بنبڕکردنی هەولۆیستی دوژمنانەیان و ئاشتکردنەوەی یەکجارییان، لە ساڵی (**١٨٢٨ز**)دا، **مەستوورە** لە تەمەنی (**٢٣**) ساڵیدا بە خەسرەوخان دراوە[٤٥]. بەڵام تەمەنی پێکەوەژیانیان لەگەڵ (خەسرەوخان)ی هاوسەریدا، (کە منداڵیشی لێی نەبووە) هەر شەش ساڵی خایاندووە، چونکە خەسرەوخان لە تەمەنی (**٣٤**) ساڵیدا، بە نەخۆشی (جەرگ) کۆچی دوایی دەکا، کە ئیتر دوای جوانەمەرگبوونی، ناوی دەنێن، خەسرەوخانی ناکام و مەستوورەش هەر لە حەرەمسەرای بەجێماوی **خەسرەوخان** دا، ماوەی (**١٣**) ساڵی تر، بە بێوەژنیی دەمێنێتەوە. تا لە ساڵی (**١٨٤٧ز**)دا، دوای ئەوەی چرای میرنشینەکەیان بەرەو کوژانەوە دەچێ و بنەماڵەی **ئەردەڵان** دەسەڵاتیان لــێ زەوت دەکرێ، ناچار لەگەڵ کۆچێکی بە کۆمەڵی زیاتر لە هەزار کەسیدا، بە رێگەی مەریوان و شارەزووردا روو لە میرنشینی بابان دەکەن، بەڵام هێشتا بە دەم رێگەوە دەبن، کە نەخۆشی رشانەوەیان تێدا بڵاو دەبێتەوە و نەخۆش دەکەوێ و پاش ئەوەی ماوەیەکی کورت لە شاری سلێمانی دەمێنێتەوە؛ ئەمیش وەك

---

٤٥ مەستوورە، مێژوویی ئەردەڵان، سەرچاوەی پێشتر ناوبراو، ل١٩٤ ـــ ٢٠٤، ٢٣٦ ٢٣٢ ـــ ٢٣٨، ٣٣٧. هەروەها:تأريخ مشاهير كرد، جلد يكم، ص٣٦٧ ـــ ٣٧٢.

هاوسەرەکەی جوانەمەرگ دەبێ و لە تەمەنی (**٤٢**) ساڵیدا کۆچی دوایی دەکا و لە گردی (سەیوان)ی شاری سلێمانی دەنێژرێ[٤٦].

*   *   *

قەسیدەکەی نالی دوو بەشە؛ کە بەشی یەکەمیان داخوازی و پرسیاری (مەستوورە)یە و بەشی دووەمیشیان هەڵوێست و وەڵامی (نالی)یە بۆ **مەستوورە**.

لە یەکەمین مەسرەعی سەرەتای قەسیدەکەدا **نالی** وەك (ئەدیب)ێك، نەك شاعیرێك، ناوی مەستوورە دێنێ، کە بەمجۆرە دەست پێ دەکا:

**مەستوورە، کە حەسنا و ئەدیبە، بە حیسابێ!**
**هاتە خەوم ئەمشەو، بە چ نازێك و عیتابێ[٤٧]**

کە ئەمەش بەڵگەیەکی زیندووە، دژی ئەو بۆچوونەی مەستوورە، وەك شاعیرێك ناودەبەن. چونکە (مەستوورە)ش، خۆی، لە مێژووەکەی خۆیدا (مێژووی ئەردەڵان)، کەم و زۆر باسی ئەوە ناکا، کە شیعری بە کوردی نووسیبێ.

بەڵام دوای ئەوەی نالی وەك (ئەدیب)ێك، ناوی مەستوورە، دێنێ؛ ئیتر دوای خوێندنەوەی یەکەمینجاری هەموو قەسیدەکە، بۆمان روون دەبێتەوە، کە مەستوورە، هێشتا کچە! لە کاتێکا وەك مەستوورە خۆی بۆمان دەگێرێتەوە، لە تەمەنی (**٢٣**) ساڵیدا، پێی هاویشتۆتە حەرەمسەرای (خەسرەوخان)ەوە!.. و تەمەنی (**٢٣**) ساڵیش بۆ تاقیکردنەوەی ئەدەبیی و بە تایبەتیش بۆ کچە کوردێکی وەك (مەستوورە)ی (پتر لە **١٧٠** ساڵ لەومبەر، لە شارێکی لە

---

٤٦ مەستوورە، مێژوویی ئەردەڵان، سەرچاوەی پێشتر ناوبراو، ل٢٣٦ ــ ٢٣٨، هەروەها:تأريخ مشاهير كرد، جلد يكم، ص٣٦٧ ــــ ٣٧٢.

٤٧ دیوانی نالی، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، بەغدا١٩٧٦، ل٦٠٣.

رادەبەدەر، داب و نەریت راگر و سەرپۆش لەسەری وەك (سنه)[48]دا... کە ئەگەریش سەروبەندێکی لەگەڵ کاروباری ئەدەب دا هەبووبێ، کە هێشتا کچە و لە ماڵە باواندایە؛ کەمتر دەنگی دەگاتە دەرەوەی ماڵی باوکی. بۆیە هێشتا بۆ ئەوە ناشێ کە شاعیرێکی گەورەی وەك نالی پێی بڵێ: ئەدیب!.

کەواتە دەبێ گەشانەوەی گوڵی ئەدەبیی **مەستوورە**، لە دوای ئەو قۆناغەوە بووبێ، کە بۆتە هاوسەری **خەسرەوخان**؛ یان بە واتایەکی تر، دەبێ لە دوای ئەو کاتەوە بێت کە دەبێتە میر کچێکی میرنشینی ئەردەڵانی و میرانی ئەردەڵانیش و بە تایبەتی(**خەسرەوخان**)ی هاوسەری **مەستوورەش**، یەکێك بووە لەو میرانەی کە دۆستی نزیك و راستەقینەی شاعیران و هونەرمەندان بووە و هەمیشە دیوەخانەکەی پڕ بووە لە ئەدیبان و هونەرمەندان و شەوانە، تا دەرەنگانێ کۆڕی ئەدەبیی و هونەریی، لە ماڵەکەیدا سازکراوە[49].

لەبەرئەوە من دڵنیام ئەم قەسیدەیەی نالی، هی قۆناغی دوای شووکردنی مەستوورەیە. کە دەبێ هەرواش بێ، چونکە **نالی** لە کاتێکا کە باسی کچێنی و رابردووی مەستوورە دەکا، دەڵێ:

**دەعوای ئومەرا، چەندە لەسەر تەختی کرابێ**
**چەند خوێن کــە رژابێت و چ خوێنی نەرژابێ**[50]

لەم رووەوە، کاك (فاتیحی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس)یش، رازێکی شاراوەی لە دوو توێی بەیتێکی بە توێکڵی ئەم قەسیدەیەی نالی دا هەست

---

٤٨ دیوانی نالی، ل٦٠٣.

٤٩ تحفەی ناصری ـــ تاریخ و جغرافیای کردستان، تألیف میرزا شکرالله سنندجی (فخر الکتاب)، مقابله و تصحیح دکتر حشمت الله طبیبی، انتشارات امیر کبیر، چاپ اول، تهران١٣٦٦ش، ص٢٠٢ ـــ ٢٠٣، ٣١٠.

٥٠ دیوانی نالی، ل٦١٩.

پێکردووه، که دەبێته بەڵگە بۆ ئەم بۆچوونەمان و بەڵگەکەش نیشانی دەدات که **مەستووره**، له کاتی نووسینی ئەم قەسیدەیەدا، شووی به (**خەسرەوخان**) کردووه، نەك هێشتا کچ بێت[٥١]. که ئەمه بەیتەکەیه:

**شەو، نائیم و قائیم، عەلـەمی (بابی رەزا) بێ**
**بێ دیده هەڵستێ، به مەثـەل، عەینی عەسابێ**[٥٢]

که **بابی رەزا**، باوکی (رەزا قولیخان)یش دەگەیەنێ، که کوڕه گەورەی **خەسرەوخان** بووه، له ژنه فارسەکەی: (حوسن جیهان)ی کچی فەتحی عەلی شای قاجار. کەواته؛ کۆکردنەوەی ناوی مەستووره، لەگەڵ **رەزا** دا، ئەوه دەگەیەنێ که مەستووره لەو سەردەمەدا ژنی خەسرەوخان بووه. له هەمان کاتیشدا دەبێ ئەوه بزانین که (رەزا قولیخان)ی کوڕه گەورەی (خەسرەوخان)یش، له ساڵی (**١٨٢٣ز**)دا له دایك بووه[٥٣]. چونکه که (خەسرەوخان)ی **بابی رەزا قولیخان** کۆچی دوایی کردووه، رەزا قولیخان، تەمەنی (**١١**) ساڵان بووه. که وەك له قەسیدەکەی **نالی**دا،دەردەکەوێ، هێشتا (خوسرەوخان)یش له ژیاندایه. واته هێشتا خوسرەوخان، بابی رەزایه. که به گوێرەی ئەم مێژووه، دەبێ کاتی نووسینی قەسیدەکەی نالی، له نێوان ساڵانی (**١٨٢٨ ـــ ١٨٣٤ز**) بێت.

دیسان که نالی له هەندێ بەشی ئەم شیعرەدا، شێوەیەکی ناتەواوی (تەرجیع بەند) و (دەور)ی، به دووبارەکردنەوەی وشەی (قڵەشابێ)، بەکارهێناوه[٥٤]، پشتیوانیەکی تره بۆ ئەوەی بڵێین له کاتی نووسینی ئەم قەسیدەیەدا، **مەستووره** (ژن) بووه، وەك نموونەی ئەم چەند بەیته:

---

٥١ دیوانی نالی، ل٧٣.

٥٢ دیوانی نالی، ل٦٢٣.

٥٣ دیوانی نالی، ل٦٠٣.

٥٤ دیوانی نالی، ل٦٠٥.

وەك خەیمە، بەپەردێکی دوو ئەستوونە بە پابێ
سەرتیلەکی نەختێ بە نەزاکەت قەڵەشـــــابێ
ل٦٠٩

کاسێکی بلووریني مخوونیی لـــەســـــــەرابێ
نەختێکی لەبەر مەوجی لە طـافەت قڵەشـــابێ
ل٦١٠

لەو کانیەدا چووزەرە ڕێواســـــــــــێ رووابێ
بەوچووزەرە ڕێواسە، کەمێکی قڵەشـــــــــابێ
ل٦١١

یا قورصی نمەك هەروەکـــــو مەڕمەڕ بە ضـیـابێ
جێی قەطـرەیە ئاوێکی لەنێودا قڵەشـــــــابێ
ل٦١٣

حوقڤێکی زەڕی صافی لەســـــــــەر بانی نرابێ
نەختێکی بەسەد صەنعەتی (مانی) قڵەشـــابێ
ل٦١٤

چەسپیدەو و خڕ هەروەکـــــــو بەر قاڵبی دابێ
نەختێکی لەبەر توندی یو سفتی قڵەشـــــابێ
ل٦١٥

**خرچێکی مودەووەر، بە عەســـــــەل ئاوی درابێ**
**نەختێکی لەبەر حوسن و حەلاوەت قڵەشـــــابێ**
**ل٦١٧**

**بۆ تەجرەبە، تا لەذذەتی شـــــیرینی ئەدا بێ**
**نەختێکی وەکو دیدەیی دەرزیی قڵەشـــــــابێ**
**ل٦١٨**

*  *  *

هەرچەندە لەوەشدا کە **نالی** وەك ئەدیبێك ناوی **مەستوورە** دێنێ، بەڵام جۆرە لاقرتی و گاڵتە پێکردنێکیشی تێدایە. چونکە **نالی** وای لە قەڵەم دەدات کە گوایە؛ خەڵك وای دادەنێن کە **مەستوورە** ئەدیبە!!

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە **نالی** گاڵتە! بە ئەدیب بوونی مەستوورە دەکا؛ لە هەمان کاتیشدا لە سەرتاسەری قەسیدەکە و بگرە لە هەموو بەیتێکیشدا ستایش و گەورەیی و دەسەڵاتدارێتی و شکۆی کەسایەتی مەستوورە باس دەکا و ئەوانەش کە دەستنووسی کەشکۆڵە دێرینەکانی دیوانی (نالی) یان نووسیوە و خوالێخۆشبوو (فاتیحی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس)یش، کە دیوانی نالی ئامادەی چاپکردووە، هەر پێیان وایە کە قەسیدەیەکی ستایش ئامێزی مەستوورەیە، چونکە (تێکرا لە چوارچێوەی پیاهەڵ وتن و شان شکۆ پێدانا دارێژراوە)[٥٥].

**دەعوای ئومەرا، چەندە لەسەر تەختی کرابێ**
**چەند خوێن کـــە رژابێت و چ خوێنی نەرژابێ**
**ل٦١٩**

---

٥٥ هەندێ لەو مامۆستا بەرێزانەش کە دیوانی دەستنووسی (نالی)یان بەلاوەبووە و لەسەر هەر یەکێ لە شیعرەکان، سەرنج ئاماژەیەکیان لەسەر نووسیوون، پێیان وایە ئەم قەسیدەی نالی، لە (ستایش)ی مەستوورەدا نووسراوە. بۆ زیاتر زانیاریی لەمبارەیەوە، بنوارە:دیوانی نالی، ل٦٠٤.

کەواتە دەبێ مێژووی نووسینی قەسیدەکە، هەروەك چۆن وتمان هی دوای شووکردنی (مەستوورە)یە؛ لە هەمان کاتیشدا هی پێش ئەوە سەردەمەیە کە بنەماڵەی میرنشینی ئەردەڵان، دەسەڵاتیان لە دەستدا نەماوە و بە ناچاری و بە کۆمەڵ، روویان لە میرنیشینی بابان کردووە، کە دیارە ئەم سەردەمەش زۆر کورتە و ئەوەندەی بەبەرەوە نەبووە **مەستوورە** ماوەیەك لە سلێمانی پێتەختی (بابان)ەکاندا بژی و لەوێ لە دیوەخانی میران و کۆڕ و دانیشتنی ئەدەبیدا، لەگەڵ **نالی** دا سەر و پێوەندێکیان هەبووبێ. بەڵکو وەك زانیمان مەستوورە، لەم کۆچە زۆر نالەبارەدا، نەخۆش و ئاوارە و لێقەوماو بووە، کە داب و نەریتی کوردەواریش، رێگە بەوە نادا لەمجۆرە کاتانەدا قەسیدەی وا لەبارەی ئافرەتێکی بێ دەرەتان و میوانی وەك مەستوورەوە بنووسرێ، چونکە مەستوورە وەك خۆی لە مێژووەکەی خۆیدا دەیگێڕێتەوە: هەر کە گەیشتبوونە شارەزوور و پێیان ناوەتە سنووری میرنیشینی بابانەوە، عەبدوڵڵای پاشای کوڕی سلێمان پاشای میری ئەو کاتەی بابان (رێ و رەسمی پێشوازی لێکردنیانی بەجێ گەیاندووە)[٥٦].

کە وتیشمان مێژووی نووسینی قەسیدەکە، لە نێوان ساڵانی (**١٨٢٨ز تا پێش ١٨٣٤ز**)یە، ئەوا مەستوورە، میرژنە و لە لووتکەی دەسەڵات و ناز و نیعمەتدایە. هەر بۆیەش سەرتاسەری قەسیدەکە (وەك خۆپاراستنێك لەو دەسەڵاتە) باسی خەونێك دەکا و.. خەونیش گومرگی لەسەر نییە...

بە هەمان شێوە، (نالی)ش لە قەسیدەکەیدا، کە باسی خۆی دەکات، وەك کەسێکی گەورە و بە توانا و بلیمەت و بە دەسەڵات، ئاماژە بۆ خۆی دەکا:

**هەر مەسئەلە بیکرێ، کە بە تۆ شــەرحی کرابێ**
**مومکین نییە کەس دەخـــڵی بکا، چین و خەتابێ**
**ئەم شاریحی تەشــریحە، دەبێ هەیئەتی چابێ**
**هەم شاریح و هـــەم جاریح و موضیحە گوشابێ**
**ل٦٠٦**

---

٥٦ مەستوورە، مێژوویی ئەردەڵان، سەرچاوەی پێشتر ناوبراو، ل٢٣٧. هەروەها: تحفەی ناصری، ص٢١٠.

**رێی حورمەت و بێ حومەتیی هەرگیز نە کوتابێ**
**چـــەنــد ناوی رژابێت و چ ناوێ نـــــەڕژا بێ**
**ل٦٢٥**

***   *   ***

لەبەرئەوە دەبێ (نالی)یش کاتێ ئەم قەسیدەیەی نووسیبێ، کە لەوپەڕی لەخۆ رازیبوون و دەسەڵاتی شاعیرانە و بە خۆنازیندایە و .. هەر ئەو سەردەمە بێت، کە (نالی)ش هێشتا ئاوارەبوون و لێقەومان و دووركەوتنەوەی لە خاكی نیشتمان نەچەشتووە و لە نیشانەكانی بە خۆنازینەكانیشیدا دەردەكەوێ كە **نالی** وەك تەمەنیش، هێشتا لە هەرەتی لاوێتی و لەخۆ ڕاپەرمون و گەشە و هیوای ژیاندایە. بە پێچەوانەی ئەو چەند شیعرەوە، کە لە ئاوارەییدا نووسیونی و بە ئاسانی بۆن و بەرامەی پەككەوتن و بێ دەرەتانییان پێوە دیارە. وەك نموونەی ئەم چەند شیعرەی:

**وەی کە روو زەردی (مەدینە) و روسیاهی (مەککە) خۆم**
**دەرکراو و دەربەدەر، یـــــاڕەب دەخیلی عەفووی تـــۆم**
**ل٢٩٩**

**ئەی تازە جوان! پیرم و نوفتادە و کـــــــــــەوتووم، تا مـــــاوە حـــەیاتم**
**دەستێ بدەرە دەستی شکستەم، کە بەســــــەرچووم، قوربانی وەفـــــــــاتم**
**ل٢٦٤**

**یان کە لە شام ـــــ ەوە بۆ سالم ـــــ ی هاوڕێی دەنووسێ:**
**زارم وەکو خیلال و نەحیفم وەکـــــو خەیاڵ**
**ئایا دەکەومە زار و بە دڵدا دەکەم خوتور؟**
**ل١٩٦**



بۆیە بۆ بەراوورد راگرتنی هەردوو سەردەمی ژیانی نالی و مەستوورە ــــ کە هاوسەردەمی یەکترن ــــ و ئەو رۆژگارەش کە وەك وتمان (نالی)ش ئەم قەسیدەیەی تێدا نووسیوە، سەردەمی گەشانەوەی شاعیرێتی (نالی)یە، کە وەك ئاکام، خودی قەسیدەکە ئەو پرسیارەمان لا بەجێ دەهێڵێ:

بۆچی **نالی** ئەم قەسیدەیەی لەسەر مەستوورە نووسیووە؟!

لە وەڵامدا، بەو هۆیەوە کە باس و خواسەکانی ناو دیوەخانان و دانیشتنە ئەدەبییەکانی ئەو رۆژگارەمان لەبەر دەستدانییە! بۆیە هەر ئەوەندەمان لە دەست دێت، شوێن لێکدانەوە و بۆچوونی خۆمان بکەوین و بڵێین پێش هەر لێکدانەوە و بۆچوونێك، دەبێ ناسینەوەی **نالی**، لە پەنجەرەی شیعرەکانی خۆیەوە دیاری بکەین و لە سەرلەبەری شیعرەکانیشیدا، ئەم ئەنجامگیرییەمان دێتە بەر هەست، کە **نالی** سەرەرای شاعیرێتی و دەسەڵاتی داهێنەرانەی دەگمەن و کەم وێنەی، لە هەموو بوارەکانی شیعردا، بەڵام **نالی**؛ مرۆڤێکی خوێن گەرم و دڵ و هەست زۆر ناسکە؛ بە رادەیەك کە بچووکترین و ناسکترین ئازاردانی؛ گەورەترین ئازاری پێگەیشتووەو هەڵچووە و هاتۆتە دەنگ. کە ئەم دیاردەیە لای (مەحوی)ش هەروایە. بەڵام لای شاعیرێکی گەورەی وەك مەولەوی بە پێچەوانەوەیە. واتە نالی بچووکترین نیشانەی درشت و زبری دەوروپشتی، هەستی رووشاندووە و ئازاری پێگەیاندووە و بە دەم ئازاریشەوە هەستی خۆی بە شیعر دەربڕیوە؛ بە تایبەتیش بەرامبەر ئەوانەی دڵە پڕ شیعرەکەیان رەنجاندووە و ویستوویانە لە شکۆی شاعیری و لە شکۆی کەسایەتی کەم بکەنەوە:

**ئەم سەرســـــەری بازانە، کەوا هەمســــــەری بوومـــن**
**موشکیل بگەنە ســـاعیدی شـــــــــاهێکی وەکـــو من**
**ل٣٣١**

**شیعری خەڵکی کەی دەگاتە شیعری من بۆ ناســـکی!**
**کەی لە دیققەتدا، پەتك دەعوا، لەگەڵ هەودا دەکا؟**
**ل١٠٧**

**کەس بە ئەشـــعارم نەڵێ خۆ کـوردی یە، خۆکردییە**
**هەر کەســــێ نادان نەبێ، خۆی تالبی مەعنا دەکـا**
**ل١٠٧**

**سایەیی پایە وەکو باڵی هوما و بازی ســــــپیم**
**نەوەکو بوومی قەدەم شووم و نەهەمڕەنگی قەلـــم**
**ل٢٨٩**

**ئەو گەوهــــەری نوکتە، کە لە نـــالی دەدزن، خەڵق**
**ئـــــاوی نییە، وەك ئاگـــــری بێ شــەوقی دزانە**
**ل٤٨١**

**لێم حەرامە دانە و ئاوی حەمـــامــــاتی حــــەرەم**
**من کە بازی دیدە بـازم، نەك شەوارەی دەســــتەمۆم**
**ل٣٠١**

* * *

ئەم نموونانە و نموونەی زۆرتری لەم بابەتەی نالی، ئەوە دەسەلمێنن کە ئەگەر چەند وەلاٚمێك بۆ هۆی نووسینی ئەم قەسیدەیە هەبێ؛ ئەوا (یەکێك) لەو وەلاٚمانە، (کە بەلای منەوە وەلاٚمێکی لاوازە) ئەوەیە کە بلێین: دەشێ **نالی** لە ئاکار و قسە و توانجێکی **مەستوورە** بێزار بووبێ و بەو جۆرە نالی وەلاٚمی دابێتەوە!...ئیتر ئەو ئاکار و قسە و توانجەی **مەستوورە**، چۆن بووبێ و لە کوێ و

کەی لە چ دیدار و کۆڕ و کۆمەڵێکدا، لەگەڵ **نالی** دا، یەکتریان دیبێ..یانا؟!..ئەمانە هەمووی جێی پرسیاری بێ وەڵامن. چونکە وەك پێشتر وتمان: دیوەخانی (خەسرەوخان)ی **ئەردەڵان** و دواتریش (دوای مردنی خەسرەوخان)، هەمان دیوخان، هەر مەڵبەند و ژووانگەی کۆڕی ئەدیبان و هونەرمەندان بووە و دیسانیش هەر لە شاری (سنە)ی پێتەختی **ئەردەڵان** دا،، مزگەوتی بەناوبانگی (دارالاحسان)یش، کە لەسەر فەرمان و لە سەردەمی:ئەمانوللاخانی **(١٧٦٤ ــــ ١٨٢٤ز)** گەورە و خەزووری **مەستوورەدا** دروستکراوە؛ مەڵبەندێکی درەوشاوەی ئایینی و زانستی بووە و زانایان و ئەدیبان و رووناکبیران، لە هەموو لایەکی کوردستانەوە روویان تێکردووە. ئیتر ئەگەر (نالی)ش وەك زۆر لەو ئەدیب و شاعیرانە، رێی کەوتبێتە دیوەخانی خەسرەوخان، یان مزگەوتی دارالاحسان و لەلایەن خەسرەوخان، یان (مەستوورە)وە رێزی شیاوی خۆی، وەك پێویست لێ نەگیرابێ و دڵی رەنجێندرابێ؛ ئەمەشیان جێی لێ وردبوونەوەیە. یان وەڵامی ترە بۆ پرسیارە زۆرەکان، کە لەم بوارەدا بەڵگە و نموونەی شیعری (نالی)مان لەبەر دەستدا نییە؛ ئاماژە بۆ ئەوە بکەن کە لە سنەدا ژیابێ. بە پێچەوانەی (سالم)ی هاورێی (نالی)یەوە، کە وەك لە دوتوێی شیعرەکانیدا دەردەکەوێ، ماوەیەك بە ئاوارەیی لە (سنە)دا ژیابێ و بە خەمێکی زۆرەوە، لە زۆر شیعریدا، باسی ئەو رۆژانە دەکا[٥٧]، وەك نموونەی ئەم شیعرانە:

**فەرەح دێنێتە خاتر، گە (ســــــــەنەندوج)**
**لە دڵمایە خەفەت، وەك شــــــــاخی (ئارێز)**
**چ بڵێم! حاڵەتی دڵ چۆنە لە هیجرانا (ســالم)**
**صەحنی گوڵزاری سەنەندوج، وەکو زیندانی منە**

دیسان وەڵامی بە هێزی تریش بەلای منەوە، بۆ بەردەم ئەم پرسیارانە ئەوەیە، کە وەك بە شیعرەکانی (نالی)دا بۆمان دەردەکەوێ، نالی لە سەران و میرانی

---

٥٧ دیوانی سالم، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، (١٩٧٢)ـ لاپەڕە (٧٢ ــ ١٣١).

(بابان)یش نزیك بووە و دۆستایەتی لەگەڵ سلێمان پاشا(**١٧٩٠ ـــ ١٨٣٨ز**)[٥٨] ی کوڕی ئەوڕەحمان پاشای **بابان** و دواتریش لەگەڵ ئەحمەد پاشای کوڕی سلێمان پاشای **بابان** دا هەبووە. چونکە شیعری زۆر بە کوڵ و بە سۆزی بۆ کۆچی دوایی یەکەمیان و لەسەر تەخت دانیشتنی دووەمیان نووسیوە، کە ئەمە سەرەتای نموونەی ئەو شیعرانەیە:

**تا فەلەك دەورەی نەدا ـــ سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو**
**کەوکەبەی میهری موبارەك، تەلعەتی پەیدا نـەبوو ل٣٧٠**

**هودهودی دڵ، حەپسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین**
**خۆی کە دامێن گیری شاهی ئاسەفی ثانی دەکـــــات ل١٠٥**

*   *   *

هەروەها شیعری بۆ سوپاکەی ئەحمەد پاشای کوڕی سلێمان پاشای **بابان** نووسیوە، کە بەمجۆرە دەست پێدەکا:

---

٥٨ گەڕیدەی ناسراوی بەریتانی:کلودیوس جێمس ریج، کە ساڵی (١٨٢٠ز) سەردانی شاری سلێمانی کردووە و لە نزیکەوە چاوی بە سلێمان پاشای بابان کەوتووە، دەڵێ لەوکاتەدا(سلێمان پاشا)، تەمەنی (٣٠) ساڵان بووە. هەروەها (نالی)ی شاعیریش کە بە بۆنەی کۆچی (سلێمان پاشا)ەوە شیعری نووسیوە، مێژوویی مەرگی ناوبراوی لە ساڵی (١٨٣٨ز) نووسیوە. بۆ زیاتر زانیاریی لەمبارەیەوە بنواڕە:گەشتنانەی ریج بۆ کوردستان، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی:محەمەد حەمە باقی، چاپی سێیەم، چاپەمەنی ئاراس، هەولێر٢٠٠٢، ل١٣٢. هەروەها دیوانی نالی، شعیری:تا فەلەك دەورەی نەدا، سەد کەوکەبی ئاوانەبوو ـــ ل٣٧٠.

ئەم تاقمە مومتازە، کەوا خاسسەیی شــاهن
ئاشوبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن       ل٣٤٠

* * *

ئەم دۆستایەتییەش لەگەڵ ئەم میرانەدا، ئەوەمان بە بیردا دێنێ، کە زۆرجار لە کاتی هەڵوێست وەرگرتنی ئەم میرانەدا، بەرامبەر بە رووداوێك، یان بەرامبەر بە میرێکی تر؛ بە تایبەتیش بەرامبەر میرانی **ئەردەڵان**، کە هەندێ جاریش بەیەکدا هەڵپڕاون، وایان لە نالی کردبێ، بۆ پشتیوانیی لە میرانی **بابان**، بە نیازی سووکایەتی کردن بەرامبەر بە میران و سەرانی **ئەردەڵان**، ناوی ئافرەتێکی ناوداریان بهێنێ؟!. چونکە لەم بوارەدا، نەك هەر نالی، بەڵکو هاوڕێکانیشی لە روانگەی بەرگریی و خۆشەویستیی میران و میرنشینی (بابان)ەوە، کەوتوونەتە سەنگەری بەرەی **بابان** و هەڵویست وەرگرتن لە تێکڕای رووداوەکانی ئەو رۆژگارە؛ وەك نموونەی ئەو شیعرەی **سالم**، کە پێشتر نووسیمان و ئەو شیعرەی شێخ رەزای تاڵەبانی (**١٨٣١ ـــ ١٩١٠ز**)، کە سەبارەت بە شەڕێکی نێوان عەبدوڵا پاشای بابان و (رەزا قولیخان)ی کوڕی (خەسرەوخان)ی میری **ئەردەڵان**، نووسیوێتی و بە لاقرتییەوە باسی تێکشکانێکی لەشکری **ئەردەڵان** و بە ستایشەوە سەرکەوتنێکی سوپای **بابان** بەسەر سوپای ئەردەڵان دا دەکا:

**کە عەبدوللا پاشا لــەشکری (والی ســـــنە)ی شــــــڕ کرد**
**(رەزا) ئەو وەختە عومری پێنج و شەش، طیفلی دەبوســـتان بوو**[٥٩]

بەڵام وەڵامی لە بارتر، بۆ سەرجەمی ئەو پرسیارانە، لەو بوارەدا کە لە پێشەکی ئەم چەند لاپەڕەیەدا ئاماژەمان بۆ کرد؛ ئەویش بواری ململانێ و تەنگ بە یەکتر هەڵچنینی هەردوو قوتابخانەی جیاوازیی ئەدەبیی **گۆران** و دیالێکتی **باشوورە**؛ کە لە قوتابخانە شیعرییەکەی نالی

---

٥٩- دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، ساغکردنەوە و شەرحی:شوکور مستەفا، چاپەمەنی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر٢٠٠٠، ل٨٧.

و هاوڕێکانیدا خۆی دەنوێنێ و نالی سەردەستەی ئەو قوتابخانەیە و ئەو ململانێ و زۆرانبازییە دژوارەیە، کە سەردەمی ژیانی مەستوورەش، هاوکاتی سەرهەڵدان و گەرمەی باس و خواسی ئەم قوتابخانە شیعرییەی نالی بووە و هەڵبژاردنی ناوی مەستوورەش، لەلایەن **نالی** یەوە، بۆ سووکایەتی پێکردنی میران و سەرانی ئەردەڵان بووە؛ کە باوەش و پەناو سێبەری دێرینە و راستەوخۆی ئەدەب و ئەدیبانی دیالێکتی **گۆران** بوون و..لەمەش زیاتر، بۆ ئابڕووبردنیان بووە، کە راستەوخۆ سووکایەتی بە ناوی ئافرەتێکی بە ناوبانگ و بە شان و شکۆی وەك **مەستوورە** بکا، کە بەڕای من **مەستوورە**، رەمزی سەربڵندیی و ناوبانگی ئەو کاتەی میرانی **ئەردەڵان** بووە؛ چونکە جگەلەوەی بنەماڵەی **مەستوورە** هەمیشە ناودار و دەسەڵاتدار و سەرکەش بوون. لە هەمان کاتدا مەستوورەش خۆی، خانمێکی هێژا و هەڵکەوتوو بووە. هەر بۆیەش بەسەر (حوسن جیهان)ی کچی فەتح عەلی شای قاجاردا، کە یەکەمین هاوسەری **خەسرەوخان** بووە؛ بۆتە دووەمین هاوسەری **خەسرەوخان**، بەمەشدا دیارە ئەگەر **مەستوورە**، شایانی ئەوە نەبووایە، ئەوا لەقکردنی پلەوپایەی (حوسن جیهان)، هەروا شتێکی ئاسان نەبووە؛ کە لەو رۆژگارەدا فەتح عەلی شای قاجار (**١٧٩٨ ـــ ١٨٣٤ز**)، تاقانە شایەك بووە، لە سەرتاسەری خۆرهەڵاتی ناوەراستدا، حسابی گەورە و تایبەتی لەسەر کراوە.

جگە لەوەی لایەنی گرنگیش لە کرداری نالی دا، ئەوەیە کە زۆر بە دەگمەن و دژوار، ناوی کەسێك لە شیعرەکانیدا بهێنێ، مەگەر ئەو کەسە زۆر ناودار و گرنگ بێت. چونکە لەو قەسیدە درێژەشدا، کە لە (شام)ەوە بۆ (سالم)ی نووسیوە؛ ئەگەر سالم خۆی، بەو قەسیدەیە درێژە، وەڵامی نالی نەدابایەتەوە، نەماندەزانی کە ئاخۆ قەسیدەکەی **نالی**، بۆ (سالم)ە، یانا؟!..ئەگینا نالی خۆی لە قەسیدەکەدا، ناوی کەسی نەهێناوە. بۆیە ئەگەر مەستوورەش، زۆر گەورە نەبووایە، نالی ناوی نە دەهێنا. کاتێکیش ناوی هێناوە (وەك لە سەروتریش وتمان)، لە وێناکردنی (خەونێکدا) ناوی هێناوە،چونکە وەك وتمان نالی زۆر باش مەستوورە دەناسێ و دەزانێ کە:

**دەعوای ئومەرا، چەندە لەسەر تەختی کرابێ**
**چەند خوێن کـە رژابێت و چ خوێنی نەڕژابێ!**

**سەقز**
**زستانی/١٩٩٤**

# نالی

## له سەفەرنامەی باڵیۆزێکی فرەنسادا

## (١٩٠٦ـ١٩٠٧)

ساڵی (١٨٥٣) هێشتا (نالی) خۆی له ژیانو نیشتەجێی شام (سووریا) بووه، كه: ئەلیكساندەر بۆرێژیۆ ئاخۆدزكۆ(١٨٠٦ـ١٨٩١)ی شاعیرو دیپلۆماتو زمانەوانی پۆڵەندی[1]، لەو کاتەدا كه له وەزارەتی كاروباری دەرەوەی فرەنسادا كاری كردووه، ویستوویەتی لێكۆڵینەوەیەكی فیلۆلۆژی لەبارەی زمانی كوردی ـ دیالیكتی سلێمانیـ یەوه بنووسێ[2]، پێوەندی بە: ئەحمەد پاشای بابان (؟ـ ١٨٧٥) ەوه كردووەو لەرێگەی ئەحمەد پاشای بابانیشەوه زانیویێتی كه (نالی) لەو ساڵەدا (١٨٥٣) نیشتەجێی شام (سووریا) یەو له هەموو دیالیكتەكانی زمانی كوردی دا، زانایەكی بەناوبانگە[3] و بەتایبەتی خۆی بۆ دیالیكته هەمەچەشنەكانی نیشتمانەكەی (كوردستان) تەرخانكردووەو پێشتریش كتێبێكی رێزمانی عەرەبیی وەرگێڕاوەته سەر زمانی كوردی. بۆیه (ئاخۆدزكۆ) بۆ ئەنجامدانی ئەم كارەی، بەتاسەوه ئاواتی دیداری (نالی) خواستووه. بەڵام وەك دواتر دەردەكەوێ ئەم ئاواتەی دیداری (نالی) بۆ نەرەخساوەو كارەكەی بەشێوەیەكی تر، لەگەڵ ئەحمەد پاشادا ئەنجام داوه.[4]

ئەم هەواڵەی ئەحمەد پاشا، لەبارەی شارەزاییو زانایی (نالی)یەوه، له دیالیكتەكانی زمانی كوردی دا، كەبە(ئاخۆدزكۆ)ی داوه، باسو خواسو پرسیاری زۆر و تازەو هەمەجۆر دەوروژێنێ، وەك ئەوەی كه:

١ـ ئەحمەد پاشای دوا میری میرنشینی بابان[5]، هەروەك چۆن لەماوەی فەرمانڕوایەتییەكەیدا، ناسیاوییو دۆستایەتی لەگەڵ **(نالی)**دا هەبووه[6] و

(**نالی**)یش دۆستی نزیکی (**سالم**) و (**کوردی**) بووە، کەچی ئەحمەد پاشا لەنێوان ئەم دەستە شاعیرانەدا، هەر تەنیا ناوی (**نالی**)، وەك زانای بەناوبانگ، لەبواری زمانی کوردی دا، بە (ئاخۆدزکۆ) دەگەیەنێ.

**٢ـ** لەو ساڵەدا (١٨٥٣)، کە ئەحمەد پاشا ئەم زانیارییانە لەبارەی (**نالی**)یەوە بە (ئاخۆدزکۆ) دەدات، میرنشینی بابان ڕووخاوەو ئەحمەد پاشا چەند ساڵێکە نیشتەجێی ئەستەموولەو (**نالی**)یش پێش ڕووخانی میرنشینەکە، کوردستانی جێهێشتووە. بەم پێیە چ ئەحمەد پاشاو چ (**نالی**)یش، هەردووکیان لەدەرەوەی کوردستانن‌و ئەگەرچی بە جوگرافیاش لەیەکتر دوورو دابڕاون، بەڵام بەهۆی دۆستایەتیی پێشتر و دێرینەیانەوە، لە هەواڵی بەردەوامی یەکتر دانەبڕاون. ئەی ئاخۆ ئەم زانیارییانەی ئەحمەد پاشا، سەبارەت بەزانایی‌و خۆتەرخانکردنی (**نالی**) بۆ دیالیکتەکانی زمانی کوردی، زانیاریی سەردەمی پێش ڕووخانی میرنشینی بابان‌و دەرچوونی (**نالی**)ن، لەکوردستان!؟، یان دوای سەردەمی دەرچوونی (**نالی**)ن لەکوردستان!؟

**٣ـ** ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە (ئاخۆدزکۆ) دەیەوێ لەسەر (دیالیکتی سلێمانی)ی بنووسێ‌و لەو کاتەدا (١٨٥٣)، کە هێشتا تەمەنی دروستبوونی شاری سلێمانی خەریکە دەبێتە (٦٩ شەست‌ونۆ ساڵ)، ئەو شێوەزار، یان وەك (خۆدزکۆ) لەو کاتەدا پێی دەڵێ: (دیالیکتی سلێمانی)، ئاخۆ ئەو شێوەزارە، وەك (دیالیکتێك)، خەملیوەو چەسپیوەو بڵاوبۆتەوەو بۆ ئەوە دەبێ پێی بوترێ: دیالیکتی سلێمانی!؟.

**٤ـ** ئەو دیالیکتانەی زمانی کوردی، کە لەو سەردەمەدا (**نالی**) خۆی بۆ تەرخان کردبوون‌و کاری لەسەر دەکردن، بۆچی یەکێك لەو دیالیکتانەی نەکردە بنەما و سەرمەشقی کاری زمانەوانیی خۆی‌و دەوڵەمەندکردنی ئەو دیالیکتە، بە فەرهەنگی واژەگەلی نوێ!؟ وەك ئەوەی **مەولەوی تاوەگۆزی** (١٨٠٣ـ١٨٨٢)ی هاوڕۆژگارو سەردەمی (**نالی**)ی، بۆ دیالیکتی (گۆران)ی کردو بەدەم داهێنانی لیریکا جوانەکانییەوە، دیالیکتی (گۆران)ی گەیاندە لووتکەی گەشانەوەو ئارایش و ڕازاندنەوە و تەنینەوەی سەرلەنوێی ئەو دیالیکتە دێرینەیەی زۆرترین‌و دەوڵەمەندترین ئەدەبی نووسراوی پێشکەش بە سامانی فەرهەنگی کوردی کردووەو خودی (**نالی**)یش لەو ڕۆژگارەدا، لەقەڵەمڕەوی یەکجار فراوانی ئەو

دیالیکتەدا چاوی هەڵهێنا و توانای دیالیکتەکەی لە داهێنانی شیعری بەرزدا، هەست پێکرد. بەڵکو (**نالی**)، لەکاتێکدا خۆی نوقمی کەش و هەوای دیالیکتی (گۆران) بوو، بەڵام لەکۆی ئەو کەرەسەی دیالیکتانەی، کە خۆی بۆ تەرخان کردبوونو کاری لەسەر دەکردن، کاری موتوربەسازیی پێکردنو دیالێکتێکی ترو تازەتری پێکهێناو داهێنا، کەوەك هەر لە ڕۆژگاری (**نالی**)دا، زمانەوانێکی وەك (خۆدزکۆ)، پێی وتووە (دیالێکتی سلێمانی)و خودی (**نالی**)یش، بەر لە هەموو کەسو بەر لە (خۆدزکۆ)ش، خۆی لە شیعرەکانیدا ئاماژەی بەم شانازییەی خۆی کردووە، کە داهێنانێکی نوێی لە زمانی کوردی دا کردووەو وتوویەتی: **(کەس بە ئەشعارم نەڵێ: خۆکوردی یە، خۆکردی یە...)**. .

* * *

بەڵام ئەم داهێنانە نوێیەی (**نالی**) لە زمانی کوردیدا کردوویەتی، بەر لە هەموو دیالیکیتەکانی تر، دەستە چیلەی زۆری لە دیالیکتی (موکریان) بۆ خواستووە و لە دیالیکتی (موکریان) نزیکە، (دیالیکتی موکریان) یش لە دووسەری شێوەزار و قەڵەمڕەویشەوە، لە شێوەزار و قەڵەمڕەوی (پشدەر)ی زێدی میرانی بابان نزیکە و تێکەڵە. . . بەم پێیە ئەو دیالیکتەی (**نالی**) کردی بە سەرمەشقی کاری زمانەوانیی و شیعرەکانی خۆی، لای میرانی بابانیش جێی پەسەند و ڕازیبوون بوو.

ڕەنگە هەر ئەم نزیکایەتییەی زمانی شیعری (**نالی**)، لە دیالیکتی موکریان، (یەکێك) بێ لەو هۆیانەی، هەر دوای بڵاوبوونەوە و تەنینەوەی شیعری شاعیرانی سێ کوچکەی (بابان)، بۆ دەرەوەی قەڵەمڕەوی (بابان)، هەر زوو شیعری (**نالی**) لای شاعیرانی موکریانەوە باوەشی گەرمتری لەچاو شاعیرانی وەك نموونەی (سالم) و (کوردی)دا، لەلایەن **عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان: ئەدەب** (؟-١٩١٦) و **مەجدی** (١٨٤٩-١٩٢٥) و بەتایبەتیش لای **وەفایی** (؟-١٩٠٢) یەوە بۆ کرایەوە و ڕەنگدانەوەی وێنەی شیعریی و جێپەنجەی هەندێ لە شیعرەکانی، کرایە سەرمەشق و چاولێکەریی و بەجۆرە لەدەمێکەوە شیعری (نالی)، لە هەرێمی موکریان، جێگەی

سەقامگیر و شیرینی هەیە و لە ئەزموونی مانەوە و ژیانی زیاتر لە (١٦) شازدە ساڵی نووسەری ئەم لاپەڕانەشدا، لە خۆرهەڵاتی کوردستان (سەقز)، بۆی دەرکەوتووە، کە شیعری **(نالی)**، لای زۆرینەی ڕووناکبیرانی موکریان، جێی پەسەند و ئاوڕلێدانەوەی تایبەت و ئەزبەرکردن و خۆشەویستییە.

هەموو ئەو پرسیارانە و گەلێ باس و بابەتی تر، کە داهێنانەکانی (نالی)، لامان دەورووژێنن، بوونەتە کەرەس و هەوێنی بەرهەمی کتێبێکی ئاییندەم، کە ئەگەر مردن مەودا بدات، چاوی خوێنەران و دڵدارانی (نالی) پێ ڕووناك دەکەمەوە.

لەم بۆنەیەشدا، کە لەڕێگەی داهێنانە مەزنەکانی (نالی)یەوە، پردی نێوان (نالی) و هەرێمی موکریان دێتەگۆڕێ، با بزانین کاتێ باڵیۆزێکی (فرەنسا)ش، لە ساڵی (١٩٠٦)دا، سەردانی (موکریان) دەکات، چۆن باسی (نالی) دەکات!.

**ئەم باڵیۆزەی فرەنسا کێیە؟!**

ناوی (کۆلار دسکۆ)یەو بە نازناوی (یۆژین یۆبین) نووسینەکانی بڵاوکردۆتەوە. نابراو ساڵی (١٨٦٣) لە شاری (ڕۆیین)ی فرەنسا بە دنیا هاتووە و لە تەمەنی (٢٠) ساڵییدا کۆلێژی (یاسا)ی تەواوکردووە و دوایی لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فرەنسا بە فەرمانبەر دامەزراوە و لەو مێژووە بە دواوە، چەند پلە و ناونیشانێکی دراوەتێ‌و بۆ چەند جێگەو وڵاتێکی وەك: (ئەسینا ـ یۆنان)و ئەستەمبووڵ‌و (کاراکاس ـ ڤێنزوێلا)و (پەکین ـ چین)و (ڤییەنا ـ نەمسا)و (قاهیرە ـ میسر)و دواتر بۆ (پاریس ـ فرەنسا) گوێزراوەتەوە. ساڵی (١٨٩٨) پلەکەی بەرزتر کراوەتەوەو بۆ (بوخارست)و (تەنجە)و (مەراکیش) نێردراوە. ئەم سەفەرەی بۆ مەراکیش, بووە هەوێنی دوو کتێب لە بارەی مەراکیشەوە وساڵی (١٩٠٦)چاپ بڵاوبۆتەوە.

ساڵی(١٩٠٤) بە پلەی دووەمی (وەزیر موختار- باڵیۆز) بەرزکراوەتەوەو بە نوێنەرایەتیی وڵاتەکەی، لە (هایتی) جێگیر دەبێ و بەدەم کارەوە کتێبێك لەبارەی ڕەش پێستەکانی ئەوێوە دەنووسێ.

له(٨ی تشرینی ١٩٠٥)دا، بۆ (تاران) دەگوێزرێتەوە و تا ساڵی (١٩٠٧) له ئێران دەبێ، کە کتێبی (ئێرانی ئەمڕۆ)، یادگاری ئەم ئەرکەیەتی. ناوبراو کە لە ساڵانی پڕ لە هەڵلاوهەرای (مەشرووتییەت)دا لە تاران بووە و ئەو ڕاپۆرتانەی لەم بارەیەوە بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فرەنسای ناردوون، بەیەکێك لەو سەرچاوە گرنگانە دادەنرێن، کەجێی سەرنجی لێکۆڵەرانی ئەم ڕووداوە گرنگەن.

ساڵی(١٩٠٧) بۆ (بەلگراد) دەگوێزرێتەوە و لە ساڵی (١٩١٠)دا، کە پلەی یەکەمی (باڵیۆز)ی دەدرێتێ، بەرەو پاریس دەگوێزرێتەوە و لەدواییدا ساڵی (١٩١٤)، کەمێك پێش هەڵایسانی یەکەمین جەنگی جیهانیی، کارکەنارده بێ.

ناوبراو جگە لەو بەرهەمانەی ئاماژەمان پێکردن، ئەم کتێبانەشی نووسیون:

١- ئینگلیزەکان لە هیندو میسر

٢- پێشەنگەکانی تووریستی جیهانیی لە مەراکیش

بەڵام لەناو بەرهەمەکانی (یوژین یۆبین)دا، ئەو سەفەرنامەیەیان مەبەستە، کە ساڵانی (١٩٠٦-١٩٠٧) نووسیوێتیو دواتر بەناونیشانی (أیران امروز)کراوەتەوە فارسی[٧]و لەبەشی چواری ئەم سەفەرنامەیەدا، گەشتەکەی دەکەوێتە ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجانی خۆرئاوا و موکریان و لەبەشی (١٤)و(١٥)شدا، بە ناوچەکانی (کرماشان)و (خانەقین)دا تێپەڕدەبێ، کە جارێ ئەمەی ئێستا مەبەستمانە[٨]، هەر بەشی (٤)چوارهەمیانە.

ئەم گشتەی ناوبراو، لە مانگی تەمووزی (١٩٠٦)داو لەسەر داوای دەوڵەتەکەی خۆی (فرەنسا) دەستی پێکردووە، کە (٧) حەوت هەفتەی خایاندووە و سەرەتا لە(تاران)ەوە، بەشار و شارۆچکەکانی: قەزوین، زنجان، سوڵتانییە، پل-دوختەر، میانە، گەرمارود-دا گەیوەتە (تەورێز) و لەوێشەوە بە: مەرەند، خۆی، سەلماس دا گەیوەتە (ورمێ) و لە ورمێشەوە بە: دیزەج، محەمەدیار-دا گەیوەتە سابلاخ-مەهاباد و دوای ئەم سەردانەش بەرەو باشوورتر، بۆ ناوچەکانی (سەقز) و (بانە) ناچێتو هەر لە سابلاخەوە بەڕێی: تەورێز، ئەردەبیل، سەراب، ئاستارا، ئەنزەلی دا بۆ(تاران) گەڕاوەتەوە.[٩]

### (موکری)و (دێبوکری)یەکان: [10]

(بوداق سوڵتان) دوو کوڕی بووە: (عەبدولعەزیز سوڵتان)و (عەبدوڵڵا بەگ). لە کوڕی یەکەمیان (خانزاد)ەکان بەجێماون، کە لەشاردا نیشتەجێن. لە کوڕەکەی تری (بەگزادە)کان ماونەتەوە، کە لەزۆزاندا بە بڵاویی دەژین. ئەم دوو لقە، چینی ئەعیانو پیاوماقووڵانی خێڵ پێکدێنن، کە سەرکردەو بەڕێوەبەر لەم چینە هەڵدەبژێردرێت.

بەڵام سەرەڕای دابونەریتی باوی ئەو سەردەمە، لەنیوەی سەدەی ڕابووردوودا کوردێکی ئاسایی (موکری)، بە حاکمی سەرتاسەری ئازەربایجان دانرا و هەلی قۆستەوەو پلەو پایەو هێزی خۆی بۆ لەناوبردنی ئەوانە تەرخان کرد، کە بەهۆی پلەو پایەو ناوبانگی بنەماڵەکانیانەوە دەکرێنە حاکم، بۆیە لەو کاتەوە ئیتر (موکری)یەکان حاکم بۆ شار دانانێن، بەڵکو لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە، حاکم بۆ سابلاخ دیاری دەکرێ.

ئێستا سێ ساڵە، یەکێکی تەورێزی بەناوی (ڕەشیدولمولك) ئەرکی بەڕێوەبردنی حکومەتی ئەم دەڤەرەی بەئەستۆ گرتووە. خۆیو دەستەیەك لە کارگێڕانی خوارەوەی میری، وەك ڕوخسارو دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندی، لەلایەن خەڵکەوە سەیر دەکرێن. هیچ بنکەیەکی سەربازییش بۆ پشتیوانی لێکردنی لە ناوچەکەدا نییە، تەنانەت لە کۆمەڵانی تەشەیوعیش دوورە. لە مانگی موحەڕەمو ڕەمەزاندا، چەند ڕەوزەخوێنێك بەتایبەتی بۆ سابلاخ دێنن، بۆ ئەوەی ڕەوزەی بۆ بخوێنن. خەڵك لەوە بەخشراون سەرباز بدەنو باجێکی کەمیش دەدەن. ئەگەرچی ئەم خێڵە، ڕێکخستنە سەرەتاییەکانی خێڵەکەشیان لەناوچووە، بەڵام هۆزە چکۆلەکان هەمان نیشانەو دابونەریتی دێرینەیان هەر ماوە. بەڕێوەبردنی خێڵ، ڕێو شوێنی تایبەتیو کارزانیی گەرەکە، پێوەندیی خەڵکی دەشتنشینو کوێستانیی، دەبێ بەجۆرێك بێ، کە دانیشتووانی زۆزان، بەرەو لای تورك نەبات.

بڕینەوەی مووچەو دابەشکردنی نازناو و ناوی ئیفتیخاریی و هەر بەخشینێکی تری پلەو پایەی سەربازیی، بەشێوەیەکی گشتیی، لەو شتانەن، کە دەوڵەت دەیەوێ دڵی خێڵی پێخۆش بکاتو دڵیان ڕابگرێ.

(موکری)یەکان نزیکەی (٥٠٠٠٠ پەنجا هەزار) ماڵو (دێبوکری)یەکانیش (١٠٠٠٠ دەهەزار) ماڵێکن. دێبوکرییەکان چاکترین پشتیوانی دەوڵەتن. ئەمانە لەسەدەی هەژدەهەمدا لەبەر هەژاریی‌و نەداریی‌و بەناچاریی، ناوچەی (دیاربەکر)یان جێهێشتووەو دوای ئەوەی بەناو خاکی (موکری)یەکاندا تێپەڕیون، لە ئاقاری زەریاچەی (ورمێ) نیشتەجێ بوون. بەهۆی لێوەشاوەییانەوە سەرانسەری دەشتی (شارویران) بۆتە مولکیان. ئێستاکە (٢٠٠ دووسەد) ئاغای گوندیان هەیە. یەکە دەوڵەمەندترینیان (قادر ئاغا)یە، کە سەرلەبەری ئەم دۆڵە، تا دەم دەروازەی شاری سابلاخ، بێ سێ‌ودوو، مولکی ئەوە. پێوانەی ملکەچکردنی (موکری)و(دێبوکری)، بۆ دەسەلاتی ناوەندی، هەرچەندێك بێت، بەلام زۆر بەتوندی دەروەستی وەفادارین بۆ ڕەگەزی کوردانەیان. حەزیش دەکەن هەمیشە بە زمانی تایبەتی خۆیان بئاخێون. لەبەرئەوەش کە (کوردی)، زمانێکی ئێرانی یە، بۆیە زیاتر دەخوازن (فارسی) فێربن، نەك (تورکی).

نزیکەی شەش ماڵێکی ئەرمەنی‌و چەند ماڵێکی کلدانی، بەوپەڕی ئەرخایەنی‌و بێ پەژارە، لەناویاندا دەژین. ئەمانە بەتایبەت لە (سایەن قەلا)[11] و (میاندواو) و (سەردەشت)دان، کە بە وردەواڵە فرۆشتن‌و کار و کاسبی، بژێویی دابین دەکەن.

لە سابلاخ دا بازاڕ بەدەستی کوردو جوولەکەوەیە، چەند کەسێکی (تەورێزی)یشی تێدایە، ژمارەیەکی تری خەڵکی وەك، مووسڵی، عەرەب، کلدانی و (ژاکۆبیت)[12] یشی تێدایە، کە خەریکی کڕین‌و فرۆشتنن.

(ژاکۆبیت)ەکان لەڕێگەی (ڕەواندز)ەوە کوتاڵی خوری‌و ئاوریشمی دەستکردی (سووریا) بۆ سابلاخ دێنن. هەموو پێویستییەکانی تری سابلاخ، لە تەورێزو هەمەدان‌و بەتایبەت لە(ئەردەبێل)ەوە دابین دەکرێ.

کوێستانەکانی نێوان(بانە)و (سەردەشت)، لێڕەوارێکی گەورەیە، جیوەو مازووی ئەم دارستانە چڕەیە، کە بازرگانانی خۆماڵی _ بۆ دەرەوەی ولاتی دەنێرن، لە ڕێگەی(ئاستارە)وە بۆ ڕووسیا دەچێ. هەروەها ئەو شتانەش کە لە دروستکردنی (ڕەنگ)دا بەکاری دەهێنن، هەر لەم دارستانە دابین دەکرێ، کە بۆ بازاڕی پیشەسازیی تەورێز و هەمەدان دەینێرن.

(موکری) و (دیبوکری)یش وەك کوردانی تر، سوننی شافیعین. ئەمانە کەمتر گوێ بەو مەلایانە دەدەن، کە لەلایەن دەوڵەتەوە دادەنرێن. (مەلا محەمەد)ی موکری، کە موفتی ئەم ناوچەیەیە، دەڵێت: باوباپیرانیشی سەرۆکی ئاینیی سەرومڕی کوردستان بوون، بەڵام وردەوردە دەوریان بەسەرچووەو تەنیا ناوچەی سابڵاخیان بۆ شەرعو دادوەریی لەژێر دەسەڵاتدا ماوە. سەرەڕای ئەمەش کە دانانی قازیی شەرعو پێشنوێژی مزگەوتەکان، بەدەست حاکمە، بەڵام هێشتا (مەوقوفات) هەر لەژێر دەسەڵاتی (مەلا محەمەد)دایە، کە مەسرەفی مزگەوتو فێرگەکانی پێ دەکات.

لە وڵاتانی سوننی دا، تەریقەتەکانی (سۆفیگەریی)باوە. . (سەیید کەریم نەقیب) ڕێبەری تەریقەتەکانە. دوو تەریقەتی (نەقشبەدی)و (قادری) پێشبڕکێی وەرگرتنی مرید لەدەوری خۆیان دەکەن. لەبەرئەوەی ژمارەی مریدەکانی نەقشبەندی زۆرترە، دەوڵەت لایەنگریی لە (قادری)یەکان دەکاتو پشتیوانیی لە ڕێبەری ئەم تەریقەتە دەردەبڕێت.

زۆربەی سەییدەکان، پێشینەی خۆیان بۆ سەر سەیید عەبدولقادری گەیلانی(١٣) دەبەنەوە. دەستەیەکیش بۆ ئەوەی خەڵك بچنە ڕیزی مریدەکانی(شێخی بوخارا)ی نەقشبەندی(١٤)، پلەو پایەی ئەو پیاوە موقەدەسە بەغداییە ڕەت دەکەنەوە. لەلایەکی ترەوە کەسێك هەر تەنیا لەبەرئەوەی خۆی بە وەچەی پەیامبەر بزانێ، نابێ خۆی لە خاوەن دەسەڵاتو دەشتڕۆیشتوو بژمێرێت.

کوردەکان پێیان خۆشە هەر گوێڕایەڵیی شێخانی خۆیان بن، کە لە قوتابخانە بەناوبانگەکانی کوردستان، یان لە قوتابخانەکانی دەراوی (فورات) دەرسیان خوێندووەو بە نیشاندانی زانیاریی‌و زانست، جێی خۆیان لە دڵی مریدەکاندا کردۆتەوە. گەیشتن بەپلەو پایەی ئاوا باڵا، پێوەندیی بە خزمو کەس‌و نەژادو شتی واوە نییە.

لەم ڕۆژەدا دوو کەسایەتیی مەزن، لەم مەڵبەندەدا هەن، یەکێکیان پیرێکی نابینایە، ناوی (شێخ شەمسەددین شەریف کەندی)و ئەویتر (شێخی زەنبیل ـ حاجی سەیید عەبدولکەریم)ە(١٥). یەکەمیان (٣٠٠٠٠ سی هەزار) کەس‌و دووەمیان (٥٠٠٠٠ پەنجا هەزار) مریدی هەیە، هەردووکیشیان سەر بە تەریقەتی

نەقشبەندین. دەستەکیش لە مریدان، کە لەگەڵ سەییدەکاندا ناسازن، لەدوای مەرگی ئەم دووانەو بەپێودانی ئیمامزادە، مەزارو بارەگایان بۆ دروست کردوونو زیارەتیان دەکەن.

(ڕەشیدولمولك)ی حاکمی سابلاخ، میوانداریێتی کردم[١٦]. پیاوێکی کەم تەمەنە. زۆر تەڕپۆشو جوانخاسو قۆزە. خانووە گەورەکەی لە کەنار چەمەکەدایە. دەستەیەك لە (قادری)یەکان، لەگەڵ سەردەستەکەیاندا بۆ ماڵی حاکم هاتوون، تا لە باخچەی ماڵەکەیدا، کەراماتی خۆیان بنوێنن. . چوار دەروێش دەستیان بە تەپڵ کوتان کرد، ئاگرێکی گەورەیان کردەوە، دەروێشێك زەرگێکی سوورەوە کراوی بە ددان گرت، یەکێکی تریان نووکی خەنجەرەکەی لەسەر ڕوومەتی توند کرد. وای دەنواند کە خەنجەرەکەی پێدا دەکات.

دوای نیوەڕۆ، بەوهۆیەوە کە ئافرەتی کورد، پێیان شەرمە لەبەرامبەر بیانیدا هەڵپەڕن، دەستەیەك لاوی ئیسرائیلی، لەجیاتی ئەوان، بەدڵ دەستیان بە هەڵپەڕینی (چۆپی)کرد. ئەم هەڵپەڕکێ میللییە، بەدەنگی دەهۆڵو زووڕناوە دەست پێدەکات، کە بریتییە لە شەکانەوەی لەسەرخۆی لەش، لەگەڵ هەنگاوێك بۆ پێشەوەو هەنگاوێك بۆ دواوە، بەرێکوپێکی، ژنو پیاو دەستی یەکتر دەگرنو بەوجۆرە پەیتا پەیتا دووبارەی دەکەنەوە. هەموو جلو بەرگی (کوردی)یان لەبەر کردبوو، کراسی ژنان، چین چینو کولۆنجەی زەڕی، یان قەیفە (مەخمەڵ)یان لەبەردایە. . سەرپۆشو ڕووسەری سپی... گوڵ وردیان بەسەرەوەیە، کە توند بەسەریانەوە گرێی دەدەن. هەوری، یان ملپێچێکی ڕەشی ئاوریشم، لەشێوەی خاچدا (چەپ و ڕاست) لە ئەستۆ دەئاڵێنن. گوارەی گەورە لەگوێ دەکەن، گەردنبەندیش، کە لە (تاکەو جووتەیە ـ جۆرە سکەوپارەیەك بووە) دروست دەکەن، لەخوارەوە بەژێرچەنەو لەسەریشەوە بە (ڕووسەرەکانیانەوە) هەڵدەواسن. جگە لە (ژێرچەنە)، (بەرسەرە)ش دەبەستن. ڕوومەتیان سووراووسپیاو دەکەن. جووت برۆیان بە خەتێ بەیەکەوە دەگەیەنن. دەستەیەکی تری لەمان شۆختر، بە قوماشێکی ڕەشی سێ گۆشە، تا خوار چاویان داپۆشیبوو.

بۆ شەوێ، بۆ ئەوەی من خۆشم لێ بگوزەرێ، حاکم (ڕەشیدولمولك) داوای کرد بەزمی گۆرانیو موزیك ساز بکرێ. دوو گۆرانیبێژی بەناوبانگی شار: (سەعید)و

(ئەحمەد ئەمین) هاتن. هەردووکیان خەنجەریان لەبەر پشتێندا بوو. شەدەی شینیان لە دەوری کڵاوە قووچەکانیان ئاڵاندبوو. بەتارو دەمبگەوە چوونە لای سەرەوەو وەژوور کەوتن.

********

**شیعر و موزیکی کوردی:**

کورد، بەهۆی بنەمای نەژادی خۆرهەڵاتییانەیانەوە، زەوق‌و توانایەکی تایبەتیان بۆ فێربوونی شیعر و موزیك هەیە. گۆرانیبێژ، یان(قۆرانیبێژ)، بەیتگەلی شاعیران، ماڵەو ماڵ دەگێڕن. . ئەمانە لەڕۆژدا، هەریەکەیان خەریکی کارێکە... بەڵام هەر کەشەو دادێت، هەریەك لەمانە دەبنە موزیکژەن‌و گۆرانیبێژ.

بەڕواڵەت وا دیارە کورد لەڕابردوودا گۆرانی‌و موزیکی تایبەتیی خۆی هەبووە، کە ئاوازەکانیان کرژو شیعرەکانیشیان، شیعری نەتەوەیەکی دلێرو جەنگاوەر بووە. یەکجار هەست بزوێن‌و ئاگراوییە، بەڵام لە هەلومەرجی ئەمڕۆدا، هێرشی موزیکی عەرەبی، زەبرو جێپەنجەی خۆی لەسەر داناوەو تین‌و تاوی ڕەسەنایەتیی لێ داماڵیوە. ئاوازەکان بێئەوەی شەوق‌و زەوق ببزوێنن، بوونەتە ئاخ‌و ئۆفی بێ بڕانەوە. زۆربەی شیعرەکانیش، باسی ژن‌و شەراب‌و گوڵن‌و هیچ جۆرە باسێکی نوێ‌و جوانیان تێدا نەماوە. ئەدەبی ئێستایان لاسایی کردنەوەیەکی کوێرانەی غەزەلە عاشقانەکانی عەرەبە، کە لەناویاندا جگە لە وشەی کوردی بەولاوە، هیچ جۆرە گیان‌و سیمایەکی نەتەوەیی‌و ناونیشانێ لە (گەل)یان و ڕەسەنایەتیی کوردانەیان تێدا بەدی ناکەیت... سەرەڕای ئەمەش، هەموو زمانێك، گەنجینەیەکی پڕ بایەخی گۆرانیی میللی خۆی هەیە.

ئەمەش وەرگێڕدراوی دوو نموونەیە، لەو گۆرانییانەی کە لاوانی (موکری) بۆمانیان چڕیوە:

**تەختی سینەت، پرتەقاڵی تەڕو تازەیە**
**جێ خەوی شیرینو دڵنشینو دڵنیاییە**
**عاشقی چاوی جوانی تۆ بووم**
**دڵم دەیەوێ بە زمانی تارم**
**سەبارەت بەو جوانییانە، گۆرانییەك بچڕم**
**خودایە! فریای دڵم بکەوە**
**دڵارامی شیرینم لەدەست چوو**
**عاشقی ئەو ئەبرۆ و باڵابەرزەی تۆ بووم**
**ئەم مانگە، مانگی مەولوودی پێغەمبەرە**
**مانگی بووکێنیو دڵارامی منیش، هەر لەم مانگەدایە**
***********

**قوڵپی گریان گەرووی گرتووم**
**عەرەقو شەراب مەستی نەکردم**
**بە تەنیا چاوی کاڵی تۆ، مەستی کردین**
*************

**لە (سلێمانی) وەدەرکەوتم**
**لە گوڵەزەردان وەسەرکەوتم**
**بەشوێن کۆچی لەیلا کەوتم**
**ئاخ، هات ڕابوورد، گەردن بەخاڵ[(١٧)]**
**********

**لە سلێمانی، ڕەشەبا و تۆزو بایە**
**بەتەختی سینەتا(دۆڵی کاروان کوژە) تێدەپەڕێ**
**بەر لەوەی بمرم، بەخەنجەرەکەت بمکوژە، با ڕزگارم بێت**
***********

**نالی:[١٨]**

له دەوروبەری نیوەی سەدەی ڕابردوودا، شاعیرێکی گەورە لەناو کورددا هەڵکەوت، که ناو و ناوبانگی له چوارچێوەی هۆزو خێڵو زێدەکەی خۆی زۆر پتر تێپەڕاند. ئەم شاعیرە ناوی (نالی)و مەلایەکی خەڵکی (سلێمانی)یە، که له قەڵەمڕەوی کوردستانی تورکیادایه، که ئەمڕۆ شیعرەکانی له دوورترین خڕ و شیو ودۆڵەکاندا، وێردی سەر زمانی هەموو کوردانه.

ئەم شیعرانەی ژێرەوە(هی ئەون ـ نالی) و (موفتی)ی ساباڵاخ لەبەر ئێمە، بۆی وەرگێڕاین:[١٩]

**زوڵفت به قەتدا که پەرێشانو بڵاوە**
**ئەمڕۆ له منی شیفتە ئاڵۆزو بەداوە**
**ئەم عومرە عەزیزە که له بۆت نەقدو دراوە**
**سەد حەیفو درێغا که موسوڵمانی نەماوە**
**عومرێکی درێژە به خەیاڵی سەری زوڵفت**
**سەوداوو پەرێشانمو سەودایەکی خاوە**
**هەرچەندە که ڕووتم، بەخودا مائیلی ڕووتم**
**بێ بەرگییە عیللەت، که هەتیو مەیلی هەتاوە**
**(مانی) نییەتی قووەتی تەصویری برۆی تۆ**
**ئەم قەوسە بەدەستی موتەنەففیس نەکشاوە**
**بۆچی نەگریم، سەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی!**
**بۆ مەی نەڕژێ، شیشە له سەد لاوە شکاوە؟**
**بێ فائیدەیە مەنعی من ئێستاکە له گریان**
**بۆ عاشقی بێ چارە زووەم ئاوە ڕژاوە**
**هەر جۆگەو جێگێکی کەوا سوورو سوێر بێ**
**جێی جۆششی گریانی منەو خوێنە ڕژاوە**

**سۆزی دڵمە باعیثی تاوو کوڵی گریان**
**مەعلوومە کە ئاگر سەبەبی جۆششی ئاوە**
**(نالی) وەکو زوڵفت کە موطیعی بەری پێتە**
**تێکی مەشکێنە، بە جەفا مەیخەرە لاوە** [٢٠]

دووەم پارچە شیعرێکی کە وتیان، ئەمە بوو:

**سەری زوڵفت کە ڕشتەی عومری خضرە،نیوە هەودایە**
**چ هەودایە؟ کە هەر حەڵقەی دووسەد زنجیری سەودایە**
**برۆت تیغێکە وسمەی صەیقەڵو مەسلووڵو مووکارە**
**کە عیشوەی جەوهەرە، ڕەمزو ئیشارەی ئاوی مەودایە**
**بەنەشئەی سستی یو مەستیی وەها مەستوورو مەخموورە**
**نزانم! خەو لەچاوتدایە، یا چاوت لەخەودایە!**
**لە سایەی کوفری زوڵفت، دڵ (فنا فی النور)ی ئیمانە**
**مەڵێن ظوڵمەت خراپە، وەصڵی پەروانە، لەشەودایە**
**هەناسەم زوڵفەکەی لاداو مەیلێکی نەکرد چاوی**
**نەسیم ئەنگووتو شەو ڕابووردو نەرگس هەر لەخەودایە**
**لەدووریی تۆیە ئەی خورشیدی پڕتەوبەخشی شەوگەردان**
**کە (نالی) وا لە حاڵاتی میحاقی ماهی نەودایە**[٢١]

*********

هەر ئەم باڵیۆزە، لەتەك ناوهێنانی (**نالی**)دا، پەراوێزێکی داناوەو لەدامێندا ئەمەیشی لەسەر (**نالی**) نووسیوە:

(**نالی**) شاعیرێك بووە، نازناوی خۆی لە کرداری (ناڵاندن)[٢٢] هەڵبژاردووەو لەپاڵ ئەوەشدا کە شیعری بە زمانی کوردی نووسیوە، وەك دەڵێن هەندێکیش ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردی کۆکردوونەتەوە.[٢٣]

*************

شاعیری ناسراویش **هێمن موکریانی** (١٩٢١ـ١٩٨٦) ئەم سەفەرنامەیەی دیوەو دوای خوێندنەوەی، نووسیوێتی:

ئەم دیپلۆماتە لە ساڵانی (١٩٠٦ـ١٩٠٧)دا، بە سابلاخ دا تێپەڕیوەو چەند لاپەڕەیەکی ناشیانەی لەسەر ژیانی کوردی ئەم مەڵبەندە نووسیوە، کە سەرنج ڕاناکێشن. تەنیا ئەوەندەی سەرنجڕاکێشە، کە لەبارەی (**نالی**)دا نووسیوێتی.[٢٤]

**********

**ئەنجام:**

وەك سەرنج دەدەین لەڕێگەی سەفەرنامەی ئەم باڵیۆزەی فرەنساوە، دوو زانیاریی سەرنجڕاکێشمان پێدەگات، کەبریتین لە:

١- هێشتا (**نالی**) خۆی لەژیاندا بووە، کە ناوو ناوبانگی، لە چوارچێوەی هۆزو خێڵو زێدەکەی خۆی زۆرپتر تێپەڕاندووە.

٢- (نالی) لەپاڵ ئەوەشدا کە شیعری بە زمانی کوردی نووسیوە، هەندێکیش ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردی کۆکردۆتەوە.

هەڵبەتە دەبێ بزانین کە سەرچاوەکانی زانیاریی ئەم باڵیۆزەی فرەنسا لەمەڕ (نالی)، هەر (مەلا محەمەد)ی(موفتی) سابلاخە، کە بێ هیچ سێو دوویەك ئەم مەلا محەمەدەی (موفتی) سابلاخ، نالی ناسو نالی دۆستێکی زۆر شارەزا و ئاگاداربووە لە شیعر و ژیانی (**نالی**)و تەرجەمەکردنی شیعری ئەم گۆرانیبێژانەش بۆ باڵیۆز، کە شیعری (**نالی**)ن، نیشانەو بەڵگەی ئەوەن، کە (مەلا محەمەدی موفتی سابلاخ)، هاوڕێی بەردەوامی شیعری (**نالی**)یەو بەو پێیەش کە وەك هەر خۆیشی (مەلا محەمەد) بۆ باڵیۆزی گێڕاوەتەوە، کە بابو باپیرانیشی، سەرۆکی ئایینی کوردستان بوون، ئەوا دیسان (مەلا محەمەد) هەر لە منداڵییەوە پەروەردەی زانیارییو باسو خواسەکانی ناو مزگەوتە، کە بێگومان باسو خواسی شیعرو داهێنانە جوانەکانی (**نالی**)ش، لەو ڕۆژگارەدا، کە (وەك وتمان) سنووری ناوچەو زێدەکەی خۆی تێپەڕاندووە، لای شیعردۆستانی (موکریان)یش، کە زۆرینەیان خوێندەواری ناو مزگەوتەکانی کوردستان بوون، لای (مەلا محەمەدی موفتی سابلاخ)یش لەدەمێکەوە ناسراوە. بەتایبەتیش ئەگەر لێرەدا ئەوەمان لەیاد بێ، کە مەلا محەمەد، (موفتی) سابلاخە، ئەوا دەبێ تەمەنیشی هەڵکشاو بێو لەکاتی سەردانی ئەم باڵیۆزەی فرەنساشدا بۆ سابلاخ (١٩٠٦)، مەودای نێوان کۆچی دوایی (**نالی**:١٨٧٣)، تا (١٩٠٦)، هەر نزیکەی (٣٣ سیوسێ) ساڵ دەبێو ئەم نزیکەی (٣٣) ساڵەش، بۆ تەمەنو بیرەوەریی، کەسێکی بەتەمەنی وەك مەلا

**محەمەد**، زۆر نییەو **خاڵی** دووەمی ئەو زانیارییەش، کە **(نالی)** لەپاڵ ئەوەدا شیعری بە زمانی کوردی نووسیوەو هەندێکیش ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردی کۆکردۆتەوە، ئەمەیان یەکجار تازەو گرنگەو ئەم زانیارییەش (وەك لەسەرووتر وتمان)، هەر سەرچاوەکەی (مەلا **محەمەد**)ەو دەبێ ئەو هەندە ئەدەبی فۆلکلۆرەش، کە **(نالی)** کۆیکردوونەتەوە، هەر ئەدەبی فۆلکلۆری دەڤەری (موکریان) و بەتایبەتیش ژانری (بەیت)ەکانی موکریان بێ، کە ئەگەر لەم زانیارییانەدا، باس لە ئەدەبی فۆلکلۆری موکریان نەبووبێ، بەلای (مەلا **محەمەد**)و خوێندەوارانی موکریانەوە، جێی بایەخ‌و گرنگی پێدان نەبووە... هەرچەندە ئەم جۆرە گریمانانە، بەڵگەو نموونەو لێکۆڵینەوەی زۆر قووڵترو فراوانتری دەوێ، کە وەك لەسەرەتای ئەم لاپەڕانەدا وتمان: ئەم بابەتە، بۆتە کەرەسەو هەوێنی بەرهەمی کتێبێکی داهاتووم.

## پەراوێز:

١. ئەلیکساندەر بۆریژکۆ خۆدزکۆ: لە ٦ی تەمووزی ١٨٠٦، لە پۆڵەندە بەدنیا هاتووە. یەکەمین ئەوروپاییە کە لە فۆلکلۆری فارسی کۆڵیوەتەوە. ساڵانی ١٨٢٠ـ١٨٢٣ لە زانکۆی (wilho/vilna)ی ناوەندی خۆرهەڵاتناسیی زمانو ئەدەب لە پۆڵەندە خوێندوویەتی. ساڵانی ١٨٢٤ـ١٨٣٠ لە سان پیترەسبورگ، زمانەکانی عەرەبی، فارسی، تورکی دەخوێنیو دواتر وەك وەرگێڕ، ڕەوانەی ئێران دەکرێو لەگەڵ میسیۆنی ڕووسی لە تەورێز و تاران کار دەکاتو پاشان وەك کونسڵی ڕووسیا، لە کونسڵخانەی ڕووسیا لە (ڕەشت) کاردەکاتو تا ساڵی ١٨٤١ لە ئێران دەمێنێتەوەو دواتر لە یۆنانو ئیتالیا کار دەکات. هەر لەو ساڵەدا واز لە کاروباری دیپلۆماتی ڕووسیا دەهێنێو ساڵی ١٨٤٨، لە زانکۆی (کۆلیژ دوفرانس)، کۆرسی زمانی فارسیو لە کتێبخانەی شاهانەش پۆستی (تورکی) وەردەگرێ. لەنێوان ساڵانی ١٨٥٢ـ١٨٥٥، لە وەزارەتی هەندەرانی فرەنسا، وەکو پسپۆڕی کاروباری خۆرهەڵات کاری کردووە. ساڵی ١٨٥٦ لە ئەنیستیتۆی زمانەکانی خۆرهەڵات لە پاریس، داوای لێدەکەن زمانی فارسی بڵێتەوە. (خۆدزکۆ) زۆر بەزمانو ئەدەبیاتی فارسی سەرسام بووە، بەتایبەتیش بە شانۆی فارسیو ساڵی ١٨٤٤ـ١٨٤٥ کتێبی (شانۆنامەی ئێرانی: هەڵبژاردەیەك لەپرسەنامە)ی نووسیوەو کۆمەڵێکیش شانۆنامەی فارسی کردۆتە زمانی فرەنسی، کۆمەڵێکیش بەرهەمی لەبواری زمانەوانیو فیلۆلۆژی زمانەکانی خۆرهەڵات نووسیوە. جگە لەمانە، خۆدزکۆ کۆمەڵێك وتار و لێکۆڵینەوەی لەبارەی خۆرهەڵاتەوە نووسیوە.

سەرچاوە: بەدەستکارییەوە لە: ئەلیکساندەر خۆدزکۆ، چەند لیکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆژی دەربارەی زمانی کوردی (دیالێکتی سلێمانی)، وەگێڕانی دکتۆر نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپەمەنی بنکەی ژین، ساڵی ٢٠٠٥، ل٤٢ـ٤٤.

٢. ئەم بەرهەمەی خۆدزکۆ، بووە ئەو کتێبەی لەسەرووتر ئاماژەمان پێکرد.

٣. سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (١)، ل٣٢.

٤. خۆدزکۆ کە نەیتوانیوە دەستی بە (نالی) بگات، بەشێك لە بەرنامەکەی، لەتەك (ئەحمەد پاشا)دا ئەنجامداوە.بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە بنوارِە سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە(١)ی ئاماژەپێکراو.

٥. ئەحمەد پاشا: کورِە گەورەی سلێمان پاشای کورِی ئەورِەحمان پاشای بابانەو دوای مردنی سلێمان پاشای باوکی(١٧٩٠ـ١٨٣٨)، بۆتە فەرمانرِەوانی بابانو تا ساڵی ١٨٤٠و دواییش لە ١٨٤١ تا خاکەلێوەی ١٨٤٢ فەرمانرِەوانی میرنشینی بابان بووەو دواییش لە ئایاری ١٨٤٢تا ١٨٤٦ فەرمانرِەوایی کردووەو دواتر بۆ ئەستەموولْ دوورخراوەتەوەو ساڵی ١٨٥٣، لەسەر بانگهێشتی (خۆدزکۆ) بۆ(پاریس) چووەو هاوکاریی لێکۆڵینەوە ناوبراوەکەی (خۆدزکۆ)ی کردووەو تا ساڵی ١٨٥٥، لە پاریس ماوەتەوەو پاشان بۆ ئەستەموولْ بانگ کراوەتەوەو ساڵی ١٨٥٥ کراوەتە والی (یەمەن)و تا ساڵی١٨٦٣، والی یەمەن بووەو هەمان ساڵ کراوەتە والی (وان)و ساڵی ١٨٦٤ دووبارە کراوەتەوە والی یەمەن (بە پلەی وەزیر)و ساڵی ١٨٦٧ کراوەتە والی ئەرزەرۆم و ساڵی ١٨٧٥ کراوەتە والی (ئەدەنە) و لە کۆتایی هەمان ساڵدا کۆچی دوایی کردوە. (سەرچاوە: بەدەسکارییەوە رِاگوێزراوە، لە کتێبی ئاماژەپێکراوی پەراوێزی ژمارە (١)، ل٤٩-٦٠.)

٦. دۆستایەتی (نالی) و بنەماڵەی ئەحمەد پاشا، دەگەرِێتەوە بۆ پێش رِووخانی میرنشینی بابان و بەڵگەی ئەو دۆستایەتییەش ئەو دوو شیعرەی (نالی)یە، کە یەکەمیان بۆ مەرگی سلێمان پاشا (١٧٩٠-١٨٣٨)ی باوکی ئەحمەد پاشا و لەجێ دانیشتنی ئەحمەد پاشاوە نووسیوێتی و بەم بەیتەش دەست پێدەکات:

**تا فەلەك دەوری نەدا، سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو**
**کەوکەبەی میهری موبارەك، تەلعەتی پەیدا نەبوو**
**دیوانی نالی، ل٣٧٠**

شیعری دووەمیشیان، دوای ئەوەی ئەحمەد پاشا بۆتە فەرمانڕەوای بابان و خەریکی نۆژەنکردنەوەی سوپای بابان بووە، (نالی) ئەم شێعرەی بۆ ئەم سوپایەش نووسیوە، کە ئەمە سەرەتای ئەم شێعرەیە:

**ئەم تاقمە مومتازە، کەوا خاصەیی شاهن**
**ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن**
**دیوانی نالی، ل٣٤٠**

٧. ئەم کتێبە ساڵی ١٣٦٢ هەتاوی (١٩٨٣) بەم ناونیشانە، لە ئێران چاپکراوە:

ایران امروز (١٩٠٦-١٩٠٧) نوشتەی اوژن اوبن، ترجمە وحواشی علی اصغر سعیدی، چاپ نقش جهان، کتابفروشی زوار، تهران.

٨. ئێمە هەموو بەشەکانی (٤)و (١٤)و (١٥) ی ئەم سەفەرنامەیەمان کردۆتە کوردی و لە دەرفەتێکی نزیکدا بە چاپ دەگات.

٩. بەدەسکارییەوە لە کتێبی (ایران امروز)ی ئاماژە پێکراو، ل ١٣، ١٧.

١٠. ئەم ڕاگواستنەوەیەی سەفەرنامەکە، بۆ ئێرە، سەرەتای سەفەرنامەکە نییە، بەڵکو چەندین لاپەڕە و باس و بابەتی تری لە پێشەوەیە، کە ئێمە هەر بە ئەندازەی بابەتەکەی (نالی) و کەمێکیش ڕۆژگاری ئەوسای سابلاخ، بۆ ئێرەی ڕادەگوێزین.

١١. سایەن قەڵا: شاهێن دژ- یشی پێدەڵێن.

١٢. ژاکۆبیت: Jacobites: دەستەیەکن سەر بە یەکێك لە ڕێبازەکانی ئایینی دیان (مەسیحی) ی شام (سووریا)، کە لە سەردەمی شەشەمدا لە لایەن (ژاك باراد)ەوە دامەزراوە.

سەرنج: لەعێراقدا (یەعقوبی) یان پێدەڵێن (و. کوردی).

١٣. عەبدولقادری گەیلانی (١٠٧٨-١١٦٦ز)، زانای مەزن و دامەزرێنەری ڕێبازی (قادری)یە، سەرەتا لای ئەبو زەکەریای تەورێزی زانستەکانی عەرەبی فێربووە و دواتر لە بەغدا (فیقھ و ئوسوڵ) فێربووە.

١٤. شێخی بوخارای نەقشبەندی: مەبەست لە خواجە بەهائەددین محەمەدی بوخارایی نەقشبەندییە (١٣١٨- ١٣٨٨ز) خواناسی ناسراوی سەدەی هەژدەمی کۆچی و

دامەزرێنەری ڕێبازی نەقشبەندییە، کە لە گوندێك بەناوی (کۆشکی خواناسان) بەدنیا هاتوە.

١٥. بەپێچەوانەوە، وەك لەسەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە زانیومە: شێخ شەمسەددین چاوساخ و حاجی عەبدولکەریم نابینابووە.

١٦. سفرە ڕێکخراو و پڕ ناز و نیعمەتەکەی ڕەشیدولمولك، بیوزا: biveza- ی لەسەر دانرابوو، کە ڕووەکێکی لاسك درێژی تایبەت بە چیاکانی کوردستانەو لەگەڵ ماست و سرکەدا تێکەڵ دەکرێ و لەسەر سفرەی خوان دادەنرێ.

سەرنج: (بیوزا)، کە هەر لە کوردستان دەڕوێ، ترشیاتێکی زۆر بەتامی لێ دروست دەکرێ، بۆیە پێدەچێ نووسەریش لەو ترشیاتەی خواردبێ، مەبەستیش لە (بیوزا)، هەر (بیزا) یە.

١٧. هەر بە تەنیا ئەم کۆپلەیەم بۆ برایە سەر شیعرە فۆلکلۆرییەکە.

١٨. لە دەقەکەدا ئەم ناونیشانە بۆ (نالی) دانەنراوە، بەڵکو خۆم بۆ ئەوەم داناوە، تا خوێنەر بزانێ لێرە بە دواوە باسی (نالی) لەم سەفەرنامەیەدا هەیە.

١٩. من نازانم (مەلا محەمەدی- موفتی سابلاخ، بە چ زمانێك ئەم دوو شیعرەی (نالی) بۆ باڵیۆزی فرەنسا وەرگێڕاوە، بەڵام من لە دەقە فارسییەکەوە بۆ کوردی، پشتم بە دیوانی (نالی)، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، فاتیح عەبدولکەریم، محەمەدی مەلا کەریم، چاپەمەنی کۆڕی زانیاری کورد- بەغدا، چاپی ١٩٧٦ بەستووە.

٢٠. دیوانی نالی، سەرچاوەی ناوبراو، ل٥٣٣-٥٣٧.

٢١. سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥٦-٥٦٠.

٢٢. نازناوی (نالی) لە (ناڵین) و (ناڵاندن)ەوە نەهاتووە و (ل)ی (نالی)ش بە (ل)ی کلۆر دەنووسرێ نەك قەڵەو، وەك (نالی) خۆی لەم نموونانەدا دەڵێ:

ظاهیر و باطین لەسەر لەوحی حەقیقەت یا مەجاز
ئاشنای سیڕڕی قەڵەم بێ غەیری (نالی) کەس نەما

لەسایەی قەددی مەوزوون و دوو زولْفی
لە نالی و شیعر و تەسویدی نەما باس

لەگەڵ مورغی چەمەن (نالی) دەناڵێ
کەیانێ: عاشق هەمفەرد و فەردین

روخی تۆ گوڵێکە صەد وەك هوزاری عاشق ئەمما
لەهەموو چەمەن دیارە بە ئوصووڵی ناڵە (نالی)

(نالی) و مەثە لی حاڵی لە ئەشکەنجەیی غەمدا
وەك نالە لە نەیدا، وەکو نالە لەقەڵەمدا

بۆ زولف و روخ و ئەبرووی چون زلفی سیاتان
عالەم وەکو (نالی) هەموو با نالە و ئاهن

نەظمي (نالی) میثلي ئاو ئاوێنە رەنگی نییە
دوو رووە بۆ سەیری خاطر: یەك خەفیی و یەك ئاشکار

بۆ زیاتر زانیاریی بنوارە: دیوانی (نالی)، لێلۆلێنەوەو لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مدریس و فاتح عەبدولکەریم، چاپەمەنی کۆڕی زانیاریی کورد، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٤١ — ل٥١.

٢٣. ایران امروز (١٩٠٦-١٩٠٧) نوشتەی اوژن اوبن، ترجمه وحواشی علی اصغر سعیدی، چاپ نقش جهان، کتابفروشی زوّار، چاپ اول تهران، ١٣٦٢ش، ص١١٨.
٢٣. پێشەکیی چاپی دووەمی دیوانی نالی، کە: انتشارات صلاح الدین ایوبی- مرکز نشر فرهنگ و ادبیات کردی- ١٣٦٤ش لە ورمێ چاپی کردۆتەوە و هێمن موکریانی پێشەکی بۆ نووسیوە.

# مەولانا خالید

# (١٧٧٩ ــ ١٨٢٧ز)

## ڕووناکبیرێکی نوێ بۆ سەردەمێکی نوێ

**سەرنج:**
**ئەم وتــارە لــە فێســتیڤاڵی نێودەوڵــەتیی (مــەولانا خالیــدی نەقشــبەندی)دا خوێندرایەوە، کە لە ڕۆژانی (٢٧ تا ٢٩/٤/٢٠٠٩) لە شاری سلێمانی سازکرابوو.**

## بەشی یەکەم:

دووسەد ساڵ لەمەوبەر، واتە: ساڵی (١٨٠٩ز)، خوێندەوارێکی هەڵوەداو شەیدای زانیاریی‌و خۆپێگەیاندن، بێ گوێدانە مەترسیی‌و چەڵەمەکانی ڕێگەیەکی دوورو نادیدە، چاوقایمانە لە شارەزوورەوە بەڕێ کەوت‌و دوای ڕێکردنی ماوەی نزیکەی ساڵێك(١)، لەبەرەبەیانی ڕۆژی (٢٦ی ذی الحجەی ١٢٢٤هـ-١٨١٠/٢/١ز)دا(٢)، گەیشتە بەر دەروازەی خانەقاکەی شاعەبدوڵڵای دەهلەوی (١٧٤٥-١٨٢٤ز) لە هیندستان‌و دوای حەسانەوەی لە ژوورێکی خانەقاکەدا، داوای کرد بەقوتابی وەربگیرێ، بەڵام پێشەکی‌و سەرچڵانە، داوای لە مامۆستاکەی کردووە، کە ئەگەر ئەم (٣) تکایەم پەسەند نەکەن، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە بەقوتابیم وەرناگرن:

**یەکەمیان:** بەو هۆیەوە کە نیشتمانی خۆم بە (مەولانا خالید)م بانگ دەکەن، دەبێ نازناوی (مەولانا)م لێ داماڵن‌و هەر بە(خالید) بانگم بکەن.

**دووەمیان:** خۆراکم لەگەڵ خۆراکی دەستەی خزمەتگوزاران‌و نۆکەرانی خانەقاکەدا بێ‌و بەچاوی لەوان جیاوازتر سەیرم نەکرێ.

بەپاکەوانی خانەقاکە ڕابگیرێم‌و ئاوکێشیی (شەقایی) خانەقاکەش بەئەستۆی من بسپێرن(٣).

**سێیەم:** بەڵام لە یادمان بێ، ئەو کاتەی (خالید) گەیوەتە هیندستان، هێشتا تازە تەمەنی پێی دەنایە (٣٠) ساڵیی‌و نازناوی (مەولانا)ش، بۆ ئەو تەمەنە کورتە، زۆر جێی لێ ڕامانە، کە دەبێ ڕەوشت‌و پلەوپایەی زانیاریی‌و کۆمەڵایەتیی (خالید)، زۆر پێش تەمەنی کەوتبێ. بۆیە بەزوویەکی زووەوە ئەو نازناوەی لای خەڵکەوە پێ ڕەوا بینراوە. لەم ڕووەوە (مەلا حامیدی کاتب-بێسارانی) لە

یادداشتەکانی خۆیدا لەبارەی (خالید)ەوە دەڵێ: مەولانا خالید بۆ ئەوەی بەئاواتی ئەم سەفەرەی هیندستان بگات، دەستبەرداری هەموو پلەوپایەو دارایی خۆی بووە(٤).. کە لێرەدا دەپرسین: کام پلەوپایەو دارایی؟!

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، هەر یادداشتەکانی (مەلا حامید) وەڵام دەداتەوەو لەچەند جێگەیەکدا، جگە لە نازناوی (مەولانا)، نازناوی (سەرخێل)یشی لەگەڵدا بەکاردەهێنێ(٥).. کە دیارە مەبەستی لە (سەرخێڵ)، دەبێ هەر سەرخێڵی تیرەکەی خۆی (میکاییل) لە هۆزی (جاف) بێ.

مەبەستیشی لە (دارایی) مەولانا خالید، دەبێ ئەوەمان لە یادبێ، کە مەولانا بەرلەوەی یەکەمین سەفەری بۆ (حەج) بکات، ماوەی (٨) ساڵ لە جێی مامۆستاکەی خۆی: شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجەیی، لە مزگەوتی ئەورەحمان پاشای بابان (؟-١٨١٣)، لە گەڕەکی (سەرچیمەن)ی سلێمانی، مامۆستایەتی کردووە، کە داهاتی ئەم کارەی، بەشی ئەوە ناکات پاشەکەوتی زۆری لێ بکەوێتەوە، کەچی (مەلا حامید) ئەوە دەگێڕێتەوە، کە (مەولانا) بۆ ئەم سەفەرەی هیندستان، (٣) ئەسپ بۆ خۆیو دوو هاوسەفەرەکەیو بڕی (٣,٠٠٠) سێ هەزار قرۆشی گیرفانی خۆی پێ بووەو ئەمانەی بۆ ئەم سەفەرە تەرخان کردووە(٦). کە بێگومان بڕی (٣٠٠٠) سێ هەزار قرۆش، لەو ڕۆژەدا، سەرمایەیەکی زۆرەو دەبێ پاشەکەوتی بنەماڵەکەیان بێو بۆ ئەم سەفەرەی (مەولانا)یان ئامادەکردبێ، چونکە بنەماڵەکەیان خوێندەواربوونو بەتەنگ داخوازییەکانی خوێندنی بالاتری مەولاناوە بوون. هەرچەندە لە زۆرینەی ئەو سەرچاوانەی سەبارەت بەبنەماڵەی (مەولانا خالید) ئاگادارییان نووسیوە، هەموویان هەر ئاماژە بەوە دەکەن، کە بنەچەی (مەولانا)، ئایین پەروەربوونو دەچنەوە سەر کام خەلیفەوچیو.. چی..، بەڵام لەمەڕ خوێندەواربوونی بنەماڵەی مەولاناوە بەگشتیو بەتایبەتیش لەمەڕ (باوکی مەولانا)وە، جگە لە یادداشتەکانی (مەلا حامید)، لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا، باسی خوێندەواربوونی باوکی مەولانا نەکراوە، بەڵام (مەلا حامید) دەگێڕێتەوە: ئەو کاتەی مەولانا بەمنداڵیی بۆ بەر خوێندن نراوەو مامۆستاکەی سورەتی (فەتح)ی پێ

تەواوکردووەو بەو قۆناغە دەڵێن: مریشکە ڕەشەو ئەو کاتەش وا باوبووە، ئیتر دەبێ ئەو منداڵە، مریشکێکی ڕەش بەدیاری بۆ مامۆستاکەی ببات‌و مامۆستاکەیشی ئەمەی بەدەمیی بە مەولانا ڕاگەیاندووە، مەولاناش بەمامۆستاکەی وتووە: من لە ڕووم نایەت ئەمجۆرە داوایانە بەباوکم بگەیەنم، بۆیە تکای لە مامۆستاکەی کردووە، تا خۆی بە (نووسین) ئەم داوایە بۆ باوکی مەولانا بنووسێ‌و باوکیشی لە ڕێگەی خوێندنەوەی نامەکەوە، لە داخوازیی مامۆستاکەی گەیشتووە(٧).. لەمەوە تێدەگەین کە بنەماڵەی مەولانا خوێندەواربوون‌و پەرۆشی پێگەیاندنی مەولانا بوون. هەرچەندە ئەم سەفەرەی مەولانا بۆ هیندستان، لەو ڕۆژەداو لەو تەمەنە کورتەدا، لەو جۆرە گەڕان‌و سەردانە ئاساییانە نەبووە، کە فەقێکانی ئەو سەردەمەی کوردستان، هەر تەنیا لە قەڵەمڕەوی کوردستاندا گردوویانە. بۆیە ئەم سەفەرەی مەولانا بۆ هیندستان، بۆ ئەو ڕۆژگارە، لەسەفەرە دەگمەن‌و پڕ مەترسییەکان بووە، بەڵام بۆ کەسێکی وەك مەولانا خالیدی سەر پڕ لە سەوداو بەرنامەو خەونی گەورە، کە نەك هەر خوێندنگەو کتێبخانەو زانیارییەکانی ئەو ڕۆژگارە، تینوێتیان نەشکاندووە، بەڵکو وەك خۆی دەڵێ: تەنانەت شوێنە پیرۆزەکانی وەك (مەککە)و (مەدینە)ش، گرێی دڵی ئەویان نەکردۆتەوە(٨):

**در شام و مکه ات گره از کار وانشد**

**من بعد صبح راه بره هند و شام کن(٩)**

کە ئەم ڕۆحە بێ ئۆقرەو نائارام‌و دانەساکاوە، بەرامبەر ئەو واقیعە زامدارو چەقبەستووە، هەمان ڕۆحە یاخی‌و دەستەمۆ نەبووەکەی حەللاج (٨٥٨-٩٢٢ز)مان بەیاد دێنێتەوەو ئەویش هەر لە بارەی ڕۆحە یاخیبووەکەی خۆیەوە دەڵێ:

**به مذهب صلیب می بمیرم، نه مکه جویم نه مدینه(١٠)**

سەمەرە لەوەدایە هەمان ئەو مامۆستا (شاعەبدوڵڵای دەهلەوی)یەی، کە مەولانا لە سەرەتای چوونیدا بۆ خزمەتی لە هیندستان، تکای لێکردبوو نازناوی (مەولانا)ی لێ دابماڵێ، تا بەهۆی ئەوەوە، خەڵکانی تریش چاوی لێ بکەنو هەر بە(خالید)ی بانگ بکەن، کەچی هەر ئەم مامۆستایە، دوای ساڵێكو (٣) مانگ، کە (خالید) لە خزمەتیدا قوتابی بووەو زانیارییەکانی خانەقاکەی پێ تەواوکردووە، لەسەرەتای ئیجازەنامەکەی (خالید)دا، ئاوا دەنووسێ: بعد حمد وصلوات، فقیر عبدالله نقشبندی مجددی-عفی الله-گزارش می نماید که سرامد علمای دین و گزیدء طالبان راه حق الیقین: حضرت مولانا خالد- سلمه الله تعالی- برای طریقةء نقشبندی، از ملك کردستان ترد این فقیر رسید(١١)..

واتە: دوای سوپاسو سەڵاوات، عەبدوڵڵای هەژاری نەقشبەندی موجەدیدی، ڕادەگەیەنێ، کە سەرباشقەی زانایانی ئایینو هەڵبژاردەی خوازیارانی ڕێگەی ڕاستییو دڵنیایی: حەزرەتی مەولانا خالید، بۆ بەدەستهێنانی تەریقەتی نەقشبەندی، لە خاکی کوردستانەوە بۆ لای ئەم هەژارە هات..

وەك سەرنج دەدەین جگە لەوەی نازناوی (مەولانا)، بەناوی (خالید)ەوە دەلکێنێتەوە، نازناوی (حەزرەت). سەرباشقەی زانایانی ئایینو هەڵبژاردە-ش بە (مەولانا خالید) زیاد دەکات.. کە دیارەئەم پێ شیاو بینینە، لەلایەن کەسێکی وەك ئەم مامۆستا ناودارو هوشیارەی مەولانا خالیدەوە، هەروا لە خۆڕا نەهاتووە، بەڵکو لە ئاکامی هەڵسەنگاندنی سەرومڕی ئاکارو دانایییو لێهاتووی (مەولانا خالید)ەوە سەرچاوەی گرتووە.

هەر لە پاڵ ئەم ڕێزلێنانەی کەسایەتی (مەولانا)دا، ئاماژەش بەنیشتمانی مەولانا خالیدن واتە: کوردستان دەکاتو دەنووسێ: حەزرەتی مەولانا خالید، بۆ بەدەستهێنانی تەریقەتی نەقشبەندی، لە خاکی (کوردستان)ەوە بۆ لای ئەم هەژارە هات.. کە ناوی خاکی (کوردستان)یش لەم ئیجارەنامەیەدا، لە ئەنجامی ئەو سۆزو تاسەو حەسرەتە فرمێسکاوییانەی مەولاناوە بەدیکراوە، کە مەولانا لە ماوەی ئەو ساڵو سێ مانگ دابڕانەیدا لە کوردستان، وەك دڵدارێك بۆ کوردستان دەنوارێ، کە لێی دابڕاوەو بێ پەروا لەکۆڕو

کۆبوونەوەکانی خانەقاکەی هیندستاندا، باسی دەکات‌و شیعری فرمێسکاویی بەیادی نیشتمانەوە دەنوسیٚ‌و بۆ شیعر دۆستانی ناو خانەقاکەی دەخوێنێتەوە.

دیسان هەر شاعەبدوڵڵای دەهلەوی، لە ئەزموون‌و هەڵسەنگاندنی ئەو ماوەی ساڵ‌و سیٚ مانگەی، کە مەولانا لە خانەقاکەیدا بووە، بەجۆرێك دڵبەستەو هۆگری ڕەوشت‌و لێزانیی (مەولانا) بووە، کاتیٚ مەولانا خوێندن تەواو دەکات و ئیجازەنامە وەردەگریٚ و بڕیاری گەڕانەوەی بۆ (کوردستان) دەدات، شاعەبدوڵڵا دادەخورپیٚ‌و چەندان جار تکای زۆری لێدەکات، تا لای خۆی بیهێڵێتەوە.. تەنانەت تکای ئەوەی لێدەکات بیکاتە جێگرو نوێنەری خۆیشی، بەڵام مەولانا دڵی هەر لای نیشتمان دەبیٚ‌و ناتوانیٚ خۆی ڕازی بکات‌و بمێنێتەوە.. کەچی شاعەبدوڵڵا هەر دەستبەرداری نابیٚ‌و بەبیانووی بەڕێکردنییەوە، کە تا قۆناغەڕێیەك، بۆ ڕێزلێنان لەگەڵیدا چووە، بەردەوام بەدەم ڕێگەشەوە، هەر تکای گەڕانەوەی لێکردووە(١٢).

جگە لەمانەو دوای گەڕانەوەی (مەولانا)ش بۆ کوردستان‌و لە یەکتر دوورکەوتنەوەی ئەم قوتابی‌و مامۆستایە، شاعەبدوڵڵا نامەش‌و دەنگیشی لە (مەولانا) دانەبڕیوەو هەتا لە ژیاندابوون، نامەی گەرم‌و بەسۆز لە نێوانیاندا بووە(١٣).



مەولانا، لەگەڵ گەڕانەوەی خۆیدا لە هیندستانەوە بۆ کوردستان، ئەو شیعرانەیشی هێنایەوە، کە لە ماوەی مانەوەیدا لە هیندستان، بەیادی نیشتمانەوە نووسیبوونی‌و دیسانەوەش لە وڵات، لەناو کۆڕوکۆبوونەوەکانی شیعر دۆستاندا، بەگەرمەوە لە ئامێزگیران‌و دەستاو دەستیان پێکراو لەلایەن شاعیرانیشەوە کرانە دەستەچیلەو سەرمەشق[١٤]، بۆ هێنانەکایەی زەمینەی بزووتنەوەیەکی تازەی ئەدەبیی‌و شیعریی، کە دواتر بەئەدەب‌و شیعری قەڵەمڕەوی بابان ناسراو (سالم)و (کوردی)، پێشەنگ‌و دامەزرێنەرەکانی بوون.

بەڵام (مەولانا) بەرلەوەش سەفەری هیندستان بکات‌و لە کوردستان دووربکەوێتەوە، بەهەمان هەستی بەکوڵەوە، شیعری بۆ خۆشەویستیی نیشتمان‌و

سەروەرییەکانیو شەهیدانی نووسیوە، کە سەرلەبەری شیعری ئەم قۆناغەی، تایبەتن بۆ بۆنەی گەورەو کارەساتو ڕووداوی چارەنووسسازو خەمو شادیی خەڵکەوە، وەك ئەوەی شیعری بۆ ئیبراهیم پاشای بابان (؟-١٨٠٢ز)[١٥]ی بناغەدانەری شاری (سلێمانی)و بۆ کوژرانی (سەلیم بەگی بابان-؟-١٨٠٦ز)ی برای ئەوڕەحمان پاشاو میرێکی تری بابانی، بەناوی: میر عوسمان (؟-١٨٠٦ز) نووسیوە[١٦]، کە ئەم دوو میرەی بابان، ساڵی (١٨٠٦ز)، لە نەبەردێکی زۆر جوامێرانەو کەم وێنەدا، هێرشێکی غافڵگیرانەیان بەسەرکردایەتی ئەوڕەحمان پاشا، کرۆدتە سەر بەشێکی زۆری سوپای والی بەغدا، لە نزیك زەریاچەی (زرێبار-مەریوان)و لە ماوەی تەنیا (١٠ دە) دەقیقەدا تێکیان شکاندوونو فەرماندەی سوپاکەیشیان (سلێمان کەهیا) بەدیل گرتووە[١٧].

ئەم نەبەردە ئەوەندە دەنگیداوەتەوەو ئەوەندە سەرکەوتنی سیاسیو سوپایی بۆ میرنشینی بابانو تەنانەت بۆ میرنشینی ئەردەڵانو دەوڵەتی ئێرانیش هەبووە، کە دواتر چ ئەمانوڵڵاخانی ئەردەڵان (٧٧٥-١٨٢٤ز)، بەسەرکەوتنو شانازیی خۆیانیان ئەژمار کردووە. تەنانەت ئەمانوڵڵاخانی ئەردەڵان، وێنەی ڕووداوەکانی ئەم نەبەردەی لەسەر دیواری ژووری میوانی تەلارەکەی خۆیدا دروستکردووە[١٨]و لەلایەن گەشتوەرانی بیانیشەوە ئاماژەی پێکراوەو باسی کراوەتەوە[١٩].

بەڵام پێدەچێ مەولانا خالید لە دوای گەڕانەوەی لە هیندستان، کەمتر خەریکی نووسینی شیعر بووبێو زۆرتر سەرگەرمو سەرقاڵی ئەو پەیامەی بووە، کە ئیتر بەتایبەتیو بەیەکجاریی خۆی بۆ تەرخانکردو سەرومڕی ناوبانگو زایەڵەیشی هەر بەم پەیامە ناسرا.

ئەم پەیامەی مەولانا خالید، چی بوو؟!

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، دەبێ ئاوڕێکی خێرا، لە دوایین گۆڕانکارییەکانی بیروباوەڕی ئەو ڕابەرانەی نەقشبەندی بدەینەوە، کە مەولانا خالید، هەوێنی بیروباوەڕیانی بۆ کوردستان هێنایەوە.. هەرچەندە چەند سەدەیەکیش بەر لە سەردەمی (مەولانا خالید)، تەریقەتی نەقشبەندی لە پێش پێکهاتنی دەوڵەتی سەفەوییەوە (١٥٠١ز)، پەلوپۆی لە کوردستاندا بڵاوببووەو لە هەندێ قۆناغیشدا ڕووناکبیرانی کورد، لەڕابەرە دیارەکانی ئەم تەریقەتە بوون، وەك نموونەی (فەتح

عەلی کوردی))، کە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی، بەخەڵکی (ئامێدی) یادداشتی کردووە[٢٠] و لەسەرەتای پێکهاتنی دەوڵەتی سەفەویدا، لەدەوروبەری (قەزوین)، وەك مریدێکی چالاکی (عوبەیدوڵڵای ئەحرار)، ڕابەرایەتی ئەم تەریقەتەی کردووەو نەیارێکی نەترسی سەفەوییەکان بووەو هەر ئەوانیش لە کاتی هێرشی ڕەشەکوژییاندا بۆ سەر سوننی مەزهەبو نەیارەکانیان، گرتوویانەو کوشتوویانەو ئەم کاری ڕەشەکوژیی سوننی مەزهەبیش، کە سەفەوییەکان لە سەرەتای دەسەڵاتگرتنە دەستیانەوە، لەبەریان گرت زەنگی قەلاچۆکردنی مەزهەبی سوننی بوو، لە باکوورو خۆرئاوای ئێرانداو لەم شاڵاوەدا، تەریقەتی نەقشبەندی-ش کەوتە بەر شاڵاوی ڕاستەوخۆی سەفەوییەکانو جێگەوپێگەی لە مەڵبەندە دێرینەکانیاندا پێ لێژکردنو ناچاری کردن بەرە بەرە مەڵبەندەکانیان بۆ (تەورێز)و (ورمێ) بگوێزنەوە، کە لە (ورمێ)و ئاقاری ورمێدا: لەنگەرێکی درێژخایەنی گرتو لە ورمێشەوە بەهەموو ناوچەکانی کوردستاندا بڵاوبووەوەو لە ئاکامدا بەو هۆیەوە کە سوڵتانەکانی (عوسمانی)ش، سوننی مەزهەب بوونو شەڕی بەردەوامی سەفەوییان کردووە، شاری (ئەستەموولْ)و هەندێ شوێنی قەڵەمڕەوی عوسمانی، بکەنە پەناگەو مەڵبەندی چالاکییو.. دواتریش لە زۆر جێگەی ئاسیای ناوەڕاستو هیندستاندا بڵاوبنەوەو چالاکییان تێدا بنوێنن، کە دوای چەندین قۆناغو ئاڵوگۆڕی فیکریی بەردەوام بەسەر ئەم تەریقەدا، یەکێك لە شێوازە سەرەکییەکانی ئەم گۆڕانکارییانە، لە هیندستان، لەسەر دەستی شێخ ئەحمەدی سەری هیندی (١٥٦٣-١٦٢٤ز)، ناسراو بە (المجدد)دا، شەقڵ بگرێو پەلوپۆی بۆ (مەککە)و شوێنانیتر لێببێتەوەو لەم قۆناغە بەدواوە، ئەم تەریقەتە پێی وتراوە: نەقشبەندی موجەدیدی، کە ئایدیۆلۆژیایەکی جیاوازو خوێنێکی تازەی بەبەر ئەم تەریقەدا کردەوەو لەهەمان کاتیشدا ئەو گیانی گۆشەگیریو تەریکییەی لە خۆی داماڵی، کە ڕابەرانو پەیڕەوکارانی پێشووتری ئەم تەریقەتە، بەتەنگ کێشەکانی ڕۆژانەو خەمو خۆزگەکانی خەڵکەوە نەبوون، چونکە ئەم ڕابەرە: (ئەحمەدی سەری هیندی) پێی وابوو، بۆ کارکردنە سەر بیروباوەڕی دەسەڵاتدارانو فەرمانڕەوایانو ڕێنوێنیو ئامۆژگارییو ڕازیکردنیان، بۆ چاکەو خزمەتی خەڵك، دەبێ پردێك لەگەڵیاندا هەڵبەستێو لەم پێناوەشدا، نامەیەکی زۆری بۆ ئەو فەرمانڕەوایانەی مەغولیی

ناردووه، کە لەو کاتەدا حوکمی هیندستانیان کردووەو لە ئاکامدا بەباری سەرنجی خۆی قایلی کردوون. شان بەشانی ئەم نامانەش کە بۆ فەرمانڕەوایان دەنووسران، هاوکات بیروباوەڕو باری سەرنجی خۆیانیش پوخت دەکردەوەو لە شێوەی (نامە)و (نووسین)دا، بەپەیڕەوکارانی خۆیانیان دەگەیاندو بەمەشو لە ڕێگەی ئەم نامانەوە، مشتومڕو لێکۆڵینەوەی فیکریی تێروتەسەل دەهاتەگۆڕێ.. بەجۆرە ئەم تەریقەتە، لەسەردەمی ئەحمەدی سەری هیندیدا، ڕۆڵێکی گرنگو بەرچاوی بەخۆیەوە دیوەو بەرەو کامڵبوونو گەشانەوەو ڕەگوڕیشە داکوتانو خۆ ڕزگارکردن لە سێبەری جێپەنجەی ڕێبازەکانیتر هەنگاوی هەڵگرتووەو بەردەوام جەماوەری زۆرتری لێ ئالاوە، کە دواتر لەسەردەمی (شاعەبدوڵڵای دەهلەوی)ی، مامۆستاکەی (مەولانا خالید)دا، خانەقاکەی لە هیندستان، بۆتە مەڵبەندێکی سیخناخ لە قوتابیانی ئاسیاو ئەفەریقا(٢١).



مەولانا بۆ بەئەنجام گەیاندنی پەیامەکەیشی، قەڵەمڕەوی بابان بەگشتیو بەتایبەتیش پێتەختە تازەکەیان: شاری (سلێمانی) هەڵبژارد.

هەڵبژاردنی شاری (سلێمانی) لە لایەن مەولانا خالیدەوە، بۆ ئەوەی بیکاتە بنکەو مەڵبەند، بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی، کارێکی ئەوپەڕی هۆشیارانەو (شاریی)یانە بووە، کە ئەگەرچی شاری سلێمانی لەو کاتەدا (لەباری تەمەنەوە) تازەترین پێتەختی نێوان هەموو میرنشینەکانی کوردستان بووە، بەڵام هەر لەبنەڕەتو مەبەستیش لە دروستکردنی، بۆ ئەوە بووە ببێتە پێتەختێکی بەمانای وشەی ئەو ڕۆژگارە: هاوچەرخ، چونکە لە پاڵ ئەوەدا، کە هەر زوو ناودارترین زانایانو ڕووناکبیرانی ئەو سەردەمەی کوردەوارییان لە هەموولایەکی کوردستانەوە بۆ بانگهێشتن کردووەو تەکیەو خانەقاو مەدرەسەیان بۆ کردوونەتەوە، هاوکات خاوەن پیشەو جووتیارو سەربازیشیان لە هەموو ناوچەو هۆزی جیاجیای کوردستانیان تێدا نیشتەجێ کردووە.

بەڵام قەڵەمڕەوی بابان، لە پێش سەفەری مەولانا بۆ هیندستانو دوای گەڕانەوەیشی، لەوپەڕی پشێویی‌و داپڕانو دواکەوتووییدا بووە، چونکە شەڕی چەندین سەدەی شیعەو سوننی نێوان هەردوو دەوڵەتی ئێرانو عوسمانی‌و شەڕی ئەم دووەدانەش لەگەڵ دەوڵەتی ڕووس لەلایەك، کە لەهەموویاندا کوردیان بەناوی (جیهاد)و (غەزا)وە بۆ بردوونو لە پاڵ ئەمانەشدا شەڕی میرنشینەکانی ئەردەڵانو بابانو ئاژاوەو ناکۆکی نەپساوی نێوان ئەندامانی بنەماڵەی بابان لەسەر دەسەڵات لەلایەکی ترەوە، ببوونە سۆنگەی تێکدانی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و داتەپینی ئابووری‌و بارێکی گران، بەسەر ئەستۆی دانیشتووانەوەو خەڵکەکەی بەجۆرێك وەڕس‌و بێزارو هەراسان کردبوو، کە بەدوای دەرەتان، چارەسەرێکدا دەگەڕان، بۆیە کە مەولانا خالید بۆ کوردستان گەڕایەوەو بانگەوازی بۆ ڕێبازە تازەکەی بەناو خەڵکدا بڵاوکردەوە، خەڵکەکە وەك بانگەوازێکی ڕزگارکەر بەپیرییەوەچوونو پێشوازییان لێکرد، بەتایبەتیش چینی جووتیارو توێژی بازاڕیی‌و پیشەگەران، کە شەڕی خوێناویی‌و بەردەوامی ناوچەکە، ژیانی لێ شێواندبوونو زیانی لەبەرژەوەندییەکانیان دەدا.. بەمجۆرە مەولانا خالید لە ماوەیەکی زۆر کورتدا، بنکەیەکی جەماوەریی زۆر بەربڵاوی پێکهێنا. بەتایبەتیش ئەگەر لێرەدا ئەوەمان لە یادبێ، کە مەولانا لە هۆزی (جاف)ەو ئەم هۆزەش لە ساڵی (١٦٣٨ز) بەدواوە، کە تیایدا سوڵتان مرادی چوارەم (١٦٢٣-١٦٤٠ز)، بەغدادو شارەزووری گرت‌و پاشان بەگوێرەی ڕێکەوتننامەی (زەهاو-١٦٣٩ز)، ئەردەڵانی‌و پێڕەوانی (ئەهلی هەق)، چوونەوە ناو قەڵەمڕەوی ئێران، بەشێکی زۆر لە جافی (جوانڕۆ)ش ڕژانە (شارەزوور)[٢٢] و بەمەش هۆزی جاف (بەئێستاشەوە) بوونە تاقانە هۆزی گەورەو بەدەسەڵاتی شارەزوور، کە دواتر بووە پێتەختی بابانو ئەوڕەحمان پاشای بابانیش لە یەکەمین قۆناغی گرتنە دەستی فەرمانڕەوایەتی باباندا‌و بۆزیاتر بەهێزکردنی دەسەڵاتی خۆی لە شارەزووردا، خزمایەتییەکی سیاسی لەگەڵ یەکێك لە گەورە سەرۆك هۆزی جاف، واتە: لەگەڵ وەڵەد بەگی جافدا دروستکردو خوشکێکی خواستووە[٦٠] و بەهۆیەوە و لێرە بەدواوە هۆزی جاف، چ لە کاروباری

---

٦٠- ئەم هەواڵە، لە گەشتنامەکەی (ریچ)دا، دەڵێ ئەوڕەحمان پاشای بابان، خوشکێکی کەیخوسەرەو

میرنشینەکەو چ لە سوپای باباندا  چاکترین جەنگاوەری ناو سوپاکە[٦١] بەشدارو هەمەکارەی گەورەبوون[(٢٣)] و بەپێی قسەی (کلودیوس جێمس ڕیچ)، چوار هەزار پیادەی جاف، لە سوپای باباندا بوون[(٢٤)]. کە بێگومان ئەم هێزە، بڕبڕەی سوپای بابانیان پێکهێناوە و بۆ کاتی جەنگیش، (٢٠٠٠) دوو هەزار سوارەیان ئامادە بووە و[٦٢] وەك ڕووداوەکانیش بۆمان دەگێڕنەوە، هەر نەبەردێکی سوپای بابان، هێزی (جاف)ی تێدا ئامادەبووبێ، تیایدا سەرکەوتووبووەو هەر کاتێکیش ئەم هێزەی جاف، پشتی لە بابان کردبێ، تیایدا تێکشکاوە. لەبەرئەوە ئەم هێزە گەورەیە پشتیوانییەکی یەکجار بەهێزی (مەولانا خالید)یش بووەو ئەوەندەی ملکەچی فەرمانەکانی میرانی بابان بوون، ئەوەندەش گوێڕایەڵی مەولانا خالید بوونو وەك زاناو ڕووناکبیرێکی گەورەی هۆزی خۆیان بۆیان نواڕیوەو شانازییان پێوە کردووە.

سەرباری ئەو هەموو شەڕو ململانێو ناکۆکییەی (وتمان) لە ناوچەکەدا بوون، بەڵام مێملّو بەربەستێکی تری پتەوی بەردەم تەریقەتی نەقشبەندی، کە پێشتر لە ناوچەکەدا بوو، تەریقەتی (قادری) بوو، کە زانای گەورەو ناودار شێخ مارفی نۆدێ (١٧٥٣-١٨٣٨ز) ڕابەرایەتیی دەکردو بەو هۆیەشەوە کە ئەم تەریقەتە زۆر دەمێك بوو ڕەگوڕیشەی لە هەرێمەکەدا بووەو لەگەڵ سەرانو کاربەدەستانی بابانیو عوسمانیدا سەروپێوەندی بەهێزی هەبووەو هاوکاتیش گەڕانەوەی مەولانا خالیدو بڵاوبوونەوەی خێراو بەرفراوانی تەریقەتی نەقشبەندی، بەمەترسییەکی گەورەو ڕاستەوخۆی، بۆ سەر خۆی زانیوە. بۆیە هەر زوو تەریقەتی (قادری) کەوتۆتە نەیارییو زمان

---

بەگی جافی خواستووە، بەڵام نووسەری هێژا و هاوڕێی بەڕێزم:کاك عەلی بەگی جاف ئەم هەواڵەی بۆ ڕاستکردمەوە، کە ئەوڕەحمان پاشا خوشکی وەڵەد بەگی جافی خواستووە، نەك کەیخوسرەو بەگی جاف. لەم بارەیەوە بنوارە گەشتنامەی ریچ، لاپەڕە(١٣٢).

٦١- گەشتنامەی ریچ، لاپەڕە(١١٩).

٦٢- گەشتنامەی ریچ، لاپەڕە(١١٩).

لێدان‌و ڕاپۆرت نووسین، لای میرانی بابانی‌و عوسمانی‌و پیاوانی ئایینی‌و تەنگ پێهەڵچنینی مەولاناو ناوزڕاندنی بەکافرو مولحیدو زەندیق‌و هەڕەشەو تەقەللای تاڕادەی تیرۆرکردنی.. هەموو ئەمانەش بوونە هاندەری ئەوەی تەریقەتی نەقشبەندی، لەلایەن جەماوەری دژ بەو سیستەمە چەقبەستووە، وەك تاقانە ئەلتەرناتیڤ‌و وەك هەڵوێستێکی دژ بەزوڵم‌و بێدادیی وەربگیرێ. بەتایبەتیش کە (مەولانا)، لایەنگرو پەیڕەوکارانی خۆی، بەوە پەروەردە دەکرد، تا ڕاستەوخۆ نەبنە پاشکۆی هیچ کام لەو دوو دەوڵەتەی عوسمانی‌و قاجاری‌و هەر ئەم هەڵوێستەی مەولانا خالید، لای والییەکانی (عوسمانی)یش لە مووسڵ‌و بەسرەو شام‌و بەتایبەتیش لە بەغداد، پشتیوانیی لێ بکەن‌و بەنزیك و هەڵوێستی خۆیانی بزانن‌و ببنە دۆست‌و مریدی، چونکە ئەوانیش کەم‌و زۆر، حەزیان لە جێبەجێکردنی کت‌ومت‌و بێ سێ‌ودووی فەرمانەکانی بابی عالی نەدەکردو پێیان خۆش بوو جۆرێك لە سەربەخۆیی‌و ئازادی خۆیان پێڕەو بکەن.. جگە لە کۆکردنەوەی زۆرینەی ناودارترین زانایان‌و ڕێبەرانی ئایینی لە هیندستان‌و ئێران‌و ئەفغانستان‌و تورکیاو عەرەبستانەوە[٢٥] بەگشتی‌و بەتایبەتیش لە هەموو ناوچە جیاجیاکانی کوردستانەوە، وەك: کۆیە، کەرکووك، هەولێر، ئاکرێ، شەمزینان، هەکاری، ئورفە، دیاربەکر، سنە، سابلاخ، هەورامان.. لە خانەقاکەی خۆیدا کە لەو کاتەدا خانەقاکەی مەولانا خالید لە (سلێمانی)، یان شاری سلێمانی بەهۆی خانەقاکەی مەولانا خالیدەوە، ببووە درەوشاوەترین ئەلبوومی کوردستانێکی بچووك، بەهەموو فەرهەنگە جیاجیاو زاراوەو بن زاراوەکانییەوەو لە ئاکامیشدا هەر لەم فەرهەنگ‌و دیالیکتە تێکەڵەیەش، زەمینەو کەش‌و هەوا، بۆ سەرهەڵدانی دیالیکتی ناوەنجیش ڕەخسا، واتە: ئەو دیالیکتەی کە (نالی)و هاوڕێکانی، شیعریان پێ نووسی‌و ئەمیش وەك بانگەوازەکەی مەولانا، زۆر بەخێرایی دەستی بەتەنینەوە کرد.. سەرباری ئەوەی کە هەر لەم خانەقایەی مەولاناوەو لە ڕێگەی ئەو زانستخوازانەی لە خانەقاکەی مەولاناوە، بۆ هەرێم‌و شارەکانی خۆیان دەگەڕانەوە، فەرهەنگ زانستی نوێی خانەقاکەی مەولانایان بۆ سەرتاسەری کوردستان بردۆتەوەو

فێرخوازانی تریشیان پێ پەروەردەو گۆش کردووەو هەندێکیشیان بوونەتە ڕابەری میللیو شۆڕشگێڕی بەنامێ، دژی زوڵمو زۆرداریی فەرمانڕەوایان.. کە هەموو ئەم کارانەش، هەر لە سەرچاوە ڕوونو لەبن نەهاتووەکەی خانەقاکەی (مەولانا خالید)ەوە هەڵقوڵانو هەمووشیان لە ماوەیەکی زۆر کورتی تەمەنی کارکردنی مەولانادا بەڕێخران.. بەواتایەکیتر: ئەوەی مەولانا خالید، لەدوای گەڕانەوەی لە هیندستان، وەك ڕووناکبیرێکی ڕیفۆرمخوازی ئیسلامیی، لە ماوەی (٨-٩) ساڵ کارو ئیرشادکردنی پچڕپچڕیدا، لە ناو قەڵەمڕەوی میرنشینی بابانو دەرەوەی میرنشینەکەدا ئەنجامیداو چەندان بزووتنەوەی هاوتەریبی، وەك: بزووتنەوەی شیعرو زمانو فیکرو ڕەخنەو دیالۆگی نوێی لێکەوتەوە، نە بە هیچ زانکۆو دامودەزگایەکی فەرهەنگییو زانستیی دەکراو نە لە هیچ سەردەمێکی پێشووتری کوردستاندا، بزووتنەوەی فیکرییو فەرهەنگیی ئاوا ئیقلیمگیرانەی کوردستان ڕوویداوەو نە ئاواش خێرا، ڕەنگدانەوەو ئەنجامی بەرچاوی هەبووە.. لە کاتێکدا ئێمە دەزانین خستنەڕێو ئەنجامدانی بەرنامەو پرۆسەی فیکرییو فەرهەنگیی، زۆر درەنگ ئەنجامیان دەردەکەوێو ئەگەریش سەربگرێو دەربکەوێ، دەبێ لە کەشوهەواو کۆمەڵگەیەکی ئارامو سەقامگرتوودا، ئەنجام بدرێ.. کەچی ئەوەی لەمانەش زیاتر جێی ڕامانو سەرسوڕمانە، (مەولانا) ئەم بزووتنەوە نوێیەی لە کەشوهەواو داروبارێکی زۆر سەختو جەنجاڵو داپڗاوو تێکچڕژاودا ئەنجامداوە، کە تیایدا بەردەوام لەشکرکێشییو شەڕو بەیەکداهەڵپژانی سوپای ئێرانو عوسمانیو سەرانی بابانیش لە ناوخۆیاندا، هەرێمەکەیان شەڕاویی کردووەو بۆ بردنەوەی ئەم شەڕانەش، هەمیشە پێویستییان بەزۆرترین ژمارەو کۆمەڵی چەکداربووە، کە ئەم ژمارە چەکدارەش، هەمیشە بریتیی بوون لە سەرانی عەشایەرو دەستوپێوەندی نەخوێندەوار (نەك خوێندەوار)و هەر ئەمانیش لە ئاکامدا بڕیان لەسەر چارەنووسی شەڕەکانو تەرازووی هێزەکان داوەو بەمەش هەمیشە ڕۆڵی خوێندەوارانو ڕووناکبیران، لە خانەی لەبیرچوونەوەو پەراوێزو پاشکۆیەتیدا بووە.. کەچی مەولانا لەم هەلومەرجە

جەنجاڵەدا، توانی ببێتە حەقیقەتو گوشارێکی تازە بابەتو ڕەخنەی بابەتییانە، لە سیستەمی بەڕێوەبردنو دیدیان بگرێتو پێشنیارو هەڵوێستو دیدی ڕووناکبیرانەیان پیشان بداتو دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمەی وا لێکرد، بەچاوی ڕێزو گوێ لێگرتنەوە، حساب بۆ دیدو هەڵوێستو پێشنیاری خوێندەوار بکەنو لەبەردەمیدا بچەمێننەوە، کە ئەم ڕێزلێنانە، لە پلەوپایەی مەولانا خالید، ڕێزلێنان نەبوو لە لەشکری زۆرو چەکی مەولانا خالید، بەڵکو ڕێزلێنان بوو لە پلەوپایەو ڕووناکبیرانەو نیشتمانپەروەرانەی مەولانا خالید. هاوکار ڕێزلێنان نەبوو لە پلەوپایەی ڕووتی ڕابەرێکی ئاییني وەك مەولانا خالید. ئەگینا هەر لەو ڕۆژگارەدا، کە دەسەڵاتدارانو فەرمانڕەوایان، ڕێزی بێ سنوور لە مەولانا دەگرن، ڕابەری تری گەورەی ئاییني، لە سلێمانیدا دەژی.. جگە لەوەی ئەوەندەی پێوەندی بەڕێزلێنانی سەرانی بابانەوە هەبێ لە مەولانا خالید، ئەوەندەش لێی دڵنیان، کە بارتەقای هەموویان، دڵسۆزو خەمخۆرو بەتەنگەوەهاتووی یەکێتییو سەرکەوتنو سەروەریی میرنشینی بابانەو لەم بوارەدا (بۆ وێنە) لە کاتێکدا میرێکی بابانی وەك ئەوڕەحمان پاشا، کە زۆرینەی ململانێو شەڕەکانی ئەم قۆناغەی، لەگەڵ والییەکانو سوپای عوسمانی (واتە: لەگەڵ لەشکری ئیسلامو خەلیفەی ئیسلامدا) بووەو ئەگەر مەولانا بەپێودانی لێکدانەوەی ئیسلامییانە، هەڵوێستی وەربگرتایە (کە لایەکیان ئیسلامو لایەکەی تر: شۆڕشگێڕێکی یاخی کوردە)، دەبوو پشتیوانیی لە خەلیفەی ئیسلام بکات، کەچی مەولانا خالید پشتیوانیی لە شۆڕشگێڕە کوردەکە (ئەوڕەحمان پاشا) دەکاتو شیعری شانازیی پێوەکردنی بۆ دەنووسێ![٢٦].

## پەراوێزەکان:

١.بیسارانی، ملا حامد، ریـاض المشـتاقین، در بیـان أحـوال مناقـب حضـرت مولانا خالد ضیاءالدین و حضرت شیخ عثمـان سراج الدین. به تصـحیح ومقدمـة وحواشی وتعلیقات: أبوبکر سپهرالدین، چاپ أول ١٣٨٦ش، ص.١١٣

٢.هەمان سەرچاوەی ناوبراو، ص.١١٢

٣. هەمان سەرچاوەی ناوبراو، ص .١١٤

٤. هەمان سەرچاوەی ناوبراو، ص .١١٣

٥. هەمان سەرچاوەی ناوبراو، ص .١١١

٦.هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٨.مودەڕیس، مەلا عەبدولکەریم، یادی مەردان، بەرگی یەکەم، کۆڕی زانیـاری کورد، بەغدا ١٩٧٩، ل .٥٥٣

٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل .٥٥٣

١٠.بیژن إلهی، أشعار حلاج، تهران ١٣٥٤س، ص .٧٠

١١.ملا حامد کاتب، ریاض المشتاقین، ص .١٢٩

١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل.٣٢

١٣.حکمت عبدالمجید سیفی لاهور، مکاتیب شریفه (حضرت شـاه غـلام علـی دهلوی، استانبول-ترکیا، ١٩٩٢، صص: ٤٣، ٥٤، ٢٢٩.

**سەرنج:**
**ئەم کتێبە بریتییە لە نامەکانی شاعەبدوڵڵای دەهلەوی.**

١٤. لەناو شاعیرانی رۆژگاری میرنشینی باباندا، (سالم)ی شاعیر، زۆر راستگۆیانە لەوە ئاگادارمان دەکات، کە خۆی (سالم) و (نالی) و (کوردی) و (مەشوی) و... دەستەچیلەی هونەری (شیعر)، لە (مەولانا خالید) وەردەگرن:

**لە رۆژی ئیمتحانا دیم، بەرابەر طالب و مەعشووق**
**کەمەربەستەی هونەر هاتن، لە تیپی عەشقبازانا:**
**لەلاییَ: (نالی) و (مشوی)، لەلاییَ: (سالم) و (کوردی)**
**لە هەنگامەی هونەر گەرمیی، تکاجۆ بوون لە:(مەولانا)**

بۆ زیاتر زانیاریی، بنوارە: دیوانی سالم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، چاپی دووەم ١٩٧٢، ل.٣٠

١٥.معتمدی، دکتر مهیندخت، مولانا خالد نقشبندیو پیروان گریقت او، انتشارات پاژنگ، تهران ١٣٦٨ش، ص٢٩، هەروەها یادی مەردان، بەرگی یەکەم، ل٥٨٤، هەروەها: مستەفا، نەوشیروان، میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی رۆمو عەجەمدا، چاپی دووەم، چاپەمەنی خاك، سلێمانی ١٩٩٨، ل.١١٠

١٦.یادی مەردان، بەرگی یەکەم، ل٣٠١، ٤٩٥.

١٧.حەمەباقی، محەمەد، میرنشینی ئەردەڵان، بابان، سۆران لە بەڵگەنامەی قاجاریدا، چاپەمەنی ئاراس ٢٠٠٢، ل.٥٢

١٧.گەشتنامەی کلودیوس جیمس ریچ بۆ کوردستان، وەرگێرانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی، محەمەد حەمەباقی، چاپی سێیەم، چاپەمەنی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢، ل١٨١، ١٩٦.

١٨.سەرچاوەی پێشوو، ل١٨١، ١٩٦. هەروەها: پ.ام. ژوبر، مسافرت به ارمنستان وایران، ترجمەی محمود صاح انتشارات چهر، تبریز، سال چاپ، ص٢٥٠-٢٦٢.

١٩.دائره المعارف الاسلاميه، مجلد٧، ص٩٣٥، گبعه بريل هولندا ١٩٩٣. هەروەها: فتح الله جرجيس، مبحپان على هامش پوره الشيخ عبيدالله النهرى، الگبعه الاولى، ستوكهولم ٢٠٠٠، دار الشمس للگباعه، ص١٨٠.

٢٠.فتح الله، جرجيس، مبحپان على هامش پوره الشيخ عبيدالله النهرى، ستوكهولم، ٢٠٠٠، ص.١٨٧

٢١.بۆ زياتر زانيارييى لەم بارەيەوە بنوارە: مشير الدوله، ميرزا سيد جعفر مهندس باشى (رساله تحقيقات سرحديه)، به اهتمام محمد مشيرى، انتشارات بنياد فرهنگ ايران، تهران ١٣٤٨ش.

٢٢.گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان، ل.١٢٧

٢٣.هەمان سەرچاوە، ل.١١٩

٢٤.یادی مەردان، بەرگی یەکەم، ل.٢٣

٢٥.پێشتر ئاماژەمان بەم شیعرەی مەولانا کرد، کە بۆ ئەوڕەحمان پاشای بابانی نووسیوە.

# مەولەوی!
# یان
# گەڕانەوە بۆ سەرچاوە؟

کامە پەری و ئەوینی نهێنی و ئەفسانەیی بوو، هەر لە سەرەتای تەمەنی (**مەولەوی**)یەوە دەستیان لە دڵە ئاسکەکەی وەشاند و هەموو عومری (**مەولەوی**)یان نوقمی ئەوینێکی سەرومڕ و بێ بڕانەوەی سرووشت و زێدەکەی کرد، کە هەر بە گڕ و کڵپەی هەمان ئەوینیشەوە، باوەش بە شیعردا بکات و خۆی بە میراتگری قەباڵەی ئەدەبێکی تەمەن درێژی دیالیکتی گۆران بزانێ و لە ماوەیەکی کورتی تاقیکردنەوەی شیعریدا، لەیەك کاتدا: لەلایەکەوە توانی رووبەری جوگرافیای جەماوەری ئەم شێوەزمانە فراوانتر و شیرینتر بکات و لەلایەکی تریشەوە لەناو ئەم جوگرافیایەدا نەخشەیەکی تایبەتمەند و جیاواز بۆ خۆی دیاری بکات" کە شیعری کوردی لەسەر دەستی ئەمدا، باڵاتر و هەڵچێ و هەموو کۆڵەگەکانی ئیستاتیکای شیعر، تازە گەرییان بەسەردا بێت و جوانیی و نەمریی هەتا هەتایی بە شیعر بدات!؟!؟.

ئەگەر ئەم پرسیارە چڕانە، تا ئێستا لەلایەن رەخنەگران و توێژەرەوان و شیعرناسانی کوردەوە، بە تەواوی وەڵام نەدرابێتنەوە و پلەوپایە و شوێنی مەولەوی لە ئەدەبی کوردی و لە بواری نرخناسیدا دەستنیشان نەکرابێ، مانای وانییە مەولەوی پەیامەکەی خۆی بە ناتەواوی داوەتە دەست نەوەی دوای خۆی، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەوەی دوای مەولەوی و بە تایبەتیش لەم حەفتا ساڵەی دواییدا، کە کاروباری بەسەرکردنەوەی شاعیرانی کلاسیکمان و ناساندنیان کەوتوونەتە بەر رووناکیی و لە هەمان کاتیشدا، کە گوژم و هەنگاوی خێرای رەخنەی بابەتی و زانستییانەی ئەدەبیی، لای گەلانی دوورو دراوسێکانمان، لەبەرە و پێش چووندان" ئەوەی دەربارەی مەولەوی بۆ نەوەی نوێ ناساندرابێ، چەند تەقەللایەکی ناوبەناو

بوون[٦٣] كە لە عۆدەی ئەم کورتە نووسینەی مندا نییە، ئەو نووسینانە بەسەر بکەمەوە و هەڵیان سەنگێنم. بۆیە ئەگەڕێمەوە بۆ مەبەست و ئەڵێم:قەوارەی ئەو ناساندنەی لەم حەفتا ساڵەی دواییدا، بۆ مەولەوی کراوە، هێشتا بە ئەندازە و قەوارەی ئەو ناساندنە نییە، کە مەولەوی لە سەردەمی ژیانی خۆیدا، بە خۆیەوە دیوە و بۆی کراوە چونکە مەولەوی هێشتا خۆی لە ژیاندا بووە، کە لە لایەکەوە: وەك شاعیرێکی هەرە گەورە و دیار، لەلایەن تێکڕای شاعیرانی دیالیکتی (گۆران)ەوە بەسەر کراوەتەوە و لێی ئالاْون و وەك رابەرێکی شیعریی و ناوەندێکی ئەدەبیی، خۆشیان ویستووە و نامەی شیعرییان لەگەڵدا ئاڵوگۆڕ کردووە" لەلایەکی تریشەوە وەك مرۆڤ لە هەموو شاعیرانمان زیاتر پێوەندی کۆمەلاْیەتی بە هێزبووە و نامە گەلێکی زۆری لێ جێماوە، کە بۆ دۆستگەلێکی سەر بە توێژ و چینە جیاجیاکانی کۆمەڵ نووسیونی و دەیسەلمێنن کە چ لای جەماوەری هەژاری ناوچە دواکەوتووەکەی و چ لای پیر و پیرزادەکانی و چ لای زانایان و چ لای میرانی بابان و بە تایبەتیش لای میرانی ئەردەلاْن و تەنانەت لای سەرانی (قاجار)یشەوە، بە

---

٦٣- تەقەللا دیارەکانی ئەم مەیدانە ئەمانەن:

*رۆحی مەولەوی، بەرگی یەکەم:(١٩٣٥)، بەرگی دووەم:(١٩٤٠)، پیرەمێرد.

*دیوانی مەولەوی:کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسینی، (مەلا عەبدولکەریمی مودەریس)، بەغدا(١٩٦١ز)

*گۆران، یادی پیرەمێرد (لاپەڕە ٧٣ ـــ ٨٣)بەغدا (١٩٥١ز).

*میهرەجانی مەولەوی، کتێبی ژمارە (١)ی گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، بەغدا، چاپخانەی (الزمان) (١٩٨٩ز).

*مێژووی ئەدەبی کوردی (عەلائەدین سەجادی) بەغدا، (١٩٥٧ز).

*ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی (عەلائەدین سەجادی، بەغدا) (١٩٦٨ز).

*ئەنوەر قادر محەمەد (لیریکاری شاعیری گەورەی کورد:مەولەوی، ستۆکهۆڵم (١٩٩١ز).

*محەمەد ئەمین ئەردەلاْنی (دیوانی مەولەوی) وەرگێرانی بۆ سۆرانی (بەرگی یەکەم) بەغدا(١٩٩١ز).

*کۆنگرەی مەولەوی، سەقز:(٨ تا ١٣٧٢/٧/١٠)ە هەتاوی، بەرامبەر (٢٩ تا ١٩٩٢/٨/٣١ز).

کەسێکی زانا و رەوشت بەرز و خاوەن هەڵوێست و دڵسۆز، سەیری کراوە و جێگە و رێزی تایبەتی هەبووە و پلەوپایەی مەزنیان بۆ داناوە و لەم مەیدانەشدا گەلێ جار تکای لێکراوە وەك ریش سپی و ناوبژیکار، بۆ برانەوەی گەلێ کێشەی کۆمەڵایەتی و ئایینی، بێتە مەیدانەوە و قسەی خۆی بکات و لای هەردوو میرانی بابان و ئەردەڵانیشەوە پێشنیاری بۆ کراوە، بچێتە پایتەخت و شارە گەورەکانیانەوە و لەسەر فەرمانی (غولام شاخان)ی میری ئەردەڵانیش، لە ئاهەنگێکی پڕ تەدارەکدا، بە رەسمیی لەقەبی مەولەوی پێدراوە.[٦٤] دیسان هەر ئەم شازادیە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە باوەش دایکێکدا گەورە بووە، سەدان فرسەخ لە زێد و زمانی مەولەوی یەوە دوورە،[٦٥] کەچی ئەوەندە عاشق و هۆگر و سەراسیمەی شیعری

---

٦٤- مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سەجادی (چاپی دووەم بەغدا) (١٩٧١)، لاپەڕە(٢٨١).

٦٥- بۆ زیاتر رونکردنەوە، دەبێ ئەوە بڵێم کە:غولام شاخان یەکێ لەدوا میرانی میرنشینی ئەردەڵانە و لە باوکەوە کوڕی دووەمی خەسرەوخانی کوڕی ئەمانۆللاخانی گەورەی میری ئەردەڵانە، کە باوکی بە خەسرەوخانی ناکام بەناوبانگە و دیسان وەك شاعیریش دەناسرێ و شیعری بە زمانی فارسی زۆرە و نازناوی شیعری والی یە. لە دایکیشەوە، کوڕی حوسن (جیهان)ە، کە (٢١)هەمین کچی فەتح عەلی شای قاجارە و ئەمیش وەکو شاعیرێکی فارسی زمان دەناسرێ و نازناویشی (ام القانون)ە، بە واتا: لە سەرێکەوە رەگەزی دایکی فارسە و شیعە مەزهەبە و باوکیشی خەسرەوخانی ناکام، وەك وترا، هەر بە فارسی شیعری نووسیوە و لە سەرێکی تریشەوە ماهشەرەفخانم (مەستوورە)ی ئەردەڵان (١٨٠٥ ـــ ١٨٤٧ز)ی شاعیر و مێژوونووسی ناوداری کورد، زڕ دایکێتی، کە دەبێتە هەوێی دایکی و ژنی دووەمی باوکێتی، کە بەسەر دایکی هاتووە و..دەبوایە ئەم چەند جیاوازیی و هۆیە، کار لە هەستی غولام شاخان بکەن، تا زۆر حەز لە زمانی کوردی نەکات..کەچی شیعری مەولەوی، ئەوەندە جێپەنجە و زەبری لەسەر هەست و ناخی غولام شاخان داناوە، کە وەك وترا:نەك هەر بە دیالیکتی (گۆران)، بەڵکو بە شێوەزمانی ناوچەی تاوەگۆزی، شیعری لەگەڵ مەولەوی دا، ئاڵوگۆڕ کردووە..!

مەولەوی بووە، نەك هەر بە دیالیکتی **گۆران**، بەڵکو سەیر لەوەدایە، بە شێوە زمانی ناوچەی تاوەگۆزی، شیعری لەگەڵ مەولەوی دا ئاڵوگۆڕ کردووە![٦٦]

ئەم جێگە و ڕێزە ئەدەبیی و کۆمەڵایەتییەی مەولەوی، دیاردەیەکی ئەوەندە پڕ سەروەرییە بۆ ئەدەبی کوردی، کە پێشینەی نەبووە و شاعیرێکی ترمان نییە ئەوەندەی **مەولەوی،** ئەم شکۆ و مەزنایەتییەی بە خۆیەوە دیبێ. سەرەڕای ئەمەش، ئەوەی جێی دڵخۆشییە، ئەم دیاردەیە ئەوەندەی تاڵەموویەك، شاعیرێتی و کەسایەتی (مەولەوی)یان بەرەو لە خۆبایی بوون و چاوبڕینە پلە و پلیکانەی خۆ بەرزکردنەوە لەسەر حسابی ناوبانگ و شاعیرێتی خۆی نەبردووە" یان نەوی کردنی سەری بڵندی شیعر، لە بەردەم دەربارێکدا" بەڵکو لە کۆکردنەوە و هاوئاهەنگی کردنی ئەم دوو جۆرە پێوەندییەدا، ڕۆژ داوی ڕۆژ خۆشەویستی خۆی و شیعری، زیاتر و زیاتر، لە بازنەیەکی بەربلاودا، قووڵتر و داکوتاوتر بردووە" بە جۆرێك لای شاعیران و شیعردۆستانی، بۆتە ڕەمزێکی درەوشاوەی ئەدەبیی، کە شیعر سەرباری پەیامە ئەدەبییەکەشی، لە عاست بەرزکردنەوەی چێژی چەشتنی ڕۆحیی و هونەریی، لە پاڵیشیدا لە خەم و خەونی خەڵك نزیك ببێتەوە و دەستە دەستە هۆگر و شیفتەی شیعر بن.

لە پەیجوور و تاوتوێکردنی ئەم دوو جۆرە پێوەندییەی مەولەوی دا، هەندێ ئاکاممان دەستگیر دەبن، کە جێی سەرنج و لێدوانی تازەن و بۆ ئەوە دەشێن ببن بە کەرەسە و هەوێنی زیاتر ناساندنی مەولەوی و شیعری کوردی لەو سەردەمەدا.

بۆ دەرگا خستنە سەرپشت لەسەر ئەم ڕازە، سەرەتا دەبێ ئەوە بڵێم کە ئەم دیالیکتەی مەولەوی شیعری پێ نووسیوە، سەدان ساڵ بەر لە (مەولەوی)ش ئەدەبی پێ نووسراوە" چونکە کۆنترین مێژینەی ئەدەبی شیعریی، زمانی کوردی، کە لەبەر دەستدایە و لە سەدەی دەیەمی زایینەوە دەست پێدەکات، دەیسەلمێنن کە لە پاش داهاتنی ئایینی ئیسلام و ڕاستەوخۆش لە سەرەتای هاتنی ئایینی ئیسلامەوە دەست پێ ئەکا، تا سەدەی سیانزەهەمی کۆچی، واتە: نزیك کۆتایی

---

٦٦- یادی مەردان:(بەرگی دووەم، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس) بەغدا چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق، ساڵی (١٩٨٣ز) لاپەڕە (٣٨٥،٣٨٨).

سەدەی نۆزدەیەمی زایینی، کە ئەم دیالیکتە زمانی ئـەدەبیی و ئـایینی ناوچـەی ناوەندی و باشووری کوردستان بووە.

بۆیە تەمەنی ئەم دیالیکتە ، لە تەمەنی تێکـڕای دیالیکتـەکانی تـری زمـانی کوردی درێژترە و ئەگەریش خۆرهەڵاتناسـانی وەکـو: ئەلیکسـندەر ژابـا، مـارتن، هارتمـان، ب. لـیرخ، رۆژی بلیسـکۆ، فیلچیفسـکس و رۆدینکـۆ و..هتـد" ئـەوە بسەلمێنن کە ئەدەبی کوردی، لـە سـەرەتای دەسـت پێکردنییـەوە، بـە دیـالیکتی باکوور دەستی پێکردبێ و بە تایبەتیش لە عـەلی حـەریری (سـەدەی یانزەهـەمی زایینی)یەوە. ئەوا لەم دیالیکتەدا لە سەدەی دەیەمی زایین و، رەنگـە پێشـتریش، کتێبی **ماریفەت و پیرشالیاری زەرتوشتی** پێ نووسراوە،[٦٧] کە لـە بـارەی ئـایینی (زەرتوشت)ەوەیە. دوای ئەمیش کتێبی (سەرئەنجام)ی[٦٨] پێ نووسـراوە، کـە لـەناو خەڵکدا بە **سروودی یارسان** ناسراوە و کتێبی ئایینی (ئەهلی هـەق)ە.[٦٩] لـە پـاڵ ئەمانەشدا وەك لە ئینسکلۆپیدیای ئیسـلامی (چـاپی ئینگلیزیەکەیـدا) هـاتووە" (بابـا تـاهیری هەمـەدانی)ش شـیعری بـە دیـالیکتی **گـۆران**، بـۆ بڵاوکردنـەوەی بیروباوەری ئەهلی هەق، لەناو (گۆران)ە نەخوێندەوارەکاندا نووسیوە.[٧٠]

ئـیتر ئـەم ئەدەبـە بـە دەم رەگ داکوتـانی زیـاترەوە، هـەر لـە بەخشـین و درەوشانەوەدا بووە، کە شاعیرانی دیار و ناوداری بـەر لـە مەولـەوی و سـەردەمی (مەولەوی)ش، هەر بەم دیالیکتە شیعریان نووسیوە، وەك:مەلا پەریشان (سـەدەی چواردەیەمی ز)، بێسارانی (**١٦٤١ ــــ ١٠٧٢ز**)، خانـای قوبـادی (**١٧٠٠ ــــ ١٧٥٩ز**)، مەلا خدری رواری (**١٧٢٥ ــــ ١٧٩٠ز**) صـەیدی هـەورامی (**١٧٨٤**

---

٦٧- دانای هەورامی (پیرشالیاری زەردەشتی، بەغدا) (١٩٦٨ ز).

٦٨- ماشەڵڵای سووری (سەرنجام)، (تارن)ی (١٣٤٤)، هەتاوی.

٦٩- مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی سەبارەت بەم کتێبە دەڵێ:شێوەی شیعرەکان و ناوەڕۆکیان ئەیسەلمێنن کە دیالیکتی هەورامی (٨٠٠) ساڵ لەمەوبەر، زمانی ئایین بووە. زاری زمانی کوردی لە تای بەراوردا (بەغدا ١٩٨١ز)، لاپەڕە (١٧).

٧٠- لیریکای شاعیری گەورەی کورد (مەولەوی) لاپەڕە (٣٢).

ـــ **١٨٣٥ز**)، میرزا شافیعی جامەڕێزی (**١٧٨٥ ـــــ ١٨٤٨ز**)، ئەحمەد بەگی کۆماسی (**١٧٩٣ ـــ ١٨٧٦ز**)، میرزا قادری پاوەیی (**١٨٣٥ ـــــ ١٩٠٧ز**)،... هتد. ئەمانە و جگە لەو (٢٧) شاعیرەی کە ئی.بی.سۆن، لەو وتارەیدا سەبارەت بە شیعری **گۆران** لەسەری نووسیون و نموونەی لە (**٧**) شاعیریان هێناوتەوە" کە کاتی خۆی دکتۆر سەعید سنەیی ئەم دەستنووسانەی پێشکەش کردوون و ئێستا لە مۆزەی بەریتانی پارێزراون و هەمووشیان پێش ساڵی (**١٧٨٨ز**) ژیاون.[٧١]

بەم ئاوەڕدانەوە خێرایە، لە مێژینەی ئەدەبی دیالیکتی **گۆران**، بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەم شێوە زمانە، لە دێرینەیەکی هەزار ساڵ زیاترەوە، جگە لە زمانی ئەدەبیی، زمانی ئایینیش بووە. لە تەمەنی ئەم هەزار ساڵ بەخشینەشدا، بێ پشوو بە تەوژم و تین و درەوشاوەیی هاتووە و زۆر کەم وابووە لەو تەمەنەیدا لە بەخشین کەوتووبێ. بە پێچەوانەی ئەدەبی دیالیکتی باکوورمان، کە ئەگەر لە قۆناغەکانی دەرکەوتنی شاعیرانی وەك:فەقێی تەیران (سەدەی چواردەیەمی زایین؟) و مەلای جزیری (سەدەی پانزەیەمی زایین) و ئەحمەدی خانی (**١٦٥٠ ـــــ ١٧٠٦ز**)دا، لە لووتکەدا بووبێ، ئەوا دوای ئەحمەدی خانی، ئیتر وزەی بەردەوامیی و درەوشاوەیی، وەك تین و تاوی پێشینەی نەما.

بەڵام ئەدەبی دیالیکتی **گۆران**، بێ پسانەوە لە بەخشیندا بووە و ئەو چەند شاعیرە (گۆران)ەی ناومان هێنان، نموونەگەلێکی کەمن، لە سەرومڕی ژمارەی زۆرتری ئەو شاعیرانەی کە لە تەمەنی ئەم هەزار ساڵەی دیالیکتەدا دەرکەوتوون. لەبەرئەوە ئەگەر بەرهەمی هەموو شاعیرە بەرزەکانی ئەم شێوە زمانە، بە شێوەیەکی زانستییانە بهێنرێنە ژێر توێژینەوە و لێکۆڵینەوە، ئەوا بۆمان ساغ دەبێتەوە، کە ئەدەبی ئەم دیالیکتە، لە ئەدەبی دیالیکتەکانی ترمان بە تەمەنتر و دەوڵەمەندتر و بەربلاوترە و بە تایبەتیش ئەو ژمارە زۆرە داستان و چیرۆکە دڵدارییانەی کە بەم دیالیکتە نووسراون و لەبەردەستدان و چیرۆکە ئەدەبیی دیالیکتەکانی ترماندا، یەکجار زۆرن و کەم وێنەن.

---

٧١- مینۆرسکی، گۆران، وەرگێرانی ناجی عەباس، گۆڤاری گەلاوێژ، بەغدا، ژمارە (٥، ٦، ٧، ٨، ٩، ١٠)، ساڵی (١٩٤٤).

ئەم بەراوردەشمان ئەگەر هەر بەرامبەر دیالیکتی کرمانجی باکوور بووبێ، هی ئەوەبووە کە دیالیکتەکانی ترمان، یان بەرهەمی ئەدەبیان زۆر کەم پێ نووسراوە، یان زۆر درەنگانێ کەوتنە بەخشین و درەوشانەوە" وەك ئەدەبی دیالیکتی باشوور (شێوەی سلێمانی)، کە بەرهەمی شیعری شاعیرانی سێ کوچکەی بابان:نالی و سالم و کوردی و هاورێکانیان" واتە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمی زایینەوە، کەوتە بەخشین و خۆنواندن.

جگەلەمەش، سیماکانی ئەدەبی دیالیکتی **گۆران**، لە چاو سیماکانی بەرهەمی ئەدەبی دیالیکتەکانی ترماندا، زۆرتر شەقلّ و هەوێنی خۆماڵییانە و بۆن و بەرامەی کوردەوارییان پێوە دیارە، کە لە بەکارهێنانی کێشی خۆماڵیی (کێشی دە برگەیی)، لە تێکڕای بەرهەمەکانی ئەم دیالیکتەدا دیاردەی بەڵگەنەویستە، کە بڵێین ئەدەبی ئەم دیالیکتە، تا چ رادەیەك هەڵقوڵاو و گۆشکراوی رەسەن و کوردستانییە... بۆیە دەڵێین ئەم دیالیکتە، رەگ و ریشەی لە مێژینەیەکی زۆر کۆندا داکوتاوە و هەر ئەمیش بووە بۆتە یەکێك لەو هۆکارانەی لە تەمەنی زیاتر لە شەش سەدەی میرنشینی ئەردەلان دا، کردوویەتی بە زمانی رەسمی و ئەدەبیی ئەم میرنشینە[٧٢] و ( هەر دەسەڵاتی ئەم میرنشینەن، ئەدەبی بە دیالیکتی (گۆران)ی پێشخست و گەیاندییە لووتکەی داهێنان و گەشەسەندن، [٧٣] بە رادەیەك کە زەبر و دەسەڵاتی داهێنەرانەی ئەدەبی ئەم دیالیکتە، هەمیشە لە سنووری میرنشینی ئەردەلانیشی تێپەڕاندووە و وەك (گۆران)ی شاعیر دەڵێ:(لە کاتی شکۆیا، جار بووە، سێ کوچکەی ناوەندی کەرکووك، هەمەدان و کرماشان هەمووی بگرێتەوە). [٧٤] بۆیە دەبینین لە نێوان ئەو (**٣٨**) نامەیەی مەولەوی، کە تا ئێستا بە چاپ گەیشتوون و ئەو شاعیرانەش کە شیعری لەگەڵدا گۆڕیونەتەوە،

---

٧٢- محمد أمين زكى: تأريخ الدول و الامارت الكردية في العهد الاسلامي، ترجمة محمد علي عوني، القاهرة/١٩٤٥ ــ صفحة (٢٧٦).

٧٣- ئەنوەر قادر محەمەد: لیریکای شاعیری گەورەی کورد، مەولەوی، لاپەڕە(٣٨).

٧٤- گۆران: یادی پیرەمێرد، بەغدا (١٩٥١ز)، لاپەڕە (٧٨).

هەندێکیان بۆ دۆستگەلێکن، لە دەرەوەی سنووری ئەم میرنشینەن، بەڵام لە هەمان کاتیشدا، نامەکانیش و شیعرەکانیش، بۆ ئەو دۆستانەن، کە ئەدەبی دیالیکتی **گۆران** شەرمەشقیانە و[75]، ئەوەندەشی کە ئێمە مەبەستمانە، نامە شیعرییەکانی (مەولەوی)ن، کە لەگەڵ ئەم شاعیرانەدا هەیەتی: ئەحمەد بەگی کۆماسی، مەلا نیزام، شێخ عەبدولڕەحمانی داخی، شێخ حەسەنی سازانی (بولبول)، مەلا فەتاحی جەباری، شێخ **مۆمنی** سازانی، مەلا عەبدولڕەحمانی نەجار، مەلا یونس، شێخ عەزیزی جانەوەرەیی، مەلا چراخ و زیبا خانم.

کەواتە مەولەوی هەڵگر و درێژەپێدەری پەیامێکی رەسەنی دەستاودەستکردووی نەوە، دوای نەوەیە" کە ئەم دیالیکتە توێشوویەتی. ئەم دیالیکتەش ئەوەندەی ئەو شەقڵگرتنە پێشکەوتووەی کە بەو عومرە بە دەستی هێناوە و ئەوەندەش کە لەگەڵ خەڵك و زێدەکەیاندا ژیاوە" بۆتە پێناسە و مێژوویەکی خەڵکەکە. (مەولەوی)ش لەم مەیدانەدا کە هات، بە عەشقێکی قاڵی یەزدانی و ئەفسانەییەوە، زۆر بە ئەمانەت و ئەمەکدارییەوە، بە دەسەڵاتێکی شاعیرانەی کەم وێنەوە، شوورە و سنوورێکی خەیاڵیی بە دەوری ئەم دیالیکتەدا دروستکردووە، کە ئەگەر بکرێ و بتوانین، ناوی دەنێین:کۆماری شیعری مەولەوی!، وەك چۆن ئیفلاتۆن کۆماری خەون و ئاواتی خۆی پێکهێناوە، (مەولەوی)ش لەم کۆمارەدا، بەسەر کێوی شیعری لەبن نەهاتووی خۆیەوە، وەك ئاسکێکی سڵۆك و بە پارێز! بە چاوی هەمیشە زیت و بێدار و بی ئۆقرەوە..

بە دڵە راوکە و بیرەبیرەیەکی بێ ئەندازەوە.
بەهەناوێکی هەڵوەدا و بێ ئارام و شپرزەوە..
کە گیان دەکەن بە تەنووری سوورەوەبووی گڕکانی ژانی شیعرپژانی بەردەوام..
هەر سات و رۆژ و شەوەی بەسەر رەوەزێکی نەدیوی ئەم کێوەوە..
هەر دەمەی بەلای خەم و خەندەیەکی تازەی ناو ئەم کۆمارەوە..
شارەزا و بە ئاگا، لە بچووکترین رووداوەکانی ناو ئەم کۆمارە،

---

٧٥- لەم (٣٨) نامەیە، تەنیا نامەیەك، کە بۆ کاك (ئەحمەدی شێخ)ی نووسیوە و تا ئێستا نازانین کە ئاخۆ کاك (ئەحمەدی شێخ)یش، بۆ دڵنەوایی مەولەوی، دیالیکتی (گۆران)ی خۆشویستووە، یانا!؟.

هـەر لـە شـنینەوەی چـڵە وەنەوشـەیەکی کاوانـەوە، تـا لەرینـەوەی چـڵە گیایەك،راچەنیوە و داچەڵەکیوە..

..شوێن فـڕینی باڵندەیـەکی کۆچـەریی کـەوتووەو تـا گەڕاوەتـەوە، پـەژارە و چاوەڕوان بووە..

..گوێی لە خوڕە و قەڵبەزەی ئـاوی دوورتـرین و تـەنگترین دەربەنـد و گـەروو بووە.

.. لە سەرما و سۆڵەی زستانە ساردەکاندا، توێی دەروونـی خـۆی، نـەك هـەر بـۆ مرۆڤی نیشتمانەکەی، بەڵکو بۆ نەسیم ــ ی نیشتمان کردووە بە لانە و ژووری گەرم:

**نەسیم!، پەنجەی پات ئەر سەردیی کێشـــــان**
**بدارەش نەتۆی دڵ، دەروون ڕیشــــــــــــان**

ئاشنایەتی و ئەوینی مەولەوی لەگەڵ سروشتی نیشـتمانەکەیدا، هـەموو تەمـەن و هەست و شیعری داگیر کردووە و لەیەکدا تواونەتـەوە.. بـە جۆرێـك وەك چـۆن دەڵـێن حەزرەتی سلێمان، زمانی باڵندە و گیانلەبەرانی زانیوە، (مەولـەوی)یش ئـاوا، زمـانی بوونەوەرانی سرووشتەکەی خۆی زانیوە و یەکە یەکـە، لـە گەڵیانـدا ژیـاوە و دواوە... سەری نـاوە بـە سـەریانەوە و رازی دڵـی خـۆی بـۆ هەڵڕشتوون...پیاسـەی هـەردان و سـەربەرزان و لای دۆسـتانی لەگەڵـدا کردوون...تیـری لـە دیـدەنی و تیـڕوانینی بەردەوامیان نەخواردووە و لە هەموو دیـدەنی و بـە سەرکردنەوەیەکیشـدا، جـار دوای جـار، جـوانتر و رازاوەتـر، هاتوونەتـە بەرچـاوی..وەخت و ناوەخـت بەسـەری کردوونەتەوە... لە بەرەبەیاندا، کە کازیوەی نیشتمانی دیـوە" وەك دڵدارەکـەی لـەناو نوێنی خەودا ببینێ، ئاوا هاتۆتە بەرچاوی و بە تاسەوە، سـەری لـە سـنگ و بەرۆکـە رووتەکەی کازیوە، نزیك دەکاتەوە و بۆنی دەکات:

**بۆی یەخەی سەحەر، پەی دەماخ دڵ**
**مانۆ وەنەسـیم، جێب جەمین گـوڵ**

..لەگەڵ کۆچی گەرمیان و کوێستانی خێڵاتی جاف دا، سەرەڕێیانی لێگرتووون و یەك یەك سەرژماری کردوون، تا بزانێ کامیان کەمە!..

ریشەی جەرگ و پەردەی دڵی خۆی بۆ کردوون بە نووشتەی چاوەزار و بە قۆڵ و مەچەکی کچە جوانەکانی جافەوەی بەستووە..

لە بچووکترین و دوورترین خەم و کۆستی ئازیزانیدا، کسپە و زام گەیوەتە دڵی ئەم و فرمێسکی شیعریی، لە خەمبار و کۆست کەوتووەکان، زۆرتر و بە سوێتر هەڵڕشتووە...

کە روومەتە سپی و سافەکانی شێخ عەزیزی جانەوەریی (هاوڕێی)، ئاوڵە دەردەکەن، وشەکانی ئەم، روومەتی خۆیان دەرنن...!

لەگەڵ (مەحموودی یاروەیس)ی کوڕ کوژراودا، گریان و شیوەننامەی شیعری چەندان جار گریاوی ئەم، بێ بڕانەوەتر بووە...

لە پرسەی ناکامیی شێخ صەمەدی خانەگادا، زاوا ڕۆیەی ئەم، بە کۆڵتر بووە...

لە کۆتەڵی جافەکانیشدا، شیعری ئەم، بۆ کوژرانی قادر بەگی کەیخوسرەو بەگ، بە جۆشتر بووە...

...ئەگەریش خۆی نەیتوانیبێ سەردانی دۆستێکی بکات، یەکێك لە بوونەوەرەکانی سروشتەکەی راسپاردووە، کە کارەکەی بۆ بکات... لەمەشدا زۆرترین راسپاردەکانی بە (بـــــا)دا ناردووە، کە لەم بوارەدا مەولەوی، تاقە شاعیرێکە، بە ئەندازەیەکی کەم وێنە، جۆرەکانی (بـــــا)ی زێدەکەی بناسێ و شیعری زۆریان بۆ بڵێ.[٧٦]

---

٧٦- بڕوانە ئەم نموونانە، کە باسی جۆرەکانی (بـــــا)یان تێدایە، بە تایبەتی نەسیم:

**نەوەخت هیجـــران، ویداعت فـــامـــا**

**نەوە شـــەماڵ دا، پەیامـــت ئامـــا!**

**ل١٣**

**ئاماوە وەهـــار، وەهـــار شـــادی**

**بۆی عەتر نەســیم، خونچـــەی ئازادی**

ل٣٨

زایفیم هەریەند جەحـــــەد بەرشــــی یەن
نەســـــــیم ئەر بارۆم عەجـــــایب نییەن
ل٤٩

رجام هـــەن فـــــەردا نەو گەردەلـــــوول دا
بویەری نـــــەژێر ســــــایەی رەســـــوولدا
ل٩٩

گاچوون بۆی نەســـــــیم وە رووی شـــەتاودا
گاچۆن گوڵ نەپـــای چۆڕەی بەفــــــــراودا
ل١٤٦

ئەو، سـەبوون سـفتەی پڕ داخ بێ پەرداخ
تۆ، بۆی شـــــنۆی بای ئێڵاخ نە دەمـــــاخ
ل١٤١

نەســـــــیم! بەس بویەر وەکۆســـــــاراندا
وەسەن شـــــــاناى وەڵگ وەدیــــــاراندا
ل١٤٣
شــــــنۆی رەشەبای زوسان هیجـــــــــران
ســــەر چڵەی عەیشـــــم کەردەن وە بوریان
ل١٢٩

...یان کە دۆستێکی بەسەر دەکاتەوە، یەکسەر لە پاڵیشیدا، ناوی ئەو جێگایە، یان رەمزێکی ئەو جێگایە ناو دەبا، کە ژینگەی دۆستەکەیەتی" وەك ئەوەی بە هەلی بزانێ و بە تیرێك دوو نیشان پێکەوە بپێکێ و بلێ:بیری هەردووکتان" بیری هەمووتان دەکەم و هەردووکتان لای من، تەواوکەری یەکترن و یەك شتن...لەمەشیاندا دیسان وەك مەبەستی بێ، زۆربەی ئەو جێگایانە ناو دەبات، کە لەناو کۆمارەکەیدان! ...واتە ئەو شوێنانەن کە دیالیکتی **گۆران** دەیانگرێتەوە، وەك: (بانە، ئاربەبا، سەقەلاّ، کێوی ئاتەشگەی پاوە، خانەگا و پاوە، قوللەی قەزاڵە، کێوی شاهۆ، شاکەل، چەمی زەڵم، رووباری سیروان، ئەردەلان، کێوی ئاویدەر ـ ی لای شاری سنە، مەریوان، زرێبار، کوێستانی ساراڵ، هەزارکانیان، قوللەی وەیس[77]...هتد).

---

**چۆن وەڵگ شـــادیی من وای دووریی لەیل**
**وەیشوم بەرد ئەو هەرد، نەو رشتەی سوەیل**
**ل١٦٠**

**پووش ئایریچم جـــای نەســـیم نییەن**
**هـــورکەردە و بـــەردیم تا وە لاش شییەن**
**ل٢٧٥**

**چ شیرین زەڕگەر، تۆف هەوای ســـەرد**
**گۆشراوە نە گۆش نەونەمامان کـــەرد**
**ل٢٧٨**

**شەماڵ! ئەرجوم هەن هەی وە فیدات بـــام**
**وە سەرگەرد باڵ شانای هەوات بـــام**
**ل٣٠٣**

٧٧- بڕوانە ئەم نموونانە:

چەپگەرد پەی دووریت شـــانا مۆرەی نەرد
وە زاهیر بانـــەش وە بەهانە کـــــەرد
ل٨

جـــە ســــــەرقەڵاوە مەگێڵوون پـــەی تۆ
دەك دیدەم هەردوو صەدجـــار فدێت بـــۆ
ل١٦

تانجەڕۆی ئەی چەم، ســـــیروان ئەو چەم
جۆشاوێ وەهەم، ئەی چەم تا ئەو چـــەم
ل١٣١

سەر بەر کەر نەسەر کۆی ئاتەشـــــگاوە
بدیە وەمەســـکەن خانەگا و پـــــاوە
ل٣٠٤

زار زار و خـــاس خـــاس، وە زار بناڵە
جاگیر نەســـــــەر ئەوج قوللەی قەزاڵە
ل٣٠٤

دڵەی خەم خەیاڵ، جــــۆش ئاوەردەوە
(مەعدوم) هەم هەوای زەهاو کـــەردەوە
ل٢٤٣

دیدەم ڕێژاوە، روخســـــــــارم زەردەن

جـــــەداخ یاران، پیران ـــ م کـــــەردەن

ل٣٥٤

ئانا دەور مدۆ وە شـــــــــــاهۆ کۆ ـــ وە

وە ســـــــــزای دووریی دیـــــدار تۆوە

ل٣٠٩

فەضای ســــــایەی عەرش دانای جەلیلەن

یا بارەگـــــــای پاك سەیید خەلیل ـــ ەن

ل٣٥٧

وادەی خاو نییەن، وادەی شکـــــــــارەن

دەشتەکەی پای هەرد شـــــاکـەل دیارەن

ل٣٧٣

گێچ مەدا سەبوون شـــــــــــارەزوور دڵ

ســـــــــێروان هوناو، دەروونش گوڵ گوڵ

ل٤١٨

واژواش مەویەرد، نەو دەمـــاخ، دەم دەم

تاف مەوەست ســـەراو، چەرخ زەڵم چەم

ل٤١٨

خاو خاو پەی نەچیر، چــــــەم وە نگاوە
تەك مەداین وە لای كۆی ئاتەشـــــگاوە
ل٤٩٠

من مات و بێدەنگ، بێ صەدا و نـــــاڵە
یەكێ بیم چون ســــەنگ قوللەی قەزاڵە
ل٤٩١

ئیسە و ئەڵماس دووری دڵ كــــــاوام
مــــەلال بەدحاڵ، ئەردەڵان مــــاوام
ل٤٩٢

دەی سا شۆ بوبەر نەو سوب ســـــەرحەردا
چۆن دووی هەناســــــــەم وە ئاویدەردا
ل٤٩٣

ها نە بانە دا، بێكــــــــەس كەفتەبێ
دیاربی ئـــــازار تۆ شـــــــنەفتەبێ
ل٤٩٧

ئایر ســــــەندەبێ، جـــە گردین لاوە
پووشەكەی جەســـــــتەش وە ئاربەباوە
ل٤٩٨

گێچ زرێوار هەرســــــــم مەوج  وەردەن
سارای مەریوان تەمـــــام هەڕ کەردەن
ل٥٠٠

شەوان هام رازەن، روان هاومـــــــاڵەن
(قلب الاســـد)م، قەوس ساراڵ ـــ ە ن
ل٥١٨

هــەوای سەر ساراڵ وەخسوس وەتەن بۆ
ئەرچی صەفای رۆح، راحەتیی تەن بۆ
ل٥٢٦

وە هەر جا تەشـــــــــریف تۆ ئەرزانییەن
هــــــەر دیدە پەی تۆ، هــەزار کـــانی یەن
ل٥٢٩

هاڵ بەدهاڵ بەدەن، هاڵی و هـــــــەواڵە
یانی های چۆن ســــەنگ قوللەی قەزاڵە
ل٥٣٢

ئارۆ من دەردم سەرمەشق قەیســــــــەن
نەجد سارای صاف پای قوللەی وەیس ـــ ەن
دیوانێکی دەستنووسی مەولەوی ـــ لای خۆم)

ئەمە ئەوەمان لا دووپات دەكاتەوە، كە مەولەوی هەر ئەم كۆمارەی خـۆی پـێ كۆمار و نیشتمانە و هیچ جێگایەكی تری پێ نیشـتمان نییـە، بۆیـە كـە ئەحمـەد بەگی كۆماسی، بۆ ناوچەی رەشت و گێلان دوور دەخرێتەوە، بە شین و شـەپۆڕەوە، هانا بۆ سروشت دەبا و گلەیی لە دۆستەكانی خۆی و ئەحمەد بـەگ (بونـەوەرەكانی سروشت) دەكات، كە ئیتر خۆیان نەڕازێننەوە و ماتەم بن، چـونكە كەسـێكی نـاو كۆمارەكە، جێیان دەهێڵێ:

**ملان!، سـەربەرزان!، كۆساران!، هـەردان!**
**بێ شەرتان، جـەداخ وەفاتان مـــەردان**
**چێشەن ئارایش ســـەرتا وە دامـان!؟**
**مەر خالۆم، وەعەزم سـەیرتان ئامان؟**
**مەشنیە چین چین چنور نەكـــــاوان**
**توخوا ماتەم بە، هـــاژەی وەفـراوان!**
ل١٤١

ئەمە لە كاتێكدا، كە ناوچەی رەشت و گێلان، ئەو شوێنە ناخۆشە نییە، دڵی تێـدا تەنگ بێ.

بەڵام بە پێچـەوانەوە، كـە دۆسـتێكی دووركەوتـەی، پـێ دەنێتـەوە سـنووری كۆمارەكەی، دڵ و دەروونی ئاوەدان و رۆشن دەبێتەوە و شاگەشـكە دەبـێو رۆحـی دەكەوێتە شایی...وەك چۆن بۆ هاتنەوەی شێخی بەهادین لە سەفەری حەج، دەڵێ:

**ئایینەی كاملْ!، ئازیزەكـــــەی فەرد،**
**فیدای ئامات بام سەفاییت ئاوەرد**
**خەیلێن گەرد پات، نەدیدەم دووربێ**
**یانەی چەم وێران، تەمام خاپووربێ**
**خاس بی تەشریفت هــــەم ئاوەردەوە،**

ئەم لکان و نووسانە پـڕ ئەوینــەی، پێناســەیەکی تایبەتمەنـد و دەگمـەنیان بـە مەولەوی داوە، کە لەناو سەرجەمی شاعیرانی کورددا، شیعری هیچیان ئەوەنـدەی شیعری مەولەوی، بۆنی نیشتمانیان لـێ نایەت...شیعری مەولەوی نوقمی خـەم و خەندەی نیشتمانە...بۆنی نیشتمانە...وەك چۆن بەدیتنی گوڵی نێرگز، بۆنی بـەهار دەکەین، بە شیعری (مەولەوی)ش، بۆنی خاکی مەولەوی دەکەین...ئەو بۆنەیەشی ئەوەندە شـاعیرانە و هونەرمەندانـە، ئاوێتـە و ئـاخێنراوی شـیعرەکانی کـردووە، رووخســار و نــاوەڕۆکی شــیعرەکانی پێکــەوە جۆشــداوە...لە رووخســاری هــیچ شیعرێکیا ئایدیا هاوار و ژاوەژاوی دروشم و پێدا هەڵدان ناکات...بۆیە لە شــیعری سەرومڕی ئەو شاعیرانەی کوردیشدا، کە لە ریزی پێشــەوەی دڵـدارانی نیشـتمانن، شیعری کەسیان، ئەوەندەی شیعری مەولەوی، عەشقی نیشـتمانیان لـە هەناویانـدا هەڵنەگرتووە... ئەگەریش هەڵیان گرتبێ، لە رووخسـاری شـیعرەکانیاندایە...نەك لەســەرلەبەری ناوەڕۆکدا...چـونکە مەولـەوی یـەکجار شـارەزای خـەم و خـەونی نیشتمانە... چونکە مەولـەوی لـە نزیکـەوە سـەری بـە دڵـی خاکـەوە نـاوە، تـا لێدانەکانی دڵی بژمێرێ...

بـۆ وێنــە، شــاعیرێکی پێشــینە و ســەودای نیشــتمانی وەك ئەحمــەدی خـانی (**١٦٥٠ز ـــ ١٧٠٦ز**)، سەرباری ئەوەش کە هەموو خەون و ئـاواتی، سـەرفرازی گەلەکەی بووە و لەم بوارەدا شاعیرانی تری کورد لەمەوە فێری دڵداری خاك بـوون، کەچی لە تێکڕای داستانی (مەم و زین)ەکەی دا، کە داسـتانێکی خۆماڵیيانەشـە، بەڵام لە باس و خواسـی پێوەنـدی کۆمەڵایـەتی و داب و نـەریتی خۆماڵیيانـەدا، ئەگــەر لەگــەڵ شــیعری شــاعیرانی داروســێکانی کــورددا، تێکــەڵ بکرێــت، ناناسرێتەوە...یان شاعیرێکی وەك حاجی قادری کۆیی (**١٨٢٤ ـــ ١٨٩٧ز**)، کە قوتابییەکی قوتابخانەکەی **خانی** یـە و بـە:بولبولی نیشـتمان ناسـراوە و سـەرەڕای ئەوەش کە (گۆران)ی شاعیر پێی دەڵێ:(ئەو نیشتمان پەرستە، دڵسـۆزە، کـە هـەر

هاوارێکی شیعری، بەشی شۆڕشێك ئاگر و جۆشی لە گەروو دەهێنایە دەرێ،[78] کەچی ئەگەر وەك بەراورد، چەپکە گوڵی شیعری، لەگەڵ شیعری مەولەوی، بە دوو دەستەوە بگیرێن، بێ هیچ دوودڵیەك، هەست دەکەی شیعری مەولەوی، زیاتر بۆنی نیشتمانیان لێ دێت... یان شاعیرێکی وەك **نالی** (**١٨٠٠ز ـــــ ١٨٧٣ز**)، کە ئاوارە و سەرهەڵگرتووی هەتاهەتایی و راستەقینەی پێناوی داروبەردی **سلێمانی** و **قەرەداخ** و **خاك وخۆڵ** و **حەبیبە** یە و (لەم شەرحی دەردی غوربەتە)ایاندا، گەیوەتە تینی و دڵی وەختە (ببێ بە ئاو و بە چاودا بکا عبوور)، دیسانەوە لەم دڵ بوونە بە ئاوەشدا، شیعری ئەوەندەی شیعری مەولەوی، هەنسکی تەڕ و بە سۆز و خۆماڵییانەی تێدا نییە.

یان شاعیرێکی وەك سالم (**١٨٠٠ ـــــ ١٨٦٦ز**)، کە دەتوانرێ ناوی بنرێ:شاعیری جاومێری و سوارچاکی بابان و لە هەموو نەبەردەکانی نێوان بابانی و عوسمانیدا، ئەگەریش راستەوخۆ، خۆی بەشداری نەکردبێ، شیعری شێوەننامەی بۆ قارەمانێتی بابان نووسیوە و بە داگیرکردنی میرنشینی بابان، گریانێك گریاوە، وەك **گۆران** دەڵێ:کە هەرگیز جۆش و کوڵی دانەمرکێتەوە.[79] کەچی ئەمیش، فرمێسکەکانی، ئەوەندەی فرمێسکە درشتەکانی مەولەوی، لە ئاوی **زەڵم** و **سیروان** ناچن...لەم بارەیەوە دکتۆر عزەددین مستەفا رەسول رایەکی نزیك بەم بۆچوونەمان هەیە، دەڵێ:(هەرچی وەسفی سرووشتە، لای خانی و نالی و شاعیرانی کلاسیکیمان، دیمەنێکی گشتی سرووشتمان دێتە بەرچاو، بێئەوەی جیای بکەینەوە، کە ئەمە، سروشتی کامە وڵاتە" بەڵام هەرچی نەخشەی سرووشتە لە شیعری (مەولەوی)دا، تەواو کوردستانییە،[80] .

بۆیە ئەگەر عەڤدالی دیتنی رووی راستەقینەی خۆمان بین" ئەگەر شەیدای دیتنی سەراپای نیشتمان بین" دەبێ سەیری ئاوێنەی شیعری مەولەوی بکەین" وەك

---

٧٨- یادی پیرەمێرد، وتاری مامۆستا **گۆران**، بەغدا (١٩٥١ز)، لاپەڕە (٧٥).

٧٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٨٠- میهرەجانی مەولەوی بەغدا (١٩٨٩ز)، لاپەڕە (١٠٣)،.

چۆن ئەگەر بۆ روخساری (شەمسی تەورێزی) بگەڕێین، دەبی دووتویێی شیعری (مەولانای رۆمی) بۆ بگەڕێین...!

شیعری مەولەوی، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر عارفانە و صۆفیانەیە، بەڵام بە پێچەوانەی هەموو شاعیرانی سەرتاسەری ئەم رێبازگەیەوە، کە ئەگەر جوانیی و خۆشەویستیی خوا (کردگار)، لە شیعرەکانیان دەربهێنین، هیچیان تێدا نامێنێتەوە" کەچی لە شیعری (مەولەوی)دا، ئەگەر ئەم کارەش بکەین و هەرشتێکی تریش دەرهاوێژین، هێشتا نیشتمان، بە هەموو کەژ و کوێستان و گەرمیان و رووبار و قەڵبەز و گوڵ و سروە و درەخت و مرۆڤییەوە، لە هەموو شیعرێکی **مەولەوی** دا، لە هەموو بەیتێکی **مەولەوی** دا، بەڵکو لە هەموو پیتێکی **مەولەوی** دا، بانگمان دەکەن و هانمان دەدەن، خۆشیانمان بوێن" چونکە لای **مەولەوی** ، هەموو جوانییەکانی **کردگار**، لە کوردستاندایە! لە سرووشتنی رەنگینی خاکی **مەولەوی** دایە... هیچ شتێك، هیچ جوانییەك، لە دەرەوەی خاکی **مەولەوی** دا نەبووە و نییە...ئەو جوانییانەش بە جۆرێك لە نیشتماندا دەبینیێ، کە تایبەتمەندی خۆماڵییانەیان پێوە بێ...یان بە واتای (گۆران)ی شاعیر : **مەولەوی** ئەو شاعیرە بەرز و نەمرەیە، کە هەموو بەیتێکی دیوانەکەی، کچە کوردێکی شۆخ و نازدارە، بە بەرگ و پۆیلانەی خۆماڵی تەواوەوە.[81]

* * *

لەم دیدەنیە کورتەی کۆمارەکەی **مەولەوی** دا، بە شوێن سەرەداوی ئەو رازەدا دەچینەوە، کە پێشتر دەرگامان لەسەر کردەوە و وتمان:ئەو دۆست و شاعیرانە و ئەو چیا و گوند و شارانەی ناویان لە نامە و شیعری **مەولەوی** دا بوو، هەموویان ئەوانە بوون کە کۆمارەکەی **مەولەوی** دەیگرتنەوە!. ئەمەش پرسیارێکمان لا دروست دەکات، کە ئەگەر

---

٨١- یادی پیرەمێرد (وتاری مامۆستا گۆران، بەغدا (١٩٥١ز)، لاپەڕە (٧٨).

پێشتریش کرابێ،[٨٢] لاوەکین بوون و خۆیان بۆ سۆراخ و وەڵامدانەوە، ماندوو نەکردووە. منیش رەنگە وەڵامی بنبڕم نەبێ. بۆیە هەر ئەوەندە توخنی دەکەوم، کە دەرەقەتی دێم و دەڵێم:لەم نامەگەلەی کە **مەولەوی،** بۆ دۆستان و بە تایبەتیش بۆ شاعیرانی نووسیون، نەك هەر نامە بۆ **نالی،** یان بۆ **مەحوی،** کە ئەمی دواییان لەچاو ئەوانی تردا، بە گیانی (**مەولەوی**)ش نزیکە و لەگەڵ **مەولەوی** دا، سەر بە یەك رێبازگەی ئایینیشن" بەڵکو تاقە نامەیەکیان تێدا نییە، بۆ شاعیرێکیان نوسرابێ، کە شیعری بە کێشی عروز نووسیبێ..! ئەمە لە کاتێکدا لە پاڵ کۆمارەکەی **مەولەوی** دا، واتا:لە میرنشینی **بابان** دا، کە دراوسێی نزیك و تێکەڵاوی هەمەلایەنەی لەگەڵ میرنشینی **ئەردەڵان دا** هەبووە و بە هۆی گواستنەوەی پایەتەختەکەشیانەوە، لە (**قەڵاچوالان**)ەوە، بۆ **سلێمانی** و دەسەڵات پەیداکردنی زیاتر و بە هێزبوونیان و بۆ چاولێکەرییش لە میرنشینی **ئەردەڵان،** کە شێوەزمانێکی شەقڵ گرتوویان هەبووە" پێویستی بوونی شێوەزمانێکی تازەیان لە قوتابخانە شیعریەکەی نالی و هاورێکانیدا دیووەتەوە و سەرومڕی ژیانی (**مەولەوی**)یش، هاوکاتی سەرهەڵدان و گەرمەی باس و خواسی ئەو قوتابخانە شیعرییەی **نالی** بووە...کەچی بۆ وێنە: **مەولەوی،** کە چەند جار نامە لە هەورامانەوە، بۆ بەغدا، بۆ (مەحمود پاشای جاف)[٨٣] دەنووسێ، یان کە مەولەوی خۆی لە بەغدا بووە و لەوێوە نامە بۆ ئەحمەد پریسی بۆ بناری هەورامان ئەنووسێ[٨٤] بەسەر **سلێمانی** تازە پێتەختی **بابان** و شاری **نالی** و هاورێکانیدا، باز دەدا و لەناوهێنانی ئەو جێگایانەشدا، لە دووتوێی شیعرەکانیدا بەسەرمان کردنەوە" ناوی تاقە چیا و گوند و شارۆچکە و شارێکیش ناهێنێ، کە لە جوگرافیای میرنشینی **باباندان**..! ئەمە ئەوەمان لا دەسەڵمێنێ، کە **مەولەوی** کەم و زۆر پێوەندی ئەدەبیی لەگەڵ شاعیرانی ئەم قوتابخانە

---

٨٢- میهرەجانی مەولەوی، وتاری فاتیح عەبدولکریم، لاپەڕە (٤٧)، هەروەها لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی لاپەڕە (٧٥، ٧٦).

٨٣- یادی مەردان، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٤٦١، ٤٦٤، ٤٦٥، ٤٦٧. هەروەها: دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (١٥٥، ١٨٥).

٨٤- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٣١٥).

تازەیــەدا نــەبووە و نەیویســتووە بیبــیّ و... بــە نامــەکان و بــە ناوهیّنــانی شــویّنە جوگرافییەکانیشــدا دەردەکــەویّ، کــە لەســەر چــەمی (زەڵــم)ی خۆرئــاوای میرنشــینی **ئەردەڵانەوە**، تا قوڵلەی (وەیس)ی، سنووری خۆرهەڵاتی میرنشینی **ئەردەڵان** دەبینیّ.!

وەڵامی ئەم پرسیارە سەختە و بەو هۆیەشەوە، کە تا ئێستا بەڵگەیەکمان لەم بــوارەدا لەبەردەستادا نییە و ئاگاداری ئەو باس و خواسانەش نین، کە لە دانیشتنە ئەدەبییــەکانی ناو مزگەوت و دیوەخانەکانی ئەو رۆژگارەدا، لەمەڕ شیعر و زمــانی کوردییــەوە کــرابن" بۆیە ناچار هەر پەنا دەبینەوە بەر دەقی شیعری، شاعیرانی دیالیکتی **گۆران** و دەڵێین ئــەم قوتابخانەیە، هەموویان پابەندی پێڕەوکردنی ئەم سیمایانە بوون، کە لەمێژەوە لە شــیعری ئەم **دیالیکتەدا** هەبووە بە گشتی و بە تایبــەتیش کێشــی خۆماڵییانــە و رەســەنی (١٠ بڕگــــەیی)، کــــە زۆرتــــرین ئــــەدەبی میللــــی و فۆلکلــــۆری کــــوردی پــــیّ نووسراوە...لەسەرووشیانەوە **مەولەوی**، کە لە هــەموویان زیــاتر دڵبەســتەی ئــەم کێشــە بووە و پێشی وابووە کە شیعری کوردی، دەبیّ بەو کێشە **خۆماڵیــە** بنووســریّ و، چــونکە خۆی کە دوو کتێبی باوەڕنامەی بە زمانی بیانی، واتە:(الفضـيلة و الفـوائح)ەکـەی[٨٥] بــە زمــانی عــەرەبی و فارســی نووســیوە" کــە کێشــێکی عــروزە و بریتییــە لــە شــەش جار:**مُستفعِلن**ە کە چی (عەقیدەی مرضية)کەی[٨٦] بە کوردی نووسیوە" لەگەڵ ئەوەشــدا کە پەیامی ئەم کتێبەش، هەمان پەیامی :(الفضیلة و الفوائح)ە، بەڵام چــونکە ئــەمیانی بە کوردی نووسیوە" بە کێشی (١٠ بڕگەیی)ی خۆمــاڵی دایڕشــتووە. جگــە لەمانــەش، چونکە شێوەزمانەکەشیان، بەری رەنــج و شــەونخوونی دەیــان و بگــرە ســەدان شــاعیر و رووناکبیر و زانــای ناســراو و گومنــاوی نــاو ئــەو تەمەنــە درێــژەی مێــژووی کلتــووری ناوچەیەکی بەرین بووە" بۆیە من پێموایە کە: **مەولەوی** ئــەو قوتابخانــە شــیعرییە عــروز ئامێزەی **نالی**، بە **کودەتایەکی نامۆ** و **ناوەخت** بۆ سەر شێوەزمانی (گۆران) زانیوە و بــە هیچ شێوەیەك لە کۆمارەکەی خۆیدا، تەنانەت وەك **پرژی** باسکردنیش، باســی نــەکردوون و جێگەی نەکردونەتــەوە. چــونکە وەك وتمــان هــەر نیشــتمانی شــیعری رەگ داکوتــاوی دیالیکتی (گۆران)ی پیّ نیشتمان بووە. بۆ پشتیوانیش لــەم بۆچــوونەمان خۆشــبەختانە،

---

٨٥- بڕوانە (الوسيلة في شرح الفضيلة) بغداد (١٩٧٢ز)

٨٦-بڕوانە:عەقیدەی مرضية، مەولەوی، شەرح و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، بەغدا، (١٩٨٨ز).

ماوەیەك بەر لە نووسینی ئەم چەند لاپەڕەیە، لە ماڵێكی شیعر و هونەر ئـامێزی شـاری سنەی[87] شیریندا، دیوانێكی دەستنووسی (مەولەوی)مان دییەوە، كە روونووسـی دەسـت خەتی **مەولەوی** خۆیەتی و پێشكەشی مامۆستاكەی خۆی:حاجی مامۆستا (مینـەبری)ی كردووە و لە پێشكەش كردنەكەشدا ئەوە دەسەڵمێنێ كە دیارییەكـەی، واتە:شـیعرەكانی، بە شێوەزمانی (گۆران)نن، كە بەجۆرە بە فارسی، پێشكەشی دەكا:

(در خـاطر محبان جانی سوزش مشتاقان وارزومندان جنانی، چه در لباس تـازی و چه در كرباس گورانی تفاوتی نخواهد فرمود، وبر بی التفاتی نخواهـد افـزود. ارى (هر یكی را اصطلاحی دادەایم) هـر یكـی را سـیرتی بنهـادەایم).[88] پـس فقـرات گویای خاموش نایب فقـیر مـدهوش اسـت، یسـلم علـیكم و علـی مـن لـدیكم، عـبدالرحیم المعدوم.

---

٨٧- مەبەست لە ماڵی باوكی هونەرمەندانی ناسراو، هاوڕێیانم! كاكە هادی و كاكە مەهدی (زیائەددینی)یە، كە باوكی كۆچكردوویان شاعیر:شێخ محەمەد جەمیل زیائەددینی، (١٩٢٥ ـــ ١٩٨٣ز)، كوڕی شێخ محەمەد شەریف، كوڕی شاعیری گەورە و ناسراوی كورد (شێخ محەمەد سەلیم) ناسراو بە **سالمی سنە**، لە ژیانی خۆیدا، بە خەتێكی زۆر خۆش، روونووسی دیوانێكی **مەولەوی تاوەگۆزی** كردووە، كە **مەولەوی** ئەم دیوانەی بە خەتی خۆی، پێشكەش بە مامۆستاكەی خۆی !!حاجی مامۆستای مینبەری كردووە. مزگێنی دەدەم بە خوێنەران و شیعردۆستانی مەولەوی، كە ئێستا ئەم دیوانە، لای منە و توێژینەوەیەكی ورد و قووڵم لەسەر كردووە و ئامادەی چاپە. ئەوەی جێی مژدەیە لەم دیوانەدا، نزیكەی (٤٠) چل شیعر لەم دیوانەیەدا، كە لە دیوانە چاپكراوەكەی مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس دا نییە.

٨٨- هر یكی را اصطلاحی دادەایم...هتد، بەیتە شیعرێكی (مەولانای رۆمی)یە:مەولەوی لە نیازەكەی خۆی هێناویەتییەوە، تا لای مامۆستاكەی، پاكانە بۆ ئەوە بكا و بڵێ:من، كە بە شێوەی (گۆران)ی شیعر دەنووسم، بەهرەیەكە خوا پێی داوم، لەمەشدا لای خوا، جیاوازی نییە، بە هەر زمانێك بنووسم.

***سەرنج:**

ئەم وتارە بەشێكە لە كتێبێكی سەربەخۆ، بە ناوی (خوێندنەویەەكی تازەی مەولەوی)، كە لە ئاییندەیەكی نزیكدا بە چاپی ئەگەیەنم..لە هەمان كاتیشدا، هەر ئەم وتارە، لە كۆنگرەی (مەولەوی)دا خوێندرایەوە، كە لە شاری (سەقز)، لە رۆژانی (٢٩ تا ١٩٩٢/٨/٣١ز) سازدرا.

## (1)

موزیك و گۆرانی بە گشتی و موزیك بە تایبەتی لە شیعری **مەولەوی** تاوەگوزی (**١٨٠٦ ـــ ١٨٨٢ز**)دا، دیاردەیەكی ئەوەندە زەق و بەرچاوە، كە دەتوانین **بڵێین** نەك هەر لەناو **زنجیرەی شاعیرانی دیالێكتی** (**گۆران**)دا، بەو ئەندازەیە ئاوەڕی لێنەدراوەتەوە، **بەڵكو لای شاعیرانی دیالێكتە** جیاوازەكانی تری كوردیش، بەو چەندایەتی و هوشیاریی و ڕێز و شكۆیەوە، باس لە موزیك و گۆرانی نەكراوە. لەم رووەوە كەم شیعر و قەسیدەی مەولەوی هەیە، ئاماژەی بە موزیك و ئامێرەكانی موزیك نەكردبێ. ئامێرەكانیش ئەوەندە ورد و شارەزایانە باس دەكات، مەگەر هەر ئەو كەسانە بیزانن، كە بە تایبەتی لە بوارێكی موزیكدا كاریان كردبێ، یان ڕاستەخۆ خۆیان یەكێك لە ئامێرەكانی موزیكیان ژەندبێ.

ئەم تایبەتمەندییەی **مەولەوی تاوەگۆزی**، لەو كاتانەدا ئاشكراتر دەردەكەوێ، كە بۆ ئەم مەبەستە بەراوردێك لە نێوان شیعری مەولەوی و شیعری شاعیرانی هاودیالێكت و هاوسەردەم و هاوناوچەكەی خۆی، وەك نموونەی: **ئەحمەد بەگی كۆماسی** و **مەلا مستەفای بێسارانی** دا بكەین، كە ئەگەر چی ئەوانیش وەك مەولەوی لە كەش و هەوای كۆمەڵایەتی و ئابووریدا ژیاون و دۆستایەتی بەتین و نامەی شیعرییش لە نێوانیاندا هەبووە، بەڵام ئاماژەكانی ئەوان بۆ موزیك و گۆرانی، نەك هەر بە ئەندازەی ئاماژەكانی **مەولەوی** نییە، بەڵكو بە ئاستەمێك هەست بە بوونی هەندێ وردە ئاماژە بۆ **موزیك و گۆرانی** دەكەین.. ئەمە لە كاتێكدا كە دیالێكتی **گۆران**، خۆی لە خۆیدا جۆرە ئاواز و ترپە (ئیقاع)ێكی موزیكی زۆر شیرن و شاراوە، لە هەوێن و دووتوێی واژەكانی خۆیدا حەشاردراوە و شێوەزارێكە، هەر دەڵێی هەر لە بنەڕەت و بناواندا بۆ ئەوە دروست بووە، تا شیعری پێ بنووسرێ. بۆیە ئاوێتەبوونی ئەم هەوێنی ئاوازانەی ناو هەناوی

واژەکانی ئەم دیالێکتە، لەگەڵ ئەو هەموو ئاماژە جوانانەی مەولەوی دا بۆ **موزیك و گۆرانی**، ئەوەندەی تر جوانیی و شیرینی بە شیعری مەولەوی بەخشیوە و بە هەردووکیان شیعری (**مەولەوی**)یان پڕ کردووە لە ترپە و تاڤگە و شەپۆڵی لە بن نەهاتووی ئاوازی موزیکی شیعر.

بۆ گەڕان بە شوێن هۆیەکانی ئەم تایبەتمەندیی و جیاوازییەی شیعری مەولەوی دا، کە ئێمە مەبەستمانە و بریتییە لە ڕەگەزی موزیك و گۆرانی، با لە سەرەتاوە بە شوێن کەرەسەکانی ئەم ڕەگەزەدا بگەڕێین و بەسەریان بکەینەوە.

مەولەوی لە بواری ناوهێنانی موزیکدا، ناوی ئامێرەکانی:دەف، سەمتوور، چەنگ، نەی، روباب، تەموورە، کەمانچە، تار، **چل** چەنگ... دینیٚ، کە وەك دەزانین هەندیٚ لەم ئامێرانە لەسەردەمی رمێن و برەوی ئایینی (**زەرتووشت**) لە کوردستان دا بە کاربراون، بە تایبەتیش:چەنگ، **چل** چەنگ، سەمتوور، کە بێگومان (مەولەوی)ش لەگەڵ ئێمەدا ئەم راستییە دەزانیٚ، بۆیە هەر لە موزیکژەنانی رۆژگاری دەوڵەتی ساسانی (**٢٢٧ ـــ ٦٣٣ز**)، کە پەیڕەوی ئایینی زەرتوتشیان کردووە، ناوی بەنامێترین جووتە موزیکژەنی وەك **نەکیسا** و **باربەد** دێنیٚ:

**کەف بدە لە دەف، پەنجەت لە رووی نەی**
**وێنەی باربەد، بەزم ئارای کەی**
**نەکیسا ئاسا، دەس دەر وە سەمتوور**
**دەف و نەی و چەنگ، باوەر وە حزوور**[89]

بەڵام ئایینی زەرتوشت، تا هاتنی ئایینی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی بە ناو کوردستان (**٦٥١**ز)دا، پەیڕەوکراوە و دواتر کە هەر لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئایینی ئیسلامەوە، دەوڵەتی ساسانی لەناوبراوە، ئیتر زۆر لە ڕیبەران و مووغەکانی ئایینی زەرتوشتی، خۆیان لە ناوچە سەختەکانی **هەورامان** دا قایمکردووە و دوای تێپەڕبوونی رۆژگارێکی

٨٩- دیوانێکی دەستنووسی هێشتا چاپ نەکراوی مەولەوی (لای خۆم).

درێژ، ئاڵۆگۆڕیان بەسەر ئایینی زەرتوشت دا هێناوە و ئاینێکی تریان لێ پێکهێناوە، کە بە ئایینی **ئەهلی هەق** = **یارسان** ناسراوە و بەرنامە و رێسای ئاینەکەیشیان، لە کتێبێکی تایبەت بەم ئایینە، بە زمانی کوردی دیالیکتی **گۆران** و **کرمانجی خواروو**، بە ناوی **سەرئەنجام**، بە شیعری دوو بەیتیی (**مەسنەوی**) داناوە، کە کێشی شیعرە دوو بەیتییەکانی **سەرئەنجام** بریتییە لە کێشی **پەنجە** = **هیجا** و دواتریش سەرلەبەری شاعیرانی دیالیکتی گۆران، هەر بە هەمان **کێش** شیعریان نووسیوە[٩٠].

ئەوەی ئێمە سەبارەت بەم ئایینەی ئەهلی هەق = یارسان مەبەستمانە و وەك میراتگرێکی ئایینی زەرتووشت هاتە کایەوە و لە ناوچەکانی هەوراماندا سەری هەڵداو دواتر لە هەرێمەکانی کرماشان و لوڕستاندا بڵاوبۆوە و وتیشمان پەیڕەوکارانی ئەم ئایینەش، وەك ئایینی زەرتوشت، ئامێری (موزیك)یان لە سرووت و ترادیسیۆنەکانی خواپەرستیی خۆیاندا، تێکەڵ ڕاز و سکاڵایان دەکرد، بۆیە لای ئەمانیش **موزیك** بووە هەوێن و کۆڵەگەیەکی پیرۆزی پێکهاتەی ئایینەکەیان.

بەڵام مەولەوی تاوەگۆزی، لەگەڵ ئەوەشدا، کە بە زێد و جوگرافیا و (شێوەزار)یش، لەناوجەرگەی قەڵەمڕەوی پێڕەوانی ئەم ئایینەی (ئەهلی هەق = یارسان)یشدا، نییە و وەك موسڵمانێکی بیروباوەڕ قایم و تۆکمە و پەیڕەوکار و تەنانەت خەلیفەیەکی بەرجەستە و درەوشاوەی ڕێبازی **نەقشبەندی،** سەر بە ڕابەری ناسراو: **شێخ عوسمانی** تەوێلە: شێخی سیراجەددین (١٧٨٠ـــ ١٨٦٦ز) و زانیاریی و شارەزاییەکی زۆریشی لە فیقهی ئیسلامیدا هەیە و چەندان کتێبی وەك: **العقیدە المرچیە و الفچلیە** و ...هەیە، کەچی **دڵبەستەبوون** و سەراسیمە بوونێکی سەیر و ئاشکرای بە بنەما و گەلێ لایەنی ئەم ئایینە(ئەهلی هەق)وە هەیە، کە هیماکانی ئەم سەراسیمەیی و **دڵبەستەبوونەی** بەم لایەنانەوە، لە شیعرەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە، وەك ئەوەی لایەنێکی بنەڕەتیی و بەرچاوی ئەم ئایینە، بڕوای بە جێگەگۆڕکێی(ڕۆح = گیان) هەیە، لە جەستەیەکی

---

٩٠- سەرئەنجام:بریتییە لە ٦ بەرگ: دەورەی حەوتەوانە، بارگە بارگە، گلیم و کول، دەورەی چل تەن، دەورەی عابدین، وردە سەرئەنجام.

مــردووەوە، بــۆ جەســتەیەکی تــازە لــە دایکبــووی زینــدوو، واتــە: (تناســخ[91])، یــان: (دۆنادۆن)هەیە و ماناشیان بە روونیی ئەمەیە کە هەموو بوونەوەر و ئەفرێنراوەکانی ئـەم گەردوونە، رۆحیان لەبەردایە و ئەم (رۆح)ەش، نامرێ و دوای مردنی جەستەیان، دووبـارە و ســەرلەنوێ رۆحیــان لــە کــات و ســەردەمی تــردا، بەبەرجەســتەی تــردا دەکرێتــەوە و ئەوەندەش پێوەندی بە مرۆڤەوە هەبێ، ئەگەر مرۆڤەکە چـاك و پـاك بێـت، ئــەوا رۆحـی بەبەرجەستەی گیانلەبەر و مرۆڤی چاك و پـاکی دواتــردا دەکرێتــەوە و پێچەوانەکەشــی، هەروا دەکەوێتەوە.

مەولەوی لە هەندێ شیعریدا، ئاوڕی لە فەلسەفەی ئەم ئایینــە داوەتــەوە، وەك نموونەی ئەم دوو پارچە شیعرەی کـە لــە هــەردوو شــیعرەکەدا، لــە زمــانی پارچــە شووشەیەکی شکاوەوە بۆ مەولەوی دەدوێن و چیرۆکی رۆحــی بــە (تناســخ) بــووی خۆیان، بۆ مەولەوی دەگێڕنەوە، کە چۆن لە پارچە بەردێکەوە، بوونەتــە شووشــە و دواتریش کراونەتە پەرداخ (لێوان)، کە ئەمە ســەرەتا و چــەند بــەیتێکی هەریەکـە لەو دوو شیعرەیە*:

**(١)**

**رویَ فکر بەخت سیایی وێم مەکەرد:**
**پەی چێش هەر پەستیی پەرێ من ئاوەرد!**
**یاران گشت کەیف وەش، سەفا فراوان**
**یەك یەك وە ئەعلای مەقامان یاوان**

---

٩١- لەم بارەیەوە پەیڕەوانی (ئەهلی هەق)، لە جیاتی واژەی (تناسخ)، واژەی تری وەك:(پۆشاك پۆشیی)، یان: (دۆنادۆن) یش بەکاردەبەن، کە (دۆنادۆن)، لە (دۆن)ی تورکییەوە هاتووە و هەمان مانای (پۆشاك) دەگەیەنێ. لەم ڕوانگەیەوە پێڕەوانی ئەم ئایینە پێیان وایە (خوا)ش بۆ خۆی پۆشاکی خۆی دەگۆڕێ و لە شێوەی مرۆڤدا دەردەکەوێ. بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە، بنواڕە:چەند باسێك دەربارەی ئەهلی هەق، و. لە فەرنساییەوە:د.نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپەمەنی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٥، لاپەڕە١٥٧.

**گرد سەرشار مەی، لەقا نماوە**
**هەر من بەستەی خاك، چەم ئەو دماوە**
**جەو فکرەدا بیم، یەك هاودەرد وێم**
**رێزە بلووریٚ قەدیمش دا پێم**
**ئاماوە جواو، رێزەی قەدیم ساڵ**
**بە زوبان حاڵ فەسیح تەر جەقاڵ**
**وات: من سەنگیٚ بیم، کەفتەی هەواران**
**بیٚ قەدر و قیمەت، ناڕەوای شاران[٩٢]**

**(٢)**

**نەتیـــــجەی پاك دین، شێخ سازانی**
**خـــــاس وەتەن نەدڵ (مەعدووم) سازانی**
**پەرســــــام حسب الامر، گوزەشتەی ئەحواڵ**
**جـــــواو دا رێزەی شـــــیشـــــەی قەدیم ساڵ**
**زەرفیٚ بیـــــــم، نـــــەتۆی وەخت شامەوە**
**چـــــــون ستـــــــارەی سوبح،مەدرەوشامەوە**
**پەی گوڵاو پاشیی و نەشئەی بەزم (کەی)**
**گا پڕ گوڵاو بیم، گا سەرشار مەی[٩٣]**

***   *   ***

جگە لەم لایەنە، مەولەوی لایەنێکی تری شانازیی پیێڕەوانــی ئـاییــنی (ئــەهلی هەق = یارســان)ی بەســەرکردۆتەوە، کــە شــانازیکردنیانە بــە رابــەرانی گــەورە و

---

٩٢- (دیوانی مەلەوی، کۆکردنەوە و لیکۆڵینەوە و لێکدانەوە و لەسەر نووسینی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ، بەغداد، چاپخانەی نەجاح ١٩٦١ز، لاپەڕە٢٥٦)

٩٣- (دیوانی مەولەوی، ل٤٢)

کۆچــکردووی خۆیانــەوە. یــەکێکیش لــەو رابەرانــەیان، کــە لەپلــەی (فریشــتەی حەوتەوانە)دا، دایدەنێن (باوەیادگار)ە .

(باوەیادگار)، نازناوی ئایینی (سەیید ئەحمەدی عەلــەوی بــەرزنجی ســەرانەیی)یە، کە لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا ژیاوە و ســاڵی (٧٩٥ك ـــــ ١٣٩٢ز)، بــە دەســتی لەشکری تەیمووری لەنگ کوژراوە و لای پیڕەوانی ئایینی **ئــەهلی هــەق**، یەکێکــە لــە فریشتەکانی (هەفتەن)، یــان (حەوتەوانــە) و گڵکۆیەکــەی لەســەر چیای (داڵــەهۆ)ی (سەرانە)یە و مەزاری پیرۆزی ئەهلی هەقەکانە[٩٤].

بۆ ئەوەش خوێنەری هێژا هەندێك زانیاریی لە بارەی (فریشتەکانی حەتەوانە)ی ئایینی (ئەهلی هەق)ەوە هەبێ، دەبــێ بڵــێین: بنــەمای ســەرەکی لــە سیســتەمی ئایینی (ئەهلی هــەق)دا، بریتییــە لــە بــاوەڕبوون بــە دەرکــەوتنی یــەك لــە دوای یەك(بەرودوا)ی خودایەتی (**Divinite**) ، یان (پاشای جیهان)، کە هەر وەکو خــۆی دەمینێتەوە و تەنیا (پۆشاکەکانی)، یان:(دۆن = **don**)ەکانی، یەك لــە دووی یــەك دەگۆڕدرێن و دەتوانین هەندێ لەوانە بژمێرین:

یەکەمین دەورە:**Cycle**، دەورەی ئەزەلە:**Pretemite**، ئــەوەی خاوەنــدگار، کــە چوار فریشتەی لە دەوورە: جوبرایل، میکایل، ئیسرائیل و عیزرائیل.

دووەمین دەورە: ئەوەی مورتەزا عەلی = عەلی)یە، کە فریشتەکانی بریتین لــە: دەستەیەك لە موسڵمانانی ناسراو:ســەلمان، قەمبــەر، محەمــەد، نۆچیر و دواتــریش فاتیمە.

---

٩٤- بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە، بنواڕە:

ـــــ چەند باسێك دەربارەی ئەهلی هەق. سەرچاوەی پێشتر باسکراو. لاپەڕە (٤٤ ـــــ ٤٧).

ـــــ مکری، دکتر محمد:تحقیق دربارەی یکی از پنچاقهای تاریخی کردستان از قرن دهم هجری (قبالەی انزلە)در مجلەی اسیایی پاریس، ١٩٦٣،ص٢٢٩ ـــــ ٢٥٦. (ئەم زانیارییە لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە:جەعفەر، مامۆستا:مێژووی بیری کوردی، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هوشیاری (ی.ن.ك)، چاپی یەکەم، سلێمانی/٢٠٠٩، ل٢٠٤تا ٢١٠.

وەك سەرنج دەدەین لەم دەورەیەدا شوێن و پلە و پایـەی مەزنایـەتیی (عـەلی) دەردەکەوێ، کە لە پلەی یەکەمیانە.
سێیەمین دەورە: بریتییە لە دەورەی (شاخوشین)، فریشتەکانیشی بریتین لە: بابا تاهیری هەمەدانی (شاعیر)، بابا بوزرگ، کاکە ڕەزا، کۆرێ فەقێ و مامەد جەلال.
چوارەمین دەورە: بریتییە لـە: دەورەی سـوڵتان (سـوهاك)، بـەیاوەریی:بنامین، داوود، پیرمووسێ، مستەفا داوودان، خاتوون دایرێ، کە هەندێ جاریش (خـاتوون رەزبار)، یان: (دایە ڕێزبار = دایە رەمزیار) شوێنی دەگرێتەوە.
هەڵبەتە هەر یەك لەم فریشـتانە، ڕۆڵـی تایبـەتی خۆیـان هەیـە و بـەپێی پرنسیبەکانی ئەهلی هەق دیاری کراون، کە وردەکارییـەکانی ئـەو پرەنسـیب و زانیارییانە، بـۆ ئـەم بابەتـەی ئێمـە، لـە مەبەسـتمان دوور دەخاتـەوە، بۆیـە دەگەڕێمەوە بۆ کرۆکی مەبەستەکەمان و دەڵێم: مەولـەوی شـیعرێکی زۆر بـە کوڵ و بە سۆزی لەسەر گۆڕی (باوەیادگار) و بۆ خودی (باوەیادگار) نووسیوە ، کە ناوەڕۆکی شیعرەکەی مەولەوی، ئەوەنـدە زانیـاریی قـووڵی لـەبارەی پلـەو پایەی (باوەیادگـار) و (دۆنـادۆن) و (حەوتەوانـە) و هەنـدێ لـە فریشـتەکانی حەوتەوانە و بە تایبەتیش (عـەلی: مورتـەزا عـەلی) تێدایـە، کـە نیشـانەی پاشـخانێکی زۆر شـارەزایانەی (مەولەوی)یـە، لـە بـارەی ئـەهلی هەقـەوە. لەبەرئەوە ئاوەڕدانـەوەی مەولـەوی لـە (باوەیادگـار) و بەسـەرکردنەوەی ئـەم کەسـایەتییە مەزنـەی ئـەهلی هـەق، لەلایـەن (مەولەوی)یـەوە، لەلایەکـەوە ئاوەڕدانەوەیەکی ئەوپەڕی هۆشیارانەی مەولـەوی یـە لـەم ئایینـە کوردییـە و لەلایەکی تریشەوە کرانەوە و دیـالۆگێکی خوێندەوارانـەی تاقانـە شـاعیرێکی موسڵمانە، لەگەڵ ئایینێکی تری نەتەوەکەی خۆیدا، کە ئەمـە نـەك هـەر بـۆ شاعیرێکی موسڵمانی ئەو سەردەمە، بەڵکو بۆ نزیکەی (١٥٠) ساڵ زیاتر بەر لە ئێستا، زۆر ئەستەم بـووە، کـە وەك دەزانـین ئـەم ئایینـە لەلایـەن زۆر لـە موسڵمانانی بیرتەسك و دەمار گـرژ و تەنانـەت خوێنـدەوان و شاعیرانیشـەوە دژایەتی کراوە و تانە و تەشەری زۆریان لێدراوە.خۆ ئەگەر لـەم بۆنەیـەدا ئـەو شیعرەی شاعیری گەورە: شێخ ڕەزای تاڵەبانی (**١٨٣١ ـــ ١٩١٠ز**)مان بە یاد بێتەوە، کە لەهەمان ڕۆژگاری ئەم شیعرەی مەولەوی دا، دژی پێڕەوانی ئەهلی

هەق (کاکەیی) نووسیویەتی و چ سووکایەتییەکی بە پیرۆزییەکانی ئەم ئایینە کردووە[٩٥]، یان شاعیرێکی سەر بەهەمان (ڕێباز و شێخ و پیر) ی مەولەوی، وەك (مەحوی: ١٨٣٢-١٩٠٦ز)، کە توانج و سووکایەتیی بە یەکێك لە ڕەمزە پیرۆزەکانی پێڕەوانی ئەهلی هەق، واتە : (دایە ڕێزبار) دەکات[٩٦]، ئەوسا دەزانین کە ئەم شیعرەی مەولەوی، لەو رۆژگارەدا و بگرە بۆ ئێستاش، وەڕسوڕانێکی چەند نوێیە لەم بوارەدا، چونکە ئەم شیعرەی مەولەوی بۆ (باوەیادگار). هەروا ڕووداوێکی شیعریی و بیرۆکەیەکی سۆزداریی و ڕاگوزارییانە نییە، بە تایبەتی کە وەك لەناوەڕۆکی شیعرەکەدا دەردەکەوێ، مەولەوی لە تەمەنێکی تەواو کامڵ و پێگەیشتوودا لەگەڵ ڕۆحی (باوەیادگار)دا دەدوێ، کە هەر لەم تەمەنی پیریی و کامڵبوونەیدا، نامەیەکی بۆ شێخ عەلی حیسامەددین (١٢٧٨ ـــ ١٣٥٨ك)ی کوڕی شێخ بەهائەدین نووسیوە و ناوەڕۆکی نامەکە لە زۆر ڕووەوە گرنگە و تیایدا زۆر بە شکۆوە داوا

٩٥- شیعرەکەی شێخ ڕەزای تاڵەبانی درێژترین شیعری سەرلەبەری دیوانەکەیەتی و بریتییە لە (٦٠) بەیت، کە (٥٩) بەیتیان کوردییە و تاکە بەیتی سەرەتای شیعرەکەش بە زمانی تورکی و عەرەبییە و ئاوا دەست پێدەکات:

**بابان باشنده بر باگمان یشیل وار**

**امام القوم فی تقسیم شلوار**

بۆ زیاتر ئاگاداربوون لەم شیعرەی شێخ ڕەزا، بنواڕە:دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ئومێد کاکەڕەش، پیاچوونەوەی (حەمەبۆر)، چاپەمەنی پرۆژەی هاوسەر، سلێمانی، چاپی دووەم (٢٠٠٥)، لاپەڕە (٩٧ ـــ ١١١).

٩٦- وەك نموونەی ئەم دوو بەیتەی مەحوی، کە لە ل٢٦ ول ٣٢٧ی دیوانەکەیدایە :

**١- دنیا بە حیلە، مەیلی بە ئەبنای ئەگەر ببێ**

**ئەم (دایە ڕێزبار)ە، بەفرزەندی شوو دەکا**

**٢- ئەکدەشی خینزیر و سەگ، مەعجوونی بەنگ و خەندەریس داکی دایە (ڕێزبار)یی، بابی (بابی)ی قەحبەباب.**

لە شێخ عەلی حیسامەددین دەکات، تا هاواری (حەزرەتی عەلی) بکات و لە هەمان کاتدا شێخ عەلی، لە رەمز و جیهانی میتۆلۆگیا نزیك دەکاتەوە:

**ناد علیاً مظهر العجـــائب**
**تجده عوناً لك في النوائب**[97]

ئەم ئاماژە کردن و خۆبەستنەوەیەش بە جیهانی میتۆلۆدیاەوە، ناچێتە خانەی وەرگەڕان لە رێبازی ئایینی، بەڵکو بڕوابوونە بە یەکێتی ئاین و یەکێتی ئایینەکان، کە لای زۆربەی سۆفیگەلی گەورە باو بووە. ئەوانە بە گیانی دەمارگیریی و تەعەسووبەوە سەیری بیروباوەڕی خۆیان نەکردووە. (هادی العلوی) سەبارەت بەم هەڵوێستەی ئەم سۆفییانە و بە تایبەت (أبن العربی) دەنووسێ:

(أن عقیده المسلم و الیهودی و النصرانی سواو)[98]..گەر کەسێکیش لەم بۆچوونەی (أبن العربی) تێنەگات، قەت ناتوانێ لە (مەولەوی تاوەگوزی)یش تێبگات، کە بۆ:**حاجی مەحموودی یاروەیس** دەنووسێ:

(چە گونە حتی خودم از گبر و یهودی بهتر نمیدانم)[99].

زۆرینەی سۆفیگەلی مەزنیش ئەم هەڵوێستەیان بەرامبەر ئایینەکانی تر هەبووە.

لەبەرئەوەش کە شیعرەکەی مەولەوی بۆ باوەیادگار، وردەکاریی و زانیاریی زۆری لەبارەی ئایینی (ئەهلی هەق) ەوە تێدایە، بۆیە پێمان باشە هەموو شیعرەکە بەرچاوی خوێنەران بخەین:

---

٩٧- مودەریس، مەلا عەبدولکەریم، یادی مەردان، بەرگی دووەم، کۆری زانیاری عێراق (دەستەی کورد)، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا ١٩٨٣، ل٤٢٧.

٩٨- العلوی، هادی:مدارس صوفیە، دمشق،١٩٩٧، ص٨٢.

٩٩- مودەریس، مەلا عەبدولکەریم، یادی مەردان، بەرگی دووەم، (هەمان سەرچاوەی پێشوو) ل٤٧٠.

سەرشـــــــار صەهبای بەزم موناجات
مەلجەی ئیلتیجای ئەرباب حاجات
جای رجای جەرگەی پادشا و دەروێش
بارەگا و پەنا، پەی بێگانە و خوێش[100]
ئـــــــاهووی خوتەنیی فەیچ ئیلاهی
ئافـــــەی ئاف راهی، جەمەهـ، تا ماهی
شکۆفەی وەش بۆی رەیحانەی رەسوول
نەوباوەی نەمام، گیبەهـ ی (بەتوول)
ســـــــەرو سایەدار، نیشاندەی وەلی
یەعـــــــــــنی یادگار: مورتەزا عەلی
وە رەوزەتانا هەر نوور واران بۆ
تا دەفع زوڵمەت، دیدەی یاران بۆ
هـــەوای ســــــایەتان، هەر مەمدوود مانۆ
سەبوون بوردەی جورم، نەك زەرەر سانۆ
ناپوختەکاریی و شەرمەساریی من
خەجڵەت غەفڵەت، گوناهکاریی من
کەفتەن وە هەمدا، یەند زۆر ئاوەردەن
رووی رجام، وە پای بارەگات کەردەن
تۆ چون جە ئەولاد ئەمجاد مەولای
پەی رجا وەجا، پەی هیممەت ئەولای
زاری و زکاریی و زویریی کەردم
وە بارگەی پاکت پەنا ئاوەردم
ئامام، سەر نیام وە بارەگاوە

---

١٠٠- مەولەوی دڵنیایە کە جگە لە کورد ، کەسانی تری سەر بەنەتەوەکانی تریش، زیارەتی گڵکۆی (باوەیادگار) دەکەن.

**غەریو، موو سفید، وە رووی سیاوە**
**تەن:مەعصییەت بار، دەروون: پڕ جە دەرد**
**دیدە: تەڕ، لەب: خوشك، دڵ: گەرم، نەفەس: سەرد**
**های چەند پلەی سەخت، هانە رێمەدا**
**جە ڕووی ئیلتیفات، بدیە پێمەدا**
**بەڵکم جە ڕووی ئەو ئیلتفاتەوە**
**مەولام حارز بۆ، وە نەجاتەوە**
**دەس شای مەردان، مەدەد کارم بۆ**
**پلە:ئەو پلە، ئەو:دەس وارم بۆ**
**مە عصییەت نییەن، چون هیچ صەدمەتێ**
**خەیلێ مەلوولم، یا پیر! هیممەتێ**
**هیممەتت باعیپ رستگاری بۆ**
**یار بۆ، دیار بۆ، یادگاری بۆ** [١٠١]

* * *

وەك پێشتریش وتمان:مەزار و بارەگای (باوەیادگار)، لەسەر چیای (داڵەهۆ)یە و ئەم زنجیرە چیایەش، زۆر لە زێد و جوگرافیای مەولەوی، واتە:لە ناوچەی (تاوەگۆری)یەوە دوورە و بۆ تەمەنێکی پیر و بە ساڵاچووی وەك (مەولەوی)یش، کە خۆی لەم شیعرەدا، باسی (ریشی سپی) خۆی کردووە، دەبێ دوای ماندووبوونێکی زۆر دژوار، توانیبێتی زیارەتی گڵکۆی (باوەیادگار) بکات.. کەچی وەك لە نموونەی شیعری تری مەولەوی دا دەبینین: مەولەوی ئەوینێکی قووڵی لەگەڵ شوێنە پیرۆز و مەزارە گرنگەکانی ئایینی (ئەهلی هەق)دا هەبووە و وەك لەو نموونە شیعرییانەیدا بە دیاردەکەوێ، مەولەوی نەك هەر تەنیا خۆشی ویستوون و زیارەتی زۆرینەیانی کردووە، بەڵکو شیعریشی بۆ وتوون.

---

١٠١- (دیوانی مەولەوی لاپەڕە (٢٨٨ ـــ ٢٩١).

زۆرترین و گرنگترین شوێنە پیرۆز و زیارەتگەکانی ئایینی ئەهلی هەق، لە ناوچە شیرین و جوان و لەهەمانکاتدا، زۆر سەختەکانی (ڕێژاو)دان و لە نزیك و دەوری گوندی (ڕێژاو)یش، چەند گوندێکی دڵگیر هەن وەك: زەردە، یاران، پیران، .. لەناو ئەمانەدا گوندی (زەردە)، وەك قیبلەی پیڕەوانی ئەهلی هەقە و بە درێژایی ڕۆژانی هەفتە، ڕێچکەی زیارەتکاران، دەستە دەستە، سەردانی دەکەن.

مەولەوی ناوی ئەو چەند گوندەی بە جۆرێك لە بەیتە شیعرێکیدا گونجاندوون، وەك ئەوەی هەریەکەیان بەشێك بن لە ئەندامەکانی جەستەی خۆی و دیدەکانی و فرمێسکی چاوی و روخساری خۆی:

**دیدەم: (ڕێژاو)ە، روخسارم: (زەردە)ن**

**جە داخ: (یاران)، (پیران)م کەردەن**[١٠٢]

هەر لە بواری ناوهێنانی ئەو رەگەزانەی لای پیڕەوانی ئایینی (ئەهلی هەق)، زۆر پیرۆز و گرنگن، مەولەوی ناوی سەرەکیترین ئامێری موزیکیی **ئەهلی هەق** دێنێ، کە ئامێری (تەموورە)یە و هەوێن و بنەمای ئایینی **ئەهلی هەقە** و هەموو بۆنە و سرووتگەلی ئایینی و کۆمەڵایەتییان، لە ماڵ و لە(جەمخانە) کانیاندا، هەر بە ئامێری (تەموور)ەوە ئەنجام دەدەن و بە هەمان ئەو ناوەشەوە، ناوی دێنێ، کە ئێستا خودی پێڕەوانی **ئەهلی هەق**، هەر پێی دەڵێن: **تەموورە**[١٠٣]

**لوولەی تەراویح، وەش وەش مدۆ دەنـــــگ**

**بێ ئاهەنگەن (تار)، (تەموورە)ی ئاهەنگ**

**ل٣٩٤**

---

١٠٢- دیوانی مەولەوی لاپەڕە (٢٨٨ ـــ ٢٩١).

١٠٣- لە کاتێکدا دراوسێکانی قەڵەمڕەوی ئایینی ئەهلی هەق، بە ناوی تری وەك:تەمیرە، تەنبیر، تەمیر، تەنبیور، تنبوور...هتد. ناوی دەبەن.

*   *   *

ئەم پەنجەرە کردنەوە و ئاسۆ بەرین روانینەی مەولەوی تازەگۆزی، بۆ ئایینەکانی تری جیا لە ئایینی ئیسلام و بۆ جوگرافیایەکی فراوانتر لە جوگرافیای زێدی خۆی و ئەو هەموو گەڕان و سەردانە بەربڵاوانەی مەولەوی، لەو هەرێمە بەرینەدا، گەلێ تیرۆژی روناك و پرشنگداریان لەسەر شیعری مەولەوی کردۆتەوە و فەرهەنگی واژەگەلی شیعری (مەولەوی)یان دەوڵەمەندتر کردووە و لە هەمانکاتدا لە خەم و خۆزگەی جەماوەرێکی فراوانتریش نزیك بۆتەوە، کە زۆرینەی ئەو جەماوەرە بە گشتی و جەماوەری پیرەوانی (ئەهلی هەق) بە تایبەتی، کە لە دێرزەمانەوە ((لەبەر زۆرهۆ، کە ئێرە جێی نییە) تەنگیان پێ هەڵدەچنرا و پەراوێز دەخران و دەچەوسێنرانەوە، کاتێ دەیانزانی هەندێ لە پیرۆزیی و سەروەرییە گەمارۆدراوەکانی خۆیان لە شیعری مەولەوی دا دەبینییەوە، هەستیان بە بەسەرکردنەوە و نیمچە ئابڵووقە لەسەر لابردن و رێزلێنان و شانازیی بەخۆوە کردنەوە دەکرد و باوەشی رێز و گەرمیان بۆ شیعرەکانی مەولەوی دەکردەوە و وەك خۆراکێکی گیانیی بۆ شیعری (مەولەوی)یان دەنواڕی. لەم رووەوە هێشتا مەولەوی خۆی لە ژیاندا بووە ، کە لە کۆڕ و کۆمەڵ و قەڵەمڕەوی خۆیاندا، رمێن و برەویان بە شیعری مەولەوی دەدا و هەندێ جاریش (تاکە بەیت) و هەندێ شیعریان دەکردنە سۆز و سروود و لە مەقامی بەناوبانگی (قەتار = گاتا)ی تایبەت بە پێڕەوانی (ئەهلی هەق)دا جێگەیان دەکردنەوە (کە تا ئێستاش ئەم نەریتە هەر بەردەوامە) [١٠٤] و هەموو ئەمانەش وایان دەکرد بە چاوێکی تایبەتی و

---

١٠٤- لەم بوارەدا لە جێی خۆیدایەتی نموونەیەك لەم بارەیەوە بەیادی خوێنەران بهێنمەوە، کە خوالێخشبوو: سەیید ئەحمەدی عازەبانی، بۆ جەنابی زانای نەمر: مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیسی گێڕاوەتەوە:

ڕێزەوە، بۆ خودی (مەولەوی) بنواڕن، کە نووسەری ئەم دێرانە، لە زۆر لەو سەردانە مەیدانییانەی خۆمدا، بۆ ناوچەکانی ئەهلی هەق[105] و دیدارم لەگەڵ پێڕەوانی ئەهلی هەق دا، هەمیشە ڕاستەوخۆ سەبارەت بە (مەولەوی)، لێم بیستوون، کە پلەوپایەی **مەولەوی** و تەنانەت (عەنبەرخاتوون)ی هاوسەریشی، وەك بەشێك لە خۆیان ئەژمار دەکەن و بە پێوادنی ئەو نازناوی (باوە)یەی بۆ ڕابەرەکانی خۆیانی دادەنێن، بە (مەولەوی)یش دەڵێن: باوە مەولەوی و بە (عەنبەر خاتوون)یش دەڵێن:دایە عەنبەر !.

---

سەیید حەسەنی موفتی داوای حەبیبە خانمی کچی شێخ عەلی عەبابەیلیێ دەکا و دەیدەنێ. کە لە (سلێمانی) یەوە دەڕۆن بۆ عەبابەیلیێ بە شوێن بووکدا، شێخ عەلی باوکی بووك، بەمەولەوی دەلیێ: مەولەوی من کەسم نییە لەگەڵ حەبیبە بینێرم بۆ سلێمانی و لە تۆ مەحرەم ترم نییە بە ماڵی ئێمە، لەگەڵی بڕۆ. ئەویش لەگەڵ بووك دەڕوا.

لە ڕێگادا بە عادەتی برا زاوا، دەست دەکەن بە گۆرانی وتن: یەکێ لە کۆمەڵەکە ناوی **حەمەی ئامین** بووە، دەنگی زۆر خۆش بووە، دەست دەکا بە **قەتار** و **ئای ئای** وتن بە شیعری مەولەوییەوە. مەولەوی بە سواری ولاغەوە لە بەر خۆشیی دەنگی حەمەی ئامین جەزبە دەیگرێ و بەجۆرێ لەحاڵی تەبیعی دەردەچێ، دەکەوێتە خوارەوە. خەڵکەکە دادەبەزن و ڕاستی دەکەنەوە و سواری ولاغەکەی دەکەنەوە و لە (حەمەی ئامین)یش تووڕە دەبن، دەڵێن: خەتای تۆ بووە، وا مەولەوی کەوتە خوارەوە.
(حەمەی ئامین) یش دێ بەلای مەولەوییەوە، پێی دەڵێ: (قوربان! بۆچی وات پێهات؟. خۆ من هەر شیعرەکانی خۆتم دەخوێندەوە! ). ئەویش دەڵێ: (کوڕە! کەی شیعری من ئەوەندە خۆش و بەتەئسیرە؟ بە خوا خەتای "ئاواز"ەکەی تۆ بوو ...)
بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە بنواڕە: مودەڕیس، مەلا عەبدولکەریم، یادی مەردان، بەرگی دووەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا ١٩٨٣، ل٣٧٦.

١٠٥- بەهار و هاوینی (١٩٩٣ز)، کە خەریکی نووسین و ئامادەکردنی کتێبی (مێژووی موزیکی کوردی)بووم.

## (٢)

بەڵام وەك پێشتر وتمان ئەو ئامێرانەی موزیك، کە مەولەوی ناویان دێنێ، بە تایبەتیش:چەنگ، چل چەنگ، کەمان سەمتوور، تار...کەمتر لە سنووری جوگرافیای پێڕەوانی ئەهلی هەق و خودی ناوچەکەی مەولەوی (جوانرۆ)شدا بەکار دەبرێن و زۆرتر لە رۆژگاری دەسەڵاتی دەوڵەتی ساسانی و زۆر پێشتریشدا بەکاربراون، بەواتایەکی تر: زانیارییەکانی مەولەوی لەسەر موزیك و ئامێرەکانی موزیك، هەر تەنیا لە ڕێگەی ئەو خۆشەویستیی و دۆستایەتییەوە نەبووە، کە لەگەڵ پێڕەوانی ئەهلی هەق و موزیکەکەیاندا هەیبووە، چونکە (وەك پێشتر وتمان) ئەو ئامێرە موزیکەی کە ئێستا پێڕەوانی ئەهلی هەق بە شێوەیەکی گشتی، زۆر لایان پیرۆزە و لە جەمخانە و لە ماڵەکانی خۆیاندا، بۆ دەربڕینی راز و سۆز و سکاڵای ئایینیان بەکاری دەبەن، زۆرتر هەر ئامێری (تەموورە = تەمیرە)یە، کە هەر بە تەنیا دەژەندرێ و بە دەمیشییەوە کەلام = شیعر دەخوێندرێ. لە کاتێکدا ئەو چەند ئامێرە موزیکەی پێشتر ناومان هێنان، مەولەوی بە جۆرێك باسیان دەکات، کە هەندێ جار سێ، تا چوار ئامێر پێکەوە و وەك تیپێکی موزیك، لە کۆڕ و کۆنسێرتێکی موزیکیدا بەشداربن:

**(١)**

**شیعر وێم تەنخوای (سەمتوور) ســـــــازێ**
**لێدەر سا (نەیچی)! هەر ئارێش گـــــــازێ**
**چنگ پێکۆ نە جەرگ نەغمەی ســـــازەکەت**
**بەرارۆ تۆتۆ، میقراز گازەکـــــــــەت**
**سا دەروێش! کـــــەفێ بدە نە رووی (دەف)**
**گیان مونتەزیرەن پەرێ رێـــــــــزەی دەف**
**(موغەننی) ! لێدەر، یەك ئیمشەو ســـــازان**
**بەشقی ئەو کەسە، تۆش ئـــــــــاوات وازان**[١٠٦]

واتە: ئەی شمشالژەن! شیعرەکانی خۆم لە باتی ئامێری سەمتوور، بە شمشاڵ بژەنە! با هەر ژێیەکی (سەمتوور)ەکە، وەکو گازێك وابێ، بۆ دەرکێشانی ریشەی جەرگم و نەغمەی سازەکەت ، چنگ لە جەرگم گیر بکات و چین چین وەك گازی مقەست، دەری کێشێ.

دەروێش! تۆش لەپی دەستت بۆ (دەف)ەکەت ببە و رۆحم چاوەنوارِی لەرینەوەی ئەو ئەڵقانەن، کە بە کەمەی دەفەکەوەن.

تۆش ئەی گۆرانیبێژ (موغنني) ! ئیمشەو ئاهەنگێکمان بۆ ساز بکە، چونکە ئەوینی من، بۆ کەسێکە، بە ئاواتی گۆرانی وتنی تۆوەیە.

* * *

١٠٦- دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە و لێکدانەوە و لەسەر نووسینی:مەلا عەبدولکەریمی مودەرِیس، بەغدا، چاپخانەی (النجاح)، ساڵی (١٩٦١ز)، لاپەرِە (٣ ــــ ٤).

**(٢)**

**موغەننی! کۆکەر: سازانت وە هـــــــەم**
**(سەمتوور)ێ، (تار)ێ، وە هەم کەرە جـەم**
**(نەیچی)! سا لێدەر، قەزات وە ماڵـــــم**
**دەمێ دەر وە (نەی)، دەروون زوخاڵـــــم**
**هۆشێ دەر، هام فەرد! سازان بســــــازە**
**باڵات وە کاڵای خەمـــــــــان بوورازە**
**باوەرە، بســـــات تەمـــــــام تەیارکە**
**شەوخەفتەن شووم، بەژار مارکـــــــــە**
**قەزای پەنجەکەت دەك لـــــەمن کەفێ**
**خەیلێ عاجزم، ســــا لێدەر:(دەف)ێ[١٠٧]**

واتە:ئەی گۆرانیبێژ! ئامێرەکانی موزیکات:(سەمتوور) و (تار)ەکەت، بخەرە تەك یەك و تۆش ئەی شمشاڵژەن! دەردت لە ماڵم بکەوێ، دەم بە شمشاڵەکەتەوە بنێ، سووتاوم و خەریکم ببم بە خەڵووز، هۆش بەبەر خۆتدا بێنەوە و ئامێرەکانی موزیك، بۆ بەکارهێنان لە پاڵ یەکدا دابنێ و ئامادەی بەکارهێنانیان ببە و باڵات لەگەڵ کاڵای خەم بەیەکەوە بدوورەوە. پێویستی و کەرەسەکانی رابواردن ئامادە بکە و خەوم لــێ بزڕێنە، با ئەم خەوە شوومە ، بەرم بدات و بە ئاوازی دەفەکەت، دڵ بە جۆش بێت.

---

١٠٧- دیوانی مەولەوی، سەرچاوەی پێشتر باسکراو، لاپەڕە (٢٠ ـــــ ٢١).

(٣)

ئاوازەی مەینەت، نە دەروون ســــــــــەد تەرز
چون (چل چەنگ) وە چنگ، خەمــان بییەن بـــەرز
بێهۆشیی جەهۆش، کـــــــەم فامیی جە فـــام
وە هەزار مەقام، مـــــــــــدەران جەفـــام
سا (نەیچی)! دەخیل، بێ دێر و درەنــــــــگ
موتریب! فیدات بام، (نەی) باوەر وە دەنـــــگ
کەف بدە نە (دەف)، پەنجەت نەڕووی (نـــەی)
وێنەی (باربەد)، بەزم ئارای (کـــــــــەی)
(نەکیسا) ئاسا، دەس دەر وە (ســــــــەمتوور)
(دەف) و (نەی) و (چەنگ)، باوەر وە حـــــزوور
(چل چەنگ) نەسەر چەنگ، پەنجەت دەر قـــەرار
وە هەزار دەسان، بنوازم ئەمجـــــــــــــــار
وێت بە حەقیقەت، مەست بکەر جە مــــــــەی
سازان بســـــــــــــازە، پەی واوەیلای وەی
کەف بدەر نە (دەف)، (چەنـــگ) بـــاوەر وە نەی
هیچ مەواچۆ:کەی! توخودا ســــــــــــادەی
بەو ئاواز بەرز، خاس بکـــــــــــــــەر رازان
بە عەشق ئازیز، نـــــــــــــازك ئەندازان[١٠٨]

١٠٨- دیوانێکی دەستنووسی هێشتا چاپ نەکراوی مەولەوی (لای خۆم)، لاپەڕە (٨٩ ـــ ٩٠).

واتە:ئاوازی کوێرەوەریی لـە دەروونمـدا، بەسـەد جـۆر سـەریان هەڵـداوە و وەك دەنگی چل چەنگ، دەنگی (خەم)م لـێ بەرز دەبێتـەوە و بێهۆشـیی لـە هۆشمـدا و کاڵ و کرچیم وەك دەنگی ئەو (مەقام)ە بە سۆزانەی دڵ لەت لەت دەکەن، بە هەزار جۆر مەقام، ئازارم دەدەن. لەبەرئەوە کاکی شمشاڵژەن! خێراکە شمشاڵەکەت بژەنـە و تۆش کاکی گۆرانیبێژ! دەستم دامێنت، تۆش هەر خێراکە، بە قوربانتـان بم، تـۆش ئەی دەفژەن و گۆرانیبێـژ و شمشـاڵژەن! هـەروەك (باربـەد) و (نەکیسـا)ی جووتـە موزیکژەنی بەناوبانگی سەردەمی ساسانی، کە بەزم و ئاهـەنگیان بـۆ کەیخوسـرەو ساز دەکرد و موزیك و (سەمتوور)یان دەژەند، دەست بۆ (سـەمتوور)ەکەت ببـە و بە هەمووتان ئامێرەکانی:دەف و نەی و چەنگ و چل چـەنگ و سـەمتوور بهێننـە مەیدانەوە و دەستەکانتان بکەن بە هەزار دەست و سازەکانتان بژەنن و هـەرگیزیش مەڵێن:کەی دەست بە ژەندەن بکەین و هەر ئائێستا بە دەنگی ئاوازی بەرز، دەست پێبکەن و بە یادی ئەوینی یاری ناسك و نازدارەوە، رازی دڵتان بجۆشێ.

**(٤)**

**پێم دەر تا پەردەی یەخ کەردەم بوو گـەرم**
**موتریب! وە(پەردە)ی (روباب)، بێ شـەرم**
**فیدات بام (نەیچی!)، کەســـم هەر تۆنی**
**حەکیم زامان کۆنە و هـــــــەم نۆنی**
**لێدەر مەقامێ، دڵ بـــــــارۆ ئەو دەرد**
**ئازیز سڵامەت، من هاکۆ چــــــەم کەرد**[١٠٩]

واتە:سۆزێکی وا گـەرمم بـدەرێ، تـا پـەردەی بـە سـەهۆڵ و بـە شـەختەبووی جەسـتەم، گـەرم بێـت و بتوێتـەوە. لەبەرئـەوە ئـەی کـاکی گۆرانیبێـژ! ئـامێری (روباب)ەکەت، بەبێ شەرمیی کۆك بکە و تۆش ئەی کاکی شمشاڵژەن! کە لە جێـی هەموو کەسێکمیت و شارەزای زامی کۆنە و تازەم هەر تۆیت، تۆش مەقامێکی وا

١٠٩- دیوانی دەستنووسی هێشتا چاپ نەکراوی مەولەوی (لای خۆم)، لاپەڕە (١١٢).

بژەنە، تا ئەم دەردەم لە بن دەربهێنێ. ئەوسا ئیتر هەرچیم بەسەردێت، بـا بەســەرم بێت، هەر یار سەلامەت بێ، قەیناکە.

**(٥)**

**یا نوەلوەلەی (دەف)، شــا دەروێش! جۆشێ**
**بەو سەدای ریشەی دڵ ئاشــــــــــــــناوە**
**یا جۆش (سەمتوور)، موتریب! خـــرۆشی**
**چەنی ئەی دوو فەرد، حەســرەت مەعناوە**[110]

واتە:ئەی دەنگ و ئاوازی شای دەروێشان! بەو دەنگــە خۆشــەتەوە، کــە لەگــەڵ رەگ و ریشەی دڵمدا ئاشنایە، وەرە دەنگ. تۆش ئەی جۆشــی ســاز و ســەمتووری گۆرانیبێژ (موتریب)! لەگەڵ ئەم دوو بەیتە شیعرەمدا هاوارێ بکە، کە باسی راز و دەردی دڵم دەکەن.

**(٦)**

**ساقی! مەی، هەی داد، (موغەننی!)، (چەنگ)ێ**
**(نەیچی!) های فەریاد، موتریب! ئاهەنـــــگێ**
**گەرمیی مەی، نەوا و کـــــزەی (دەف) و (نەی)**
**تێکەڵ بۆ چــــــــــــەنی زایەڵەی نوەی وەی**[111]

١١٠- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٧٠).

١١١- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٩٥).

واتە: ساقی ! تۆ مەی بێنە، تۆش گۆرانیبێژ! دەنگ لە (چـەنگ)ەکەت بهێنـە، تۆش شمشالژەن! بـا هـاوار و نالـە لـە شمشـالەکەتەوە هەلسـێ. بـا گۆرانیبێـژیش ئاهەنگێك ساز بكات. تا بە هۆی گەرمیی مەی و كـزەی دەنگـی (دەف)ەوە، كـە تێكەڵ بە یەك دەبن، هاوار و گریانێك لە رۆحمدا دروست بكەن.

## (٧)

**بڕیان تای (روباب) قافیە خوانیم**
**نەمەندەن تاقەت عیبارەت زانیم**
**دەمەی هەناسەی گەرم (تار)ەكەم**
**نەكوورەی دەروون پڕ جە خارەكەم**
**ئایردان حوجرەی دڵەی پڕ دەردم**
**سۆچنان كتاو مەجموعەی فەردم[١١٢]**

* * *

**هەر بەمجۆرە، جاروباریش داوا لـە موزیكـژەن و موتریـب (موغـەننی) دەكـات، هەمان ئەم سازانەی بە تەنیا بۆ بژەنن:**

**موتریب! ســـــازەكەت، ئۆف چ وەش تەرز بی**
**ئەمجاریش وەك دەنگ مــەجلیس هەر بەرز بی**

**تا كوورەی زاریم بلێسە ســـــــــــــانۆ**
**داخ لوای وێم، جە دڵ نمـــــــــــــانۆ[١١٣]**

---

١١٢- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (١٩٤).

١١٣- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٤٣٠).

**موتریب! یەکارەن؟ مەر سیاســـــــەنگی!**
**من:بەی حـــــــاڵەوە، تۆ: وە بێدەنگیی![114]**

**موتریب! مەقامێ، دەردم ناچــــــــارەن**
**ســـــــــاقیا! جامێ، دوست ئینتیزارەن[115]**

**های موغەننی! (تار)، حەنجەرەی وەش تەرز**
**وە سەر پەنجەی ناز، باوەرۆ ئەو لــــــــەرز[116]**

**زرنگەی سەدای ســــــاز، جە ریشەی ئەعزام**
**(کەمانچە) دەستوور، ماوەرۆ مەقـــــــــام[117]**

**(سەمتوور) ســـــــــینەم، وە زایەڵەی بەرز**
**مەژەنۆ نەوای دووریت، وە ســـــــــەد تەرز[118]**

**شەمع شام شووم، ماتەم هۆر گریـــــــــــا**
**تای تەل (ســـــــەمتوور) شادی و زەوق بڕیا[119]**

---

١١٤- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٢٧٦).

١١٥- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٢٣٦).

١١٦- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٢٦٨.)

١١٧- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٢٤٣).

١١٨- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٢٤٢).

١١٩- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٢٨٤).

**لەرزەی ریشەی دڵ، (ســــــەمتوور)ی دەستوور**
**وەزن تەبع (تار)، پڕ سۆزەی (ســــــەمتوور)** [120]

**لوولەی تەراویح، وەش وەش مـــــــدۆ دەنگ**
**بێ ئاهەنگەن (تـــار)، (تەموورە)ی ئاهەنگ** [121]

* * *

وەك ســـەرنج دەدەیـــن ئـــارەزووی مەولـــەوی، بـــۆ ئامـــادەبوون و بیســـتنی ئـــەم ئامێرانەی موزیك پێكەوە، وەك ئەوە وایە كۆنسێرتێكی موزیك ساز بكرێـت. كـە سازكردنی ئەم كەش و هەوا (موزیك)ییەش، زۆرتر لە كەش و هەوای (مـوزیـك)یی و سۆزی ئـایینی پێڕەوانـی تەریقـەتی شـاعیر و عـارف و حـەكیمی بـەناوبانگ و خاوەنی مەسنەوی = دووبـەیتی: مـەولانا جەلالـەددینی رۆمـی، واتـە مەولـەوی بەڵخی (١٢٠٧ ـــ١٢٧٣ز) دەچێ، كە پێڕەوانـی نـاوبراو، بـەم كـەش و هەوایـە دەڵێن:سەماع = بیستن و مەبەستیشیان لە سەماع = بیســتن، هـەر بیســتنی ئـەو ئاوازی (موزیك)انەیە، كە لە ترادیسیۆن و بۆنەكانی ئایینی دا، بەكاریان دەبەن.

پێڕەوانی تەریقەتی مەولەوی رۆمی، لەم بۆنانەدا، لەگەڵ خوێندنەوەی شیعرە (مەسنەوی = دووبەیتی)یەكانی مەولانا جەلالەدینی رۆمی دا، گوێ لە ئاوازی خۆش و شادیی موزیـك دەگرن و بە دەم گوێگرتنی ئەو ئاوازانەوە، دەست و پەل رادەوەشێنن و (سەما)یشی لەگەڵـدا دەكەن. كە ئەم نەریتە، لای هەندێ لە زانایانی موسڵمان پەسند نییە.[122]

بەڵام مەولەوی تاوەگۆزی، خۆی سەر بە رێبازی نەقشبەندی بـووە و ئـەم رێبـازەش رەنگە تاكە رێبازی سۆفی بێت، كە رێگەی بە (سماع) نەدابێ و دەبێ كۆڕەكـەیان بـەبێ

---

١٢٠- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٣٣٠).

١٢١- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٣٩٤).

١٢٢- بۆ پتر زانیاریی لەم بارەیەوە، بنوارە: فرهنگ اصگلات و تعبیرات عرفاو، تالیف:سجادی، صص:(٢٢٥ ـــ ٢٢٣). هەروەها:فرهنگ دهخدا، جلد٩، صص: (١٣٧٤٩ ـــ ١٣٧٥٠).

دەنگیی بکەن. کەچی **مەولـەوی تـاوەگوزی** بـێ پـەروا و بـێ گوێدانـە بـیروڕای ئـەو موسڵمانانەی ئەم نەریتی (سـەماع)ەیان بـەلاوە پەسـەند نییـە، بـە هـەمان نـەریتی **مەولەوی بەلْخی**، کە ڕێگەی بە (سماع) داوە و لە (خانەقا)کانیاندا، سەما و گـۆرانیی و بە کارهێنانی ئـامێری موزیـك، ڕێگـەی پێـدراوە داوا لـە گۆرانیبێـژ (موغـەننی) دەکات، تا کەش و هەوای (سەماع)ی بۆ سازبکەن:

**(٨)**

**گۆشـەی مزگی دەیر، گۆشـەی مزگی دەیر**

**هانا (موغەننی!)، یادت بۆ وە خـــەیر**

**جەکۆن چریکەی جـــــەلای زەنگ روح**

**(سەماع)ش پەیمان مدا ســـــەد فتوح**

**بەو لابەر وەسواس(...[١٢٣])حــــــــەواس**

**وە کزەی گیان سۆز، مەقامەکەی (راس[١٢٤]) [١٢٥]**

---

١٢٣- ئەو وشەیە جێگەکەی چۆڵ بووە.

١٢٤- راس:مەبەست لە مەقامی (راست)ە.

١٢٥- دیوانی دەستنووسی هێشتا چاپ نەکراوی مەولەوی (لای خۆم)، لاپەڕە (١١١).

سەرنج:

(نالی) و (مەحوی)ش لە بارەی (سەماع)ەوە، ئەم دوو بەیتەیان هەیە:

**١ـــ (سەماع)ە، گەردشی عیشقە، حەقیقەت**

**لە سۆفی و رەقسی تەقلیدی، نەما باس**

(نالی،٢٣٣).

**٢ ـــ (سەماع)ی سازی عیشق و ڕێگە بۆ پاڕانەوەت (مەحوی)**

**لەبەر قاپی گـەلەب بێ، گوێ:دەبێ کەڕ بێ، زوبانت:لاڵ**

(مەحوی،٢٠٤).

واتە: وام لە سووچی مزگەوتێکدا و هاوار لە گۆرانیبێژ دەکەم و دەڵێم:یادت بەخێر، کوا ئەو چریکەیەت، کەلای زەنگوڵەی ڕۆحەوە دێت و (سەماع = بیستن)یشی، سەد پەیمان و سەرکەوتن دەبەخشێ. وەرە و ئەم دڵەڕاوکەیەم لابەرە و بەکزەی مەقامی (ڕاست) گیانم بتوێنەوە.

* * *

لەگەڵ داواکردن و تکای مەولەوی تاوەگۆزی دا، لە موتریب و موغەننی و موزیکژەن، هاوکات هەمیشەش داوایان لێدەکات، تا بە دەم گۆرانی چڕین و موزیکژەندنەوە، شیعرە (دووبەیتی = مەسنەوی)یەکانی خۆیشی لە گۆرانی و مەقامەکانیاندا بۆ بکەن بە هەوێن:

**(٩)**

**شیعر وێم تەنخوای (سەمتوور) سازێ**

**لێدەر سا (نەیچی)! هەر تارێش گازێ[126]**

**واتە :لە باتی سەمتوور و نەی = شمشاڵ و دەف، شیعرەکانی خۆم بکەنە ئاوازی موزیك و لەگەڵ گۆرانیدا بەکاریان بهێنن.**

* * *

١٢٦- دیوانی مەولەوی،لاپەڕە (٤).

(١٠)

**سادەی سا نەیچی! ریشـــــەی دڵ کــــــــــەر پەی**
**تالیم دەر ئەی فـــــــــەرد، وە نەزمەکەی (نەی):**
**ئیمشـــەو وە هەرحاڵ، شــــــــــەو وە رۆژ بەروون**
**ئەی خوا! سا مەرگێ، ســـەحەر چیش کـــــــەروون**[127]

واتە:ئادەی شمشاڵژەن! ریشە و بەندی دڵم بچڕە و بە دەنگی شمشاڵ، ئاواز بۆ ئەم تاکە بەیتە شیعرەی خۆم (بەیتی دواتر) دابنێ، کە دەڵێ:هەرچۆنێ بێ ئیمشەو، رۆژ دەکەمەوە و بەرەبەیانیش خوا کەریمە و خۆی دەزانێ چی دەکات.

(١١)

**نەیچی! من پەنجەی پای ناڵـەم سـفتەن**
**تۆ، دەی چون تەئسیر وە ناڵـــەت جفتەن**
**چەند فەرد (مەعدووم)، دەروون نەوەی دا**
**باوەر جە تەنخوای ناڵـــــە وە (نەی) دا**[128]

١٢٧- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٣).

١٢٨- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٥).

واتە:کاکی شمشاڵژەن! من پەنجەی هاوار وناڵینم سووتاوە و ناڵەم نارِوات، بەڵام ناڵەی تۆ، لەگەڵ کارکردندا جووتە، دەی ئەم چەند بەیتە شیعرەی **مەعدووم** (کە نازناوی شیعریی خودی مەولەوی یە)، بکەن بە ئاواز و بە شمشاڵیش بیانژەنە.

* * *

## (١٢)

**پەنجەت بەو نەغمەی بین وە تینەوە**
**باوەرە ئەی بەیت، وە حەزینەوە**[١٢٩]

واتە:کاکی شمشاڵژەن! پەنجەکانت بخە سەر شمشاڵەکەت و بە هەموو هێز و تینتەوە، ئەم بەیتە شیعرەی خۆم بە غەمناکی یەوە بۆ بژەنە.

* * *

## (١٣)

**موغەننی! تەنخوای من وە نەوایێ**
**وەی چەند (فەرد)ەوە، هۆردەر سەدایێ**[١٣٠]

واتە: ئەی گۆرانیبێژ! لە جیاتی من، ئەم چەند بەیت (فەرد)ە شیعرەی خۆم بە دەنگی بەرز بۆ بخوێنە.

* * *

١٢٩- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢١٦).

١٣٠- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٢٧).

**(١٤)**

**موتريب! يەكارەن، مەر ســــــيا سەنگی؟**
**من بەی حاڵــــەوە، تۆ وەی بێدەنگیی؟**
**چە تەنخوای نەی بەزم، خەم وەیلانەوە**
**هۆردەر ئەی چەند (فەرد)، وە دیلانەوە**[١٣١]

واتە:ئەی گۆرانیبێژ! ئەمە چ کارێکە! من بەم حاڵەوە و تۆش دەڵێــی بــەردیت، وا وشك و رەق وەستاویت! تکایە ئەم چەند بەیت (فەرد)ە شیعرەی خۆم بۆ بکە بــە مەقامی (دیلان) و..

* * *

**(١٥)**

**لەرزەی ریشەی دڵ، (سەمتوور)ی دەســتوور**
**وەزن تەبع تار، پڕ ســۆزەی (ســەمتوور)**
**واچە:بەو مەقـــــــــــام ئەلـواناتەوە**
**هەی داد، هەی بێداد، (مەعدووم)واتەوە:**[١٣٢]

واتە:ساتوخوا کاکی گۆرانیبێژ! مەقامێکم بۆ بڵێ، ببێ بە مایــەی لەرینــەوەی ریشــەی دڵەکــەم، کــە هەمیشــە وەك ئــامێری ســەمتوور دەنگــی لێــوە دێــت و ئاوازەکەیشی لەو ئاوازانە دەچێ، کە بە ئامێری تار دەژەندرێن و پڕ بێ لەو جــۆش و سۆزەی کە لە ئامێری (سەمتوور)دا هەستی پێدەکرێ.

---

١٣١- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٧٦).

١٣٢- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٣٣٠).

* * *

**(١٦)**

**یا وەلوەلەی (دەف)، شـا دەروێش جۆشێ**
**بەو ســــــــــەدای ریشەی دڵ ئاشناوە**
**یا جۆش (ســەمتوور)، موتریب! خرۆشێ**
**چون ئەی دوو (فەرد)، حەسرەت مەعناوە[١٣٣]**

واتە:ئەی دەنگ و ئاوازەی شای دەوێشان، بـەو دەنگـە خۆشـەی خۆتـەوە، کـە لەگەڵ ریشەی دڵدا ئاشنایە، دڵ بهێنە جۆش و کوڵ. تۆش ئـەی جـۆش و خرۆشـی ئامێری سەمتوور، بەم چەند بەیت (فەرد)ەی خۆمەوە بخرۆشە، کـە هـەموویان لـە مانای حەسرەتدا کەیلین.

* * *

**(١٧)**

**سامان ســام کــــــــەردەن، دەرد بێ دەوا**
**موغننی! دادەی، وە ناڵــــــــەی نەوا**
**بوانە ئەی (فەرد)، بەو حەنجەرەی بــەرز**
**تا مینای فەلەك باوەرۆ ئەو لــــــــەرز[١٣٤]**

---

١٣٣- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٧٠).

١٣٤- دیوانی دەستنووسی هێشتا چاپ نەکراوی مەولەوی (لای خۆم)، لاپەڕە (١١٠).

واتە:دەردێکی وام گرتووە، دەرمانی نییە و مرۆڤ سام وبیم لەمجۆرە دەردانە دەکات. ئادەی کاکی گۆرانیبێژ !. ئەم بەیت (فەرد)ە شیعرەی من، بە چریکەیەکی ئەوندە بەرز بچڕە، تا بەڵکو قوببەی گەردوون بلەرزێت.

* * *

هەر لەبواری ئەمجۆرە نموونانەدا، کە داوا لە گۆرانیبێژ (موغەننی ــــ موتریب) دەکات، تا فەرد (بەیت)ە، شیعرەکانی خۆی بە ئاواز و مەقامەوە بخوێنن. نموونەیەکی تری لەمانە جوانترمان نیشاندەدات. لەم نموونەیەدا لەلایەکەوە زانیاریی و شارەزاییەکی زۆری مەولەوی، لەبارەی موزیك و لەلایەکی تریشەوە توانای مەولەوی لەوێناکردنی تابلۆیەکی هونەریی تایبەت بە ئامێری موزیکی تار، کە تەنیا لە نیو تاکە بەیتی شیعرێکیدا، زۆر خێرا، جەستە و بالای خۆی:(مەولەوی)مان لە شێوەی ئامێرێکی (موزیك)یی کەمان و تار، بۆ بەرجەستە دەکات. بەڵام بالایەك، کە تەنگ و چەڵەمە و کارەساتە قورس و گرانەکانی ژیان، ماندوویان کردبێ و بالایان چەماندبێتەوە و لە دەستدانی زۆر لە خوشەویستان و پیرۆزیی و بەدی نەهاتنی خەونە سەوزەکانیش، چاوەکانیان فێری فرمێسك رشتنێکی بەردەوام و نەبڕاوەی وەك شێوەی تاڵە پلووسك و چۆڕاوگەیەکی باریك و روون کردبێ و لە روخسارەوە بۆ بەرپێ بڕژێ..یان وەك خۆی دەڵێ:کارەساتە دڵتەزێنەکانی ژیان، ئەم فرمێسکە چۆڕاوگە بەستووەی چاوی مەولەویان (کۆك) کردبێ، کە واژەی (کۆك) لە زانستی موزیکدا (وەك پێشتریش وتمان) هەر ئەو کەسانە دەیزانن کە خۆیان راستەوخۆ، موزیکیان ژەندبێ، یان لە بواری زانستی موزیکدا کاریان کردبێ.

ئالێرەدا، خاوەنی ئەم بالا چەماوە فرمێسك رێژە کۆك کراوە:مەولەوی، داوا لە گۆرانیبێژ (موتریب ــــ موزیکژەن) دەکات تا بالا چەماوەکەی، وەك ئامێرێکی تار و تاڵە پلووسکە فرمێسکەکانیشی، وەك (ژێ)یەکی کۆك کراوی (تار)ەکە لەبەرچاو بگرێ و بکەوێتە ژەنینی ئەم جەستە بە تار بووە..کە دەبێ بڵێم سەلیقە و دەسەڵاتی شاعیرانە و هونەرمەندانەی مەولەوی، لەوێناکردنی ئەم جەستەیەی

کوێرەوەرییەکانی ژیان، کردیانە تار و لە تاکە نیوە بەیتی شیعرێکدا، زۆر خێرا، بە بەرچاوی خەیاڵمانی هێنا، زۆر لەوە باڵاتر و بە توناتر بووە، کە من بەم چەند رستە درێژ و پشووە سوارانەمەوە (لەگەڵ داوای لێبووردنم لە گیانی بەرزی مەولەوی)، بتوانم تەقەللای نەزۆکانەی لێکدانەوەی ئەو وێنە شیعریی یە، بۆ خوێنەران راڤە بکەم، لەکاتێکدا مەولەوی هەر تەنیا لە ساتە وەختێکی زۆر کورت و تەنانەت لە ماوەی چاوتروکاندنێکدا وتوویەتی:

**(١٨)**

**موتریب! یە (کەمان) باڵای خەم وەردەم**
**یە (تارئەسرین)، خەم (کۆك) ئاوەردەم**
**سادەی تەنخوای من، وەی دەم دەردەوە**
**لێدەر نەوایێ، وەی چەند فەردەوە:**[١٣٥]

* * *

١٣٥- دیوانی مەولەوی، لاپەڕە (٥٣٥ ــ ٥٣٦).

**سەرنج:** هەڵبەتە ئەو (فەرد ــ بەیت) شیعرانەی مەولەوی مەبەستێتی، لە دوای ئەم دوو بەیتەوەن و ئێمە تەنیا مەبەستمان ئەم دوو بەیتە بوو، کە پێوەندییان بە موزیکەوە بوو.

## (٣)

**دەف:**

هەر لەم نموونەی قوولّبوونەوە و لێبڕامانانەی **مەولەوی**، لە ئامێرگەلی موزیك و خۆپێچوواندنی بە ئامێری موزیك، نموونەیەكی تری هاووێنەی پێشوو بەسەر دەكەینەوە، كە لەمیاندا لەگەلّ ئامێرێكی تردا، كە ئامێری (دەف)ە و سەدان سالّە لە كوردستاندا، هەم لە كۆڕی ئاهەنگی كۆمەلاّیەتی و هەم لە كۆڕی خواپەرستیشدا بەكاردەبرێ، خۆی بە ئامێری (دەف) دەچوێنێی و ئەوندە شاعیرانە، لە ئامێری (دەف) و كەرەسەكانی پێكهاتەی (دەف) ورد دەبێتەوە (كە بریتین لە :پێست، كەمە، حەلّقەی دەوری كەمە ـــ كە)، تا جەستەی خۆی دەكاتە ئامێری (دەف) و بە هۆیەوە بتوانێ لە رێگەی جەستەی بە (دەف) بووی خۆیەوە، پەیامێكی تر بە دلّدار و دلّبەرەكەی (واتە:خوا) رابگەنێ، كە پەیامی ئەم لە پەیامی ئاسایی دلّدارانی تر، جیاوازتر و گەورەترە و دەیەوێ لە رێگەی ئەم وێنە سازییە شیعرییەوە، بە (یار ـــ دلّدار ـــ دلّبەر)ی بسەلمێنێ كە ئەوینی یار، نەك هەر لە جەستە ئاساییەكەی خۆیدا جێگە دەكاتەوە، كە خوێن و گۆشت و لێوڕێژە لە هەست و هۆش و سۆز و كولّی ئەوین، بەلّكو بۆ هەموو ئەو شتانەش دەگوێزرێتەوە، كە لەم گەردوونەدا هەن و گیان (رۆح) یان لە بەردا نییە و دەیانكاتە عاشق و ئەویندار و لە رێگەی ژەندنیانەوە، بە دەنگیان دەهێنێ و ئەوانیش باسی ئەوینی خۆیان بۆ یار دەكەن.

مەولەوی جگەلەوەی لەم وێنەی جەستە بە (دەف) بووەی خۆیدا، سۆزی دەروێشانە دەیگرێ و ناخی دلّدارانەی بە دەنگ دێت (دەژەندرێ)، هاوكات راستییەكی تر لە بەرامبەر بەراوردكردنی خۆی و دلّدارەكەیدا دەردەبڕێ، كە رازی خۆ بچووككردنەوەی خۆیەتی لە ئاستی دلّداردا، تا ئاستی ئەوەی (یار)، ئەوەندە مەزن و شكۆدار و بە دەسەلاّتە، هەموو دەسەلاّتەكانی تری لە خۆیدا تواندۆتەوە.

بۆیە مەولەوی هەموو دەسەڵاتێکی خۆی لە (دڵبەر)دا دەبینێ و وەك پەیڕەوکارێکی ڕێبازی نەقشبەندی، کە بەرگی خوری (صوف) لەبەر دەکەن و پێستی پێ داپۆشراوی (دەف)یش، هەر لە پێستی (مەڕ)ە، کە پێشتر خوری پێوە بوو، واتە: لە پێستی (بەرە دووگی مەڕ)ە، ئەوا ئەمیش:مەولەوی (دەف)، پێستی خۆ بچوککردنەوەی لەبەرکردووە و بۆتە (کۆیلە)یەکی دڵبەر و وەك بەڵگەی ئەوەش کە کۆیلەکانی جاران، بۆ جیاکردنەوەیان لە کەسانی ئاسایی، (گوارە)یان لە گوێ دەکرا، ئەمیش (ئەڵقە)کانی دەوری (کەمە)ی دەفەکەی، (کە کەمەی دەفیش، وەك گوێی مرۆڤ، شێوەی خڕ و بازنەییە) لە باتی جووتێ گوارە، چەندان گوارە (حەلقە)ی لە گوێ کردووە:

**چون:دەف، بەرگ پۆس، ئیرادەت پۆشم**
**(غوڵام) بەردەس، (حەڵقە) نەگوشـــم**[136]

* * *

دیسان هەر لەم وێنە شیعریی و خۆ بچوککردنەوەیەی **مەولەوی** دا کە بۆتە ئامێری دەف و لەبەرامبەر ئەوینی یاردا دەژەندرێ، وێنەی تریشی هەیە، کە سەرەڕای ئەوەی ئەم دەفە ژەندراوە و سۆز گرتوویەتی، بەڵام بۆ ڕێزلێنان و هێژا ڕاگرتنی پلەوپایەی یار، ئەوەی لەیاد نەچووە، تا ئاداب و نەزاکەتی جۆری ئامادەبوون لە حزووری یاردا ڕابگرێ و لە کاتی ژەندنیدا، کە دەجۆشێ و دەخرۆشێ، دەبێ هۆشی لە خۆی بێت و هەر بە هۆی سۆز و ناڵەی دەنگی دەفەکەوە، هێز و هۆشی بەبەردا بێتەوە و وەك (دەف)، ڕووی لای (یار) بێت و پشت لە دڵبەر نەکات، کە نیشانەی هەرزەیی و لەبیرکردنی نەزاکەت و پلەوپایەی یارە:

---

١٣٦- دیوانی مەولەوی، ل٢٨.

**دەف ئاسا، بەو سۆز ناڵە و سـەداوە**
**روو ئەو یاران بوو، پشت ئەو دماوە**[137]

*    *    *

وەك وتمان:دەف ئامێرێکی موزیکی تەمەن درێژە لە کوردستان و لە دێرزەمانەوە، لە زۆربەی بۆنەگەلی (کۆمەڵایەتی) و (ئایینی)شدا بەکاردەبرێ، **جگەلەوەی** که لە ناوچەکانی هەورامانی (تەخت)یشدا، لە نزیکەی هەزاران ساڵ لەمەوبەرەوە تا ئێستا، هەموو ساڵێك لە رۆژانی (**١٠ ــــ ١**)ی مانگی بەهمەنی هەتاوی ــــ سەرەتای مانگی شوباتی زاینیی و بەفرانباری کوردی دا، یادی (پیرشالیار) دەکەنەوە، لەم یادکردنەوەدا دەیان ئامێری (دەف) پێکەوە و لەیەك کاتدا، سرووتی یادکردنەوەکە گەرمتر و خرۆشاوتر دەکەن و هەر هەمان ئەم (یادی پیرشالیار)ە، بەشێوەیەکی تایبەت تریش لەلایەن پێڕەوانی (ئەهلی هەق)ەوە، لە ناوچەکانی خۆیاندا ئەنجام دەدەن[138].

بەبێ هیچ سێ و دوویەك، دەبێ ئەم ئامادەبوونە هەمیشە و زیندووەی ئامێری (دەف)ی ناو خانەقا و تەکیەکانی پێڕەوانی ئایینی ئیسلام و یادەکانی (پیرشالیار)، لە هەورامانی (تەخت) و ناوچەکانی (ئەهلی هەق)نشیندا، ئامادەبوونێکی بەردەوامی ئامێری (دەف)ی لە بیرەوەری و هەستی (مەولەوی)یشدا راگرتبێ، بۆیە **مەولەوی** لەگەڵ شیعری تریدا، کە دەیەوێ ئاوازی شیعرەکانی سیحراویی تر بن، پەنا بۆ ناڵەی رۆح داچڵەکێنی ئامێری (دەف) دەبات و داوا لە (دەفژەن) و ئامێری (دەف) دەکات، تا ئاهەنگی شیعرەکانی خرۆشاوتر بکەن:

---

١٣٧- دیوانی مەولەوی، ل٣١٩.

١٣٨- بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە، بنوارە: علی حصوری:سیاوشان، نشر چشمە، چاپ دوم، تهران، ١٣٨٤ش،ص١١٦ ــــ ١٢٠.

قەزای پەنجەکەت دەك لەمن کـــەفێ
خەیلـێ عاجزم، ســـا لێدەر (دەف)ێ[139]

* * *

مـــــایل کەر بالآ، وەلادا چون نـــەی
دەستێوت:(دەف) بۆ، ئەو دەس:جام مـــەی[140]

* * *

یا:وەلوەلەی (دەف)، سا دەروێش! جۆشێ
بەو ســەدای ریشەی دڵ ئاشـــــــناوە
یا:جۆش ســـــەمتوور، موتریب! خرۆشێ
چەنی ئەی دوو فەرد، حەسرەت مەعناوە[141]

١٣٩- دیوانی مەولەوی، ل٢١.

١٤٠- هەمان سەرچاوە، ل٢٨.

١٤١- دیوانی مەولەوی، ل٧٠.

کاتێکیش کە ناڵەی ئامێری (دەف)، ڕۆح و هەناوی **مەولەوی** بە کوڵ دێنێ و خۆزگەی دامرکاندنەوەی قوڵپە قوڵپی ڕۆحی دەکات، دیسان هەر پەنا بۆ ئامێری (دەف) دەبات، تا هەستی خرۆشاوی ئارام بکاتەوە:

**پەی دیگ دەروون، جۆش کوڵ و کەف**
**تەسکین نمەك کـــزەی کەف و دەف**[١٤٢]

***   *   ***

**بەزم هـــــــام فەردان یـــــــار موبەت کیش**
**یەك ئیمشەو (دەف)ێ، دەروێش! های دەروێش!**[١٤٣]

***   *   ***

**سەدای (دەف) و (نەی)، مەیۆ نەگۆشـــــت**
**نەشئەی مەی بەخشۆ حەیات وە گۆشـــت**
**بویەر جەسای تەرز، (دەف) و (نەی)یەوە**
**وەزات مەستیی نەشــــــــئەی مەیەوە**[١٤٤]

***   *   ***

١٤٢- هەمان سەرچاوە، ل٤٠.

١٤٣- هەمان سەرچاوە، ل٧١.

١٤٤- هەمان سەرچاوە، ل٣٢٧.

**هۆش:وه سەدای (دەف)، گۆش :وه نەوای (نەی)**
**دەس:وەشیشەوە، لێو: وه جـــــــــام مەی[145]**

***  *  ***

**سا دەی سەرپەنجەت پەی (دەف) بەرەوە**
**رووی یاد باڵاش، مەخســـــەڵ دەرەوە[146]**

***  *  ***

**ساقی! سا دەخیل، جام مەی وه کـــەف**
**دەروێش! ئامانەن، کەفێ نه ڕووی (دەف)**
**من:ناڵە، تۆ: (دەف)، ئەو: ساقی، یا دوورد**
**هەنی فەرد، دەرد مـــەینەت گەردەن ورد[147]**

***  *  ***

---

١٤٥- هەمان سەرچاوە، ل٢٣٠.

١٤٦- هەمان سەرچاوە، ل٢٤٩.

١٤٧- هەمان سەرچاوە، ل١٨٤ ـــــ ١٨٥.

**مەقام:**

ئالەم کاتانەدا، کە **مەولەوی تاوەگوزی** ڕۆحی پڕ دەبێ لە ناڵە و خرۆشی دەنگی (دەف) و هەست و جەستەی دەهەژێ، حەزدەکات (مەقام)زانێکی دەنگخۆش، هەڵقوڵێنی ئیلهامی شیعری بلاوێنێ، تا بەهرەی ئەفراندنی، لە هەڵقوڵین و بەخشینی بێبڕانەوە نەکەوێ...لێرەوە نهێنییەکی تری ئەوین و زانیاریی (مەولەوی)مان لە بارەی زانستی (مەقام)ەوە بۆ دەردەکەوێ، کە چەند شارەزایانە باس لە (دەسگا)کانی موزیکی گەلانی ئاریایی نەژاد و مەقام و بەشەکانیان دەکات.

سەرەتا لەم (٥) بەیتە شیعرەدا، داوا لە موغەننی ـــ گۆرانیبێژ دەکات، تا مەقامی (نەوا)ی بۆ بخوێنێ، کە (نەوا) یەکێکە لە (٧) دەسگا[١٤٨] بنەڕەتییەکانی موزیکی گەلانی ئاریایی نەژاد:

**بابەیۆ وەش وەش، سۆزەی سەداکەت**
**لەرەی (نەوا)ی تەرز، شیرین ئەداکەت[١٤٩]**

* * *

**موغەننی! تەنخوای من، وە (نەوا) بێ**
**وەی چەند فەردەوە، هۆردەر سەدایێ[١٥٠]**

* * *

---

١٤٨- ئەو (٧) دەسگایە بریتین لە:هومایون، ماهوور، سێگا، چوارگا، شوور، نەوا، راست، یان پێنجگا.

١٤٩- دیوانی مەولەوی، ل٤٠.

١٥٠- هەمان سەرچاوە، ل٢٢٧.

**فەلەك! داد جەدەرد  بێ دەواکەی تۆ**
**موغەننی! فەریاد، ئەو (نەوا)کەی تۆ**[151]

*     *     *

**سامان سام کەردەن، دەرد بێ دەوا**
**موغەننی! دادەی، وە ناڵەی (نەوا)**
**بدانە ئەی فەرد، بەو حەنجەرەی بەرز**
**تا مینای فەلەك، باوەرۆ ئەو لەرز**[152]

*     *     *

لەم تاکە بەیتە شیعرەشدا، داوا لە موتریب (گۆرانیبێژ) دەکات، تا مەقامی (حیجاز)ی بۆ بخوێنێ، کە مەقامی حیجاز ـــ یش، (گۆشە)، یان (پەردە)یەکە لە دەسگای (شوور)[153] و (مەولەوی)ش زۆر هۆشیارانە، هەر بە ناوی (پەردە)وە، ناوی دێنێ[154]:

---

١٥١- هەمان سەرچاوە، ل٤٢٨.

١٥٢- دیوانی دەستنووسی بڵاونەکراوەی مەولەوی (لای خۆم)، ل١١٠.

١٥٣- هەر ئەم مەقامە، بە ناوی (ئەبوعەتا)ش ناو دەبرێ.

١٥٤- هەر لە بواری ناوهێنانی (پەردە)ی موزیکدا، مەولەوی نموونەی تریشی وەك ئەم بەیتە هەیە:

**پێم دەر تا پەردەی یەخ کەردەم بوو گـــەرم**

**موتریب! وە (پەردە)ی (روباب)، وە بێ شەرم**

ل١١٢، دیوانی دەستنووس لای خۆم.

**موتریب! بەو نەغمەی شـــــانازیتەوە**
**یا بەو (پەردە)ی پاك (حیجاز)یتەوە**[155]

*  *  *

لەم دوو جێگایەشدا، ناوی مەقامێك دێنێ، كە لەو رۆژگارەدا باوی بووە و ئێستا شوێنەواری نازانرێ، بەڵام وەك مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس، ئاگاداری ناوچەی هەورامان بووە، دەڵێ:ئاوازێكی كۆنی كوردی یە[156]:

**بوڵەند كەر مەقام (دڵسۆز) وە راســـی**
**تەنزیلەش فەردگەل:خاڵۆی (كۆماسی)**[157]

*  *  *

**بوڵەند كەر (دڵسۆز)، سەدای دڵتەنگی**
**بەڵكم بێدار بوو جەی خاو ســـەنگیی**[158]

*  *  *

لە دوو جێگەی تری شیعرەكانیدا، ناوی دوو مەقامی كۆنی كوردی، بە ناوی مەقامی (دیلان) و مەقامی (شانازی) دێنێ، كە ئەوانیش لە ئێستادا زانیارییمان

---

١٥٥- دیوانی مەولەوی، ل٤٦٠.

١٥٦- دیوانی مەولەوی، ل٤٢٨، ٤٦٠.

١٥٧- هەمان سەرچاوە، ل٤٢٨.

١٥٨- هەمان سەرچاوە، ل٤٦٠.

لەسەریان نییە، بەڵام دیسان و بە گوێرەی زانیاریی مامۆستا **مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس**، سەبارەت بە یەکەمیان (دیلان) دەڵێ:مەقامێکی کۆنی کوردی یە، لەکاتی بووك گواستنەوەدا دەوترێ[159]:

**جە تەنخوای نەی بەزم، خەم وەیلانەوە**

**هۆردەر ئەی چەند فەرد، وە (دیلان)ەوە**[160]

* * *

سەبارەت بە دووەمیشیان (مەقامی شانازی) دەڵێ: مەقامێکی کۆنە[161]:

**موتریب! بەو نەغمەی (شانازی)یتەوە**

**یا:بەو پەردەی پاك حیجـــــازیتەوە**[162]

* * *

**مەولەوی** بە دەم ئەم زانیارییانەیەوە لەمەڕ (موزیك و دەسگاکانی موزیك و مەقام و پەردە)وە، ئاماژە بە دوو دۆخی موزیکی وەك (زیل و بەم)، یان (زیر و بەم)یش دەکات: کە دوو واژەی لێکدراوی موزیکن و یەکەمیان (زیر ـــ زیل)، مەبەست لە دەنگی (ناسك)ە و دووەمیشیان (بەم)، مەبەست لە دەنگی (گڕ)ە:

---

١٥٩- هەمان سەرچاوە، ل٢٧٦.

١٦٠- هەمان سەرچاوە، ل٢٧.

١٦١- هەمان سەرچاوە، ل٤٦٠.

١٦٢ - هەمان سەرچاوە، ل٢١.

**سەدای (زیل و بەم)، مەینەت سەد تەرزەن**
**خەفەت: شادیشەن، خەم: دەماخ بەرزن**

* * *

**سا گۆش دەر ساتێ وەی (زیر و بەم) دا**
**بویەر وە ناڵێن ئەهل مـــــــاتەم دا**[١٦٣]

* * *

١٦٣- دیوانی مەولەوی، ل٣١٤.

**نەی = شمشاڵ:**

بەڵام ئەگەر لە ئاکامی ئەم رووماڵکردنەی پێوەندی و ئەوینی **مەولەوی**، لەگەڵ ئامێرگەلی موزیکدا، زۆرتر ورد ببینەوە، دەبینین لەناو تێکڕای ئەو ئامێرە موزیکییانەی پێشتر بەسەرمان کردنەوە و ناومان هێنان، ناوی ئامێری (شمشاڵ ــــ نەی ــــ لوولە)، لەچاو سەرلەبەری ئامێرەکانی تردا، لە هەموویان زیاتر ناوی دێت. یان بە واتایەکی تر:**مەولەوی** لەگەڵ ئامێری (نەی = شمشاڵ)دا، زۆر هۆگرە و زۆریش بە تاسە و کوڵەوە، ئارەزووی بیستنی دەنگی شمشاڵی هەیە و پتر لە ئامێرەکانی تری موزیك، داوا و تکا لە شمشاڵژەن (نەیچی) دەکات، تا بە هانای بانگەوازی رۆحییەوە بێت و رۆحی بلاوێنێ، کە ئەم چەپکە شیعرە و بەیتە شیعرەی، لە جەستەی شیعرەکانی **مەولەوی** بە نموونەیان دەهێنینەوە، بەڵگەی ئەو نزیکایەتییەی **مەولەوی** و ئامێری (نەی = شمشاڵ)ن:

**تا موتریب وە ســـــاز حەنجەرەی بێگەرد**
**هۆردۆ مەقــــــامێ، دەوا کـــەرۆ دەرد**
**بەڵ ناکـــا (نەیچی)، بەیۆ جـــە لاوە**
**وە مەقامەکەی قەقنەس ئاســــــــاوە**[164]

***   *   ***

**(نەیچی)! سا لێدەر، قەزات وە مــــاڵم**
**دەمێ دەر وە (نەی)، دەروون زوخـــــاڵم**[165]

***   *   ***

---

١٦٤- هەمان سەرچاوە، ل١٠.

١٦٥- هەمان سەرچاوە، ل٢٠.

(نەیچی)! درەنگەن، سا مەکـــــەر درەنگ
فیدای پەنجەت بام، (نەی) باوەر وە دەنگ
هەر تەرزێ پەی وێش بکـــــــەرۆ رازێ
گێرۆ نە دەروون هەر ســـــــازێ، گازێ
بجۆشۆ هەر کەس، وە قەد ناڵـــــەی وێش
بنۆشۆ هەر کەس، وە پیاڵـــــــەی وێش
جەلای هەر گەردێ، وە ســــــــەدایێوەن
دەوای هـــــــــەر دەردێ، وە نەوایێوەن
هەر مەقامێوەن جگـــــــــــەر تاون بۆ
گـیفلی بێچـــــــــــــــارەی دلاّن لاون بۆ[١٦٦]

* * *

سا دەی ساحیب (نەی)! ریشـــەی دڵ کەر پەی
تالیم دەر ئەی فەرد، وە نەزمەکـــەی (نەی)
ئیشەو) وە هەر حاڵ، شـــــەو وە رۆ بەروون
ئەی خوا، ســـا مەرگێ، سەحەر چێش کەروون[١٦٧]

* * *

---

١٦٦- هەمان سەرچاوە، ل٢٢

١٦٧- دیوانی مەولەوی، ل٢٣.

**(نەیچی)! من پەنجـــەی پای ناڵەم سفتەن**
**تۆ! دەی چون تەئسیر وە ناڵـــــەت جفتەن**
**چەند فەرد (مەعــدووم)، دەروون نە وەی دا**
**باوەر جەتەنخوای ناڵــــــە، وە (نەی)دا**[168]

*   *   *

**(نەیچی)! وە بێ بـــــــەزم، یاران جانی**
**کام ســــــــەفا مەندەن پەی زیندەگانی!**
**چون مەزاق تاڵەن، جــــــە گردین لاوە**
**بۆ وە شـــــــــیرینیی یەك دوو نەواوە**
**یەکێ: یەکـــــــــــجاریی تاونۆمەوە**
**ئەو یەك: لاونۆم، یاونۆمـــــــــــــەوە**[169]

*   *   *

---

١٦٨- هەمان سەرچاوە، ل٢٤ ـــ ٢٥.

١٦٩- هەمان سەرچاوە، ل٤٦.

بزانديٚ خەم چۆن گـــــــــەردەنم پامالٚ
دەخيلم ســــــــــــاقی! گەردن سيم قالٚ
جــــــــامیٚ جەمەعجوون دەرد ئەو گاران
دورد وامەندەی بەزمـــــــــــەكەی جاران
پێم دەر، تا ريشەی هەستيی كـــــــــەرۆ پەی
قوربان تۆيچ (نەيچی)! دەستیٚ دەر پەی(نەی)
وە تەرزەكـــــــــــەی وێت، من لاونەوە
وە مەقامیٚ وەش، خـــــــــــەم تاونەوە
با خاس خاس هۆشـــــــم، هيچ نەمەنۆ پێم
بەلٚ ئازيز وەخەير، رەحمیٚ كــــــەرۆ پێم[170]

* * *

ويەردە ويەرد، هەولیٚ پــــــــــەی باقی
ئەمجـــــار يە دەروێش، يە (نەيچی) و ساقی
هۆش: وە سەدای دەف، گۆش:وە نەوای (نەی)
دەس: وە شيشەوە، لێو:وە جـــــــــام مەی[171]

* * *

١٧٠- هەمان سەرچاوە، ل١٥٠.

١٧١- هەمان سەرچاوە، ل٢٣٠.

موتریب! یەکارەن! مـــــــــەر سیاسەنگی!
من بەی حـــــــــاڵەوە، تۆ وەی بێدەنگیی!
جە تەنخوای (نەی) بەزم، خـــــەم وەیلانەوە
هۆردەر ئەی چەند فـــــــــەرد، وە دیلانەوە[172]

* * *

بێ ئەمریی فەرمـــــــــان، ئازیز تا وە کەی؟
های دەروێش! نەیچی! مەیچی! دەف، مەی، (نەی)
بەڵ باڵ بەیداخ، تاقـــــــــەت ئەو پابۆ
بۆی تەئســــــــــیر بەزم، بەدرەقەی رابۆ
دەس گیروو نەسەر ســــــەدای (نەی)، پەی پەی
تا وە ئینتیهای ئەو ســــــــەر سەدای (نەی)
چون پیاڵەی ســـــاف، دەروون جە مەی کەیل
بمانوو خاس خاس، عەکــــــس چیهرەی لەیل[173]

* * *

هۆردەر چەنی ســـــــــــۆز، دەروون پڕ نێش
فەریاد ئەو ســـــاقیێ! و ئەو (نەیچی) و دەروێش
ســـــــــــەدای دەف و (نەی)، بەیۆ نەگۆشت
نەشئەی مـــــــەی، بەخشۆ:حەیات وە هۆشت
بویەر جەســـــــای تەرز، دەف و (نەی)ەوە
وە زات مەستیی نەشـــــــــــئەی مەیوە[174]

---

١٧٢- دیوانی مەولەوی، ل٢٧٦.

١٧٣- هەمان سەرچاوە، ل٣١٩.

* * *

**نەوای ناڵەی دڵ، وێنەی ســـــــــەدای (نەی)**
**پیاڵەیی زووخـــــــــــاو، مەنۆشوو چون مەی**[175]

* * *

**ســــــــــا (نەیچی)! دەخیل، بێ دێر و درەنگ**
**موتریب! فیدات بــــــم، (نەی) باوەر وە دەنگ**[176]

. . .

**سازان بســـــــــــــازە، پەی واوەیلای وەی**
**کــــــەف بدەر نە دەف، چەنگ باوەر وە (نەی)**[177]

* * *

**هەستیی و نەســــــــــتیی، وە بێ تەوفیرەن**
**(نەیچی)! هـــــــــەر تەرزێ، یاها دڵگیرەن**
**لێدەر تا جـــــــــــەم بۆ، پەشێویی هۆشم**
**ناڵەی حەزینت بەیۆ نەگوشـــــــــــــــــم**
**تەئسیرش چون ســـــــــــیم، تاونۆمەوە**
**وە ئەسڵ مەتڵـــــــــــەب، یاونۆمـــــەوە**[178]

---

١٧٤- هەمان سەرچاوە، ل٢٢٧.

١٧٥- هەمان سەرچاوە، ل٤٤٦.

١٧٦- دیوانی دەستنووسی بڵاونەکراوەی مەولەوی (لای خۆم)، ل٨٩ ـــ ٩٠.

١٧٧ - دیوانی دەستنووسی بڵاونەکراوەی مەولەوی (لای خۆم)، ل٩٠.

فامم زەلیلـــــــــــەن، دەروون زامدارەن
(نەیچی)! نالّەی (نەی)، ئەمجـــــار وەکارەن
فیدای پەنجەت بۆ، مەقــــــامێ وەش تەرز
لێدەر، تا ریشـــــــــەی دلّ بارۆ ئەو لەرز
گۆش دەر وە نـــــەوای دلّپەزیرەکـــــــەت
هۆش دەر وە نەغمــــەی وەش تەقریرەکـــەت[179]

* * *

فیدات بم (نەیچی)! کەســــــــم هەرتۆنی
حەکیم زامان، کۆنە و هــــــــــــەم نۆنی
لێدەر مەقـــــــــــامێ، دلّ بارۆ ئەو دەرد
ئازیز سلاّمەت، من هاکــــــۆ چــــــەم کرد[180]

---

١٧٨- دیوانی دەستنووسی بلاّونەکراوەی مەولەوی (لای خۆم)، ل١٠٥ ـــ ١١١.

١٧٩- دیوانی دەستنووسی بلاّونەکراوەی مەولەوی (لای خۆم)، ل١١١.

١٨٠ - دیوانی دەستنووسی بلاّونەکراوەی مەولەوی (لای خۆم)، ل١١٢.

## (٤)

**ئەنجام:**

هەر لە بەسەرکردنەوەی ئەم نموونەگەلە شیعرییانەی **مەولەوی تاوەگۆزی** دا، کە سەبارەت بە موزیك بە گشتی و بە تایبەتیش بە ئامێرگەلی موزیك نووسیونی، دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین: **مەولەوی تاوەگۆزی** لەناو سەرلەبەری شاعیرانی کورددا، تاقانە شاعیرێکە، لەلایەکەوە بەو ڕێز و شکۆیەوە باس لە موزیك دەکات و لەلایەکی دیکەشەوە بەو ئەندازە زۆر و بەرچاوەوە، ئاوڕ لە موزیك و ئامێرەکانی موزیك دەداتەوە. لەم ئاوڕدانەوەشیدا زۆر بە ئاگادارییی و شارەزاییەوە، دێرینەی موزیکی ئایین و گەلانی ناوچەکە بەیاد دەهێنێتەوە و بە هزرێکی هوشیار و شارستانییانە، ڕێز لە موزیکی ئایین و ڕێبازە کۆنەکانی ئایین بە گشتی و لە موزیکی ئایینی (ئەهلی هەق) بە تایبەتی دەگرێ و بنەما و فەلسەفە و بیروباوەڕی ئایینی (ئەهلی هەق) باسدەکات و ڕێز لە سرووت و رابەر و مەزارگە و شوێنە پیرۆزەکانیشیان دەگرێ و زیارەتیشیان دەکات. ئەمەش دیاردەیەکی ناوازە و دەگمەنی ڕووناکبیرانەی شاعیرێکی هوشیار و موسڵمانێکی هەست و هۆش کراوەی نزیکەی سەدە و نیوێك لەمەوبەرە، کە ئەوین و خۆشەویستیی راستەقینەی خوا، هەموو سنووره جیاوازەکانی نێوان ئایین و زمان و رەگەز و جوگرافیاکانی بەلاوە ناوە و لەناو سەرلەبەری ئەو جیاوازییانەدا، لەناو سەرلەبەری هەموو کیشوەر و هەموو گەردووندا، تەنیا و تەنیا، ئەوینی تاقانە یار = دڵبەری تاقانە:(خوا) و جوانیی دەدرەوشێتەوە.

لە سەرومڕی شیعری **مەولەوی تاوەگوزی** دا، هەموو شتێك کە لەم گەردوونەدا هەن، لە چاوی مەولەوی تاوەگوزی دا جوانن: **دار**، **بەرد**، **کانی**، **چەم**، **زێ**، **تاڤگە**، **قەڵبەز**، **باڵندە**، **درەخت**، **گوڵ**، **باران**، **بەفر**، **با**، **سەهۆڵ**، **شەختە**.. هەموو ئەمانەش لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا، روخسار و دیمەنیان، لە روخسار و دیمەنی

وەرزەکانی پێشتریاندا جیاواز و جوانتر دەبنەوە. لە روخساری هەریەکەشیاندا، بریسکە و سەرەتاتکێ و چاوبڕکێی یار ـــ دڵبەر (خوا)یان تیادا دەدرەوشێتەوە و بە هەمووشیان رامان و سەراسیمەبوون و دڵبەستەبوون، بە مەولەوی تاوەگۆزی دەبەخشن، تا زیاتر هەڵوەدا و شەیدای ئەوین و بۆن و بەرامەی خۆیانی بکەن و ئاکامیش روخساری یار (خوا)، لە هەموویاندا دەتوێتەوە و بە هەموویان شوێنەگومێ لە مەولەوی تاوەگۆزی دەکەن، بۆیە کاتێ **مەولەوی تاوەگۆزی** دەیەوێ ئەم رازە بۆ ئەوینی بێ سنووری ئەم دڵبەرە (خوا) بدرکێنێ، دەڵێ:

**مەترسـوو جەحـیفڤ تەقریر ئەحواڵ**
**سـۆچۆ خەزانەی خەیاڵ شەمــــاڵ**
**من خۆ شەو و رۆ، ئارەزووی تۆمـــەن**
**پەرێ دیدەنت، نەزر و فتۆمــــــەن**
**بەڵام یەند بە یاد باڵاکـــــەی تۆوە**
**دەورم دان وە دەور سارا و ســــەر کۆوە**
**بۆی باڵات هەرزان، وە دەشت و هەردان**
**نمەز رای لای تۆم وە کام گورزەدان[181] !**

واتە:تاسەی دیدینتان ئەوەندە بە کـوڵ لـە دڵـدا پـەنگی خواردۆتـەوە، نـاوێرم هەواڵی خۆمتان بە (**با**)ی (شەماڵ)دا بۆ بنێرم، چونکە دەترسم ئـەو کلپەیـەی لـە دڵمدایە، گەنجینەی (شەماڵ)یش بسووتێنێ. من عەڤـداڵ و سـووتاوی دیتنتـانم و هەمیشە و هەمیشە، بەڕۆژ و بە شەو، ئارەزووی دیتنتان دەکەم و لەم پێناوەشـدا، هەرچیم هەیە، تەرخان و نەزری دیتنتانم کردووە و بۆ دیداریشتان هـەر لەگـەڕان و سۆراخ و پشکنیندام و هەرچی دەشت و چـۆڵ و هـەردان و چـیا هەیـە، گـەڕاوم و لەهەر شوێنێکیش کە دەچمێ، هەر بۆن و بەرامەی گوڵی خۆتی تێدا بـۆن دەکـەم! دە ئەی گوڵەکە! پێم بڵێ خۆت لە کوێدایت!؟ وا هەر گوڵاوت بۆن دەکەم؟!.

---

١٨١- دیوانی مەولەوی، ل١٥.

لەمجۆرە ئەوینە بێ سنوور و ڕەها و بێ کۆتاییانەدا، یـار = دڵبـەر (خـوا)، لـە هەموو جێگەیەکە و لە هیچ جێگەیەکیش نییە. لەبەرئەوە دەبێ (دڵدار)، هـەموو سـنوورەکان ببـەزێنێ و هەمیشـە و هەمیشـە لـە گـەڕان و سـۆراخ و پشـکنینی بێبڕانەوەدا بێت و لە هەموو ئەم گەڕانانەشدا، نـەك هـەر بێـزار و مانـدوو نـەبێ، بەڵکو بە تاسەی گەرمتر و نەفەس و پشووی تازەوە، شەیداتر و پەرۆشتر، بـە دوای یار (خوا)دا بگەڕێ و چـێژی هـەنگوینیی و ئەفسـانەیی لـەم ماندووبوونـە چـەش بکات و لەم گەڕانەشدا، هیچ جێگەیەك و هیچ قۆناغە ڕێیەك، نەبێتە نیشتمانی و لە هەموو شوێنێ خۆی بە غەریب و گەڕیدە و نامۆ بزانێ و بێ هەدادان، هەڵپـە و دڵەڕاوکە و پەژارە و گەڕانی بۆ ئەو زێد و نیشتمانە:ون و ئاشکرایە بێت، کە یار = دڵبەر (خوا)ی تێدا ون و ئاشکرا و دیار نادیار و شاراوە و لەبەر چاوە!!

لە هەموو ئەم دڵەڕاوکە و گەڕنانەشدا، مەودای نێوان لە یار دابـڕان و بـە یـار گەیشتن، تا دێت دوور و دوورتر دەکەوێتەوە...ئیتر (دڵـدار)ی شـەیدا و هـەڵوەدا، هەستی مەترسیکردن بە تەنیایی و جودایی، داگیری دەکات و دەیەوێ ئـەو مـەودا و قۆنـاغی مەترسـییە تێپـەڕێنێ. ئـەم قۆناغـە پـڕ دڵەڕاوکـە و پەژارەیـەش لای خواناسانی گەورە و دڵدارانی بـەهرەدار، بـە وەرزی داهێنـان و پیـت و بەخشـین و ئەفراندنی مەزن دادەنرێ.

**مەولەوی تاوەگۆزی**، کە لەیەك کاتدا خواناسێکی گـەورە و شـاعیرێکی بەهرەداریشـە، درێژترین وەرزی داهێنان و بەخشینە باڵاکانی شیعری، بریتی بووە لـەم قۆنـاغی نـامۆیی و دڵەڕاوکە و گەڕانانەی، بە دوای یار (خـوا)دا و بـۆ دامرکاندنـەوە و هێورکردنـەوەی پـەژارە ئاگراویی و نەپساوەکانی رۆحیشی، بێ پـەروا لـە بیسـتنی بـیروڕای داخـراوی هەنـدێ لـە رابەرانی ئایینی ئیسلام، هانا و هاوار بۆ موزیك و ئامێرەکانی موزیك و (سەماع) بردووە و وەك لە سەرووتریش ئاماژەمان پێکرد، لـەناو تێکـڕای ئامێرەکـانی موزیکیشـدا، هانـا و هاواری بۆ ئامێری شمشاڵ (نەی) بردووە و وەك دەشـزانین ئـامێری شمشـاڵ، هـەروەك چـۆن مێژوویەکی دێرینەی لە کلتووری کوردەوارییدا هەیە و لە زۆر (بەیت) و شیعری فۆلکلۆری و شـیعری شـاعیرانی کـورددا، ئامـاژەی جۆراوجـۆری پێکـراوە و لای پـەیڕەوانی ئـایینی (یەزیدی)یش، ئامێرێکی ڕێزلێگیراو و بەکاربراوە، بەهـەمان شـێوە لـە کلتـووری گـەلانی ئاریایی نەژادیشدا، دێرینەیەکی شیرینی هەیە.

بەڵام ئاماژەکانی مەولەوی تاوەگۆزی بۆ ئامێری شمشاڵ (نەی)، لەو نموونانەی بەرچاومان خستن، جیاوازترن و پەیامی جیاوازیشیان لەگەڵ خۆیاندا پێیە.

لەم نموونەگەلەی ئامێری شمشاڵدا، کە **مەولەوی تاوەگۆزی** هێمایان پێدەکات، ئامێری شمشاڵ هەربەتەنیا ئامێرێکی ئاسایی موزیك نییە، تا شاعیر پەژارەی ڕۆحی نامۆی خۆی پێ بلاوێنی، بەڵکو ئامێری شمشاڵ، ئامراز و هۆیەکە، شکۆدار و باڵا و لە جیاتی ڕۆحی خودی شاعیر، دەژەندرێ و دەدوێ. هەر لەبەرئەمەشە گەورە خواناسان و مەزنە شاعیران، جوانترین راز و باڵاترین شیعریان لە دەنگی شمشاڵدا دەربڕیوە، کە ئەم نەریتە لە دوای شاکارە بە نامێکەی شاعیری گەورە:(مەولەوی ڕۆمی = مەولەوی بەڵخی)یەوە، لەلایەن شاعیرانەوە کرایە سەرمەشق.

**مەولەوی ڕۆمی** لە شاکاری (**مپنوی** معنوی)یەکەیدا، کە بریتییە لەشەش بەشی گەورە و بە هەموویان (٩.٧٢٠ ـــ نۆ هەزار و حەوت سەد و بیست) بەیتە شیعرن[١٨٢]، لە سەرەتای یەکەمین بەشیدا، بە شیعری (نەی = شمشاڵ) و بەم بەیتە دەست پێدەکات.

**بشنو این نی چون حکایەت میکند**
**از جداییها شـــــکایت می کند**[١٨٣]

واتە:

**گوێ لە شمشاڵ (نەی) بگرە، بزانە چی دەڵێ!**
**داد و گازەندەی لە دەست جوداییە**

* * *

١٨٢- **مەولەوی ڕۆمی** جگە لەکتێبی: **مپنوی معنوی**، ئەم چەند بەرهەمەیشی هەیە: غزلیات شمس تبریزی، رباعیات، فیه ما فیه، مکاتیب، مجالس سبعه.

١٨٣- **مپنوی معنوی**، به تصحیح و پیشگفتار عبدالکریم سروش، شرکت أنتشارات علمی و فرهنگی، چاپ ششم، تهران، ١٣٨٠ش، ص٥.

ئەم شیعرەی (نەی = شمشاڵ)ی **مەولەوی رۆمی**، ئەگەرچی هەرتەنیا (٣٠) بەیتە، بەڵام لەسەردەمی نووسینیەوە بێ پسانەوە و تا ئێستاش بۆتە جێی لێدوان و لێکۆڵینەوە و مشتومڕ و هەڵسەنگاندنی زۆری ئەدەبیی و لەسەر نووسینی دەیان وتار و کتێبی هەمەجۆر.

**مەولەوی رۆمی**، لەم شیعری (شمشاڵ)ەیدا، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە ئەو ناڵە و بانگەوازەی لەم شیعری شمشاڵەیدایە، کڵپە و ئاگرە، نەك (با) و (فوو)! هەرکەسێکیش خاوەنی ئەم کڵپە و بڵێسەیە نەبێت،لە نرخی نەبووانە!.

**اتشست این بانگ نای و نیست باد**
**هرکه این اتش ندارد، نیست باد**[١٨٤]

* * *

**مەولەوی رۆمی** لەم شیعری شمشاڵەیدا، ئەوەندە بە سۆز و ناڵەی گەرمەوە، دەردی جودایی و لێك هەڵبڕانی خۆی باسدەکات، لەهەر بەیتێکی ئەم شیعرەدا، هەست بە تینی گەرمایی دڵ و دەروونی خرۆشاوی شاعیر دەکرێ، بۆیە ئەو شاعیرانەی ئاستی ئەوین و خواناسییان دەگاتە ئەوەی هەست بە سووتانی خۆیان بکەن، لە هەمان کاتیشدا هەست بە دابارینی پرشنگ و تیشکی (خوا) دەکەن، بۆ ناو جەستەی خۆیان و تەنینەوەی ئەم پرشنگ و تیشکەی خوا، بۆ سەرومڕی جەستەیان، تا ئەو سنوورەی هەست دەکەن ئیتر جەستەیان دەبێتە چەپکێ پرشنگ و رووناکیی خوا و هەر بەم هەستەشەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ ژینگەی دەروبەریشیاندا دەکەن، کە **مەولەوی تاوەگۆزی** بە جۆرێك لە جۆرەکان، دابارینی بەشێك لەم تیشك و پرشنگەی (خوا)ی بۆ ناو دڵ و دەروون پێبڕاوە و بە پەژارە و دڵەڕاوکەوە، خۆزگەی گەیشتن بە دابارینی

١٨٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٥.

**سەرنج:**لە نووسینەوەی ئەم نموونانەی (مەولەوی رۆمی)دا، رێنووسەکەی دکتۆر عەبدولکەریم سروش ـــ م پەیڕەوکردووە.

پرشنگی زیاتر و زیـاتر و خۆزگـەی دەربـڕینی ئـەم تاسـەیەی، لـە ئـامێری (شمشـاڵ)دا خواسـتووە و بـێ هـیچ دوودڵـی و سـێ و دوویـەکیش، لـەم تەقەللایەیـدا، جێپەنجـە و ڕەنگدانەوەی **مەولەوی ڕۆمی** پێوە دیارە، بۆیە **مەولـەوی تـاوەگۆزی** هێشـتا خـۆی لـە ژیانـدا بـووە، کـە شیعردۆسـتانی **مەولـەوی تـاوەگۆزی،** هـەمان ئـەم نزیکایـەتیی و ڕەنگدانەوەیـەی شـیعری (مەولـەوی ڕۆمـی = بـەڵخی) یـان لـەناو شـیعری مەولـەوی تاوەگۆزی دا، هەست پێکردووە و وەك مامۆسـتا **عەلائـەدین سـەجادی** نووسـیوێتی:لە شاری سنە، لە ئاهەنگێکی پڕ تەدارەکدا و لەسـەر فـەرمانی (غـولام شـاخان)ی مـیری ئەردەڵان، بە شێوەیەکی ڕەسمی، لەقەبی (مەولەوی) پێدراوە[185]، کە ئەگەرچی مامۆسـتا **عەلائەدین سـەجادی** لـەم نووسـینەیەدا، هـیچ بەڵگەیـەکی بـۆ پشـت ڕاسـتکردنەوە و سەلماندنی ئەم ڕووداوەی بە دیار نەخستووە، بەڵام گێڕانەوەکـەی زۆر گومـان هـەڵناگرێ، چونکە لە پاڵ ئەوەشدا کە **مەولەوی تاوەگۆزی،** کە خۆی ناوی (عەبدولڕەحیم) و نازنـاوی خۆی هەر بە (مەعدووم) ناوبردووە و لە هیچ شیعرێکیدا ناوێکی لـەنازناوی (مەولـەوی) نەبردووە، بـەڵام هاوتەمـەن و هاوسـەردەمەکانی **مەولـەوی تـاوەگۆزی** بـە گشـتی لـە نەوەکانی ڕۆژگاری ئێمە چاکتر بە کەسایەتی و ناوەڕۆکی شیعرەکانی **مەولەوی تاوەگۆزی** تێگەیشتبن، بۆیە ئەوان لە جیاتی ناوی (سەیید عەبدولڕەحیم) و نازناوی (مەعـدوومی)، نازناوی (مەولەوی)یان بەسەردا دابڕیوە، چـونکە ئـەوان زۆربـەی (مەولـەوی ڕۆمینـاس) بوون و بەلای کەمەوە (**مپنوی معنوی**) و (کلیات شمس تبریزی)ی (مەولەوی ڕۆمی ـــ **١٢٠٧ ـــ ١٢٧٣ز**)یـان خوێندۆتـەوە. لەبـەر ئـەوە ڕوونـاکبیرانی ئـەو ڕۆژگـارە و بـە تایبەتیش مامۆستای گەورە:**مەلا حامیـدی کاتـب** (**١٨١٠ ـــ ١٨٩٢ز**)ی هـاوڕێ و هاوسـەردەمی **مەولـەوی تـاوەگۆزی** و ژیننامەنووسـی **مەولاناخالیـدی نەقەشـبەندی** (**١٧٧٩ ـــ ١٨٢٧ز**)و شێخ عوسمانی سیراجەددین (**١٧٨٠ ـــ ١٨٦٦ز**)، لـە کتێبـە ناودارەکەیدا:(**ریاچ المشتاقین**)، کە لە ڕۆژگاری **مەولەوی تاوەگۆزی** دا نووسـیویەتی، لـە هەر بۆنەیەکدا ویسـتبێتی نـاوی (**سـەیید عەبـدولڕەحیم** ـــ معـدووم ـــ **مەولـەوی**

---

١٨٥- عەلائەدین سەجادی:مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، بەغدا(١٩٧١)، لاپەڕە (٢٨١).

**تاوەگۆزی)** بهێنێ، هەر بە **مەولەوی** ناوی بردووە[186]. دواتریش هەر ئەم نووسەرە، لە سەرچاوەی تر و بۆنەی کۆچی دوایی **مەولەوی تاوەگۆزی** دا، کە شیعری بە (فارسی) بۆ لاواندنەوەی **مەولەوی** نووسیوە، هەر بە (مەولەوی) ناوی بردووە و (قافیە)ی کۆتایی شیعرەکەشی هەر بە ناوی **مەولەوی** نووسیوە:

**آسمان گـــر خون ببارد بر وفات مولوی**
**زیبد ار برگ ســــیه پوشند اهل دنیوی**
**مجمع علم و عبادت مخزن صـــدق و صفا**
**مظهر عقل و درایت میر مــــلك معنوی**
**پیرو شرع محمد شــــــیخ اولاد حسین**
**ســــــالك راه گریقت در گریق اخروی**
**فارس نظم و قصاید در حقیقت، در مجاز**
**ریزه چین جودش صـــــــد امیر دهلوی**
**بهر تاریخ وفاتش انقدر کردیم فکـــــر**
**کاسمان (غش) کرد بر مـرگ جناب مولوی**[187]

ئەمەش راستگۆترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە لە دەمێکەوە و هەمیشە، هەر بە ناوی (مەولەوی) ناویان بردووە و هەر بە (مەولەوی)یش ناسراوە، کە دیارە مەبەست لەم نازناوەی، جۆرێك سەرمەشق کردنی بووە لە (مەولەوی رۆمی).

---

١٨٦- بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەیەوە، بنوارە:بیسارانی، ملا حامد، **ریاج المشتاقین**، به تصحیح و مقدمه و حواشی و تعلیقات:ابوبکر سپهردین، انتشارات **محمد رؤوف** سپهردین، چاپی جمالی، چاپی اول١٣٨٦ش، صص:٢٨٨، ٢٨٩، ٣١٥

١٨٧- مودەڕیس، مەلا عەبدولکەریم، یادی مەردان، بەرگی دووەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٣، ل٣٦٦.

هەڵبەتە ئەم سەرەمەشقکردنەی **مەولەوی تاوەگۆزی**، لە **مەولەوی رۆمی**، جێی لێڕامان و سەرسامیی نییە، چونکە رێبازەکەی **مەولەوی رۆمی** لە رۆژگاری خۆیەوە و تا ئێستاش هەر لە زیاد بووندایە و بە سەدان چاولێکار و پەیڕەوکار و سەرمەشقکاری هەیە و تا دێت دەتەنێتەوە و لە سنووری خۆرهەڵات تێدەپەڕێ و بەرەو ئەوروپا و ئەمریکاش دەچێ!. چونکە ئەم رێبازی مەولەوی رۆمی، شەقڵ و شێوەیەکی (دامەزراوە ــــ ئینستیتۆتستیۆن)ی بەخۆیەوە گرتووە و پەلوپۆی بۆ زۆر هەرێم رۆیشتووە. لەم بوارەدا بۆ نموونە دەڵێین: ئەولیا چەلەبی ساڵی (**١٦٣٥ز**)، لەسەر فەرمانی سڵتان محەمەدی چوارەم، ئامارێك لەسەر خانەقاکانی مەولەوی رۆمی کۆدەکاتەوە، کە لەو کاتەدا و هەر لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانییدا، ژمارەیان بە (**٥٥٠**) خانەقا و (**٦٠٠**)حوجرە دادەنێ، کە دیارە لەمەدا بەردەوامبوونی رێبازەکە و بەردەوامبوونی نەوەکانی (مەولەوی رۆمی)یش رۆڵی خۆیان لە پاراستن و تەشەنەکردنی شوێنەواری (مەولەوی رۆمی)دا هەبووە[188].

لەم شوێن پێ هەڵگرتن و سەرمەشقکردنەی ئەم شیعری (شمشاڵ)ەی **مەولەوی رۆمی** دا، شاعیرێکی ناوداری تری کورد، واتە:هێمن موکریانی، سەد ساڵ دوای **مەولەوی تاوەگۆزی** و لە ئاکامی ئەو ماوەی (**١٢**) ساڵ، دابڕان و دوورکەوتنەوە لە زێد و بنەماڵە و دەربەدەری و ئەو چەرمەسەرییەی بەسەر خۆی و نەتەوەکەیدا هاتبوو، شیعرێکی ناوازە و زۆر بە کوڵ و بە سۆزی بۆ دەردی جودایی خۆی و بە ناوی (ناڵەی جودایی)، لە (**١١١**) بەیتدا نووسیوە، کە یەکێکە لە شیعرە هەرە باڵاکانی (هێمن) و بەم بەیتە دەست پێدەکات:

١٨٨- جەعفەر، مامۆستا:مێژووی بیری کوردی، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هوشیاری (ی.ن.ك)چاپی یەکەم، سلێمانی٢٠٠٩، ل٢٠. (بە هەندێ دەستکاریی زۆر کەمەوە).

**ســــــــاقیا! وا بادەوە، وا بادەوە**
**روو لەلای من کە، بە جامی بادەوە**[189]

*   *   *

(هێمن) لە (نالّەی جودایی)دا، جگەلەوەی هەمان کێش (وەزن)ی شـیعری (نـەی = شمشاڵ)ی مەولەوی  رۆمی و پرنسیبەکانی شیعری دوو بەیتی (**مپنوی**) پـەیڕەوکردووە و بە هەمان کەش و هەوای دەردی جودایی، داد و گازەندە لە دەسـت لێـك هـەڵبڕان و نالّە و هاواری گەرم و بە کوڵ، بۆ دابڕان لە ژیانی ئازادی و بێزاریـی لـە ژێـر دەسـتیی خۆی و گەلەکەی دەکات، لە هەمان کاتدا  لەلایەکەوە لە چەند جێگەیەکـدا ئامـاژەی راستەوخۆی بە شیعرە بەناوبانگەکەی (**نەی ـــ مەولەوی رۆمی**) کردووە:

**جا کە سەرخۆش بووم، بە دەنگێکی نەوی**
**بۆت دەڵێم ئەو شیعرە بەرزەی مەولــەوی**[190]

*   *   *

**بۆیە نالّەم تێکەڵی (نەی) کـــــردووە**
**شێوەنێکم پێیە، (نەی) نەیکـــــردووە**[191]

*   *   *

١٨٩- بارگەی یاران ـــ سەرجەمی شیعری هێمن، بەرگی یەکەم، چاپەمەنی ئاراس، چاپی دووەم، هەولێر(٢٠٠٦)، لاپەڕە (١٩٥ ـــ ٢٠٤).

١٩٠- هەمان سەرچاوە، ل١٩٩.

١٩١- هەمان سەرچاوە، ل٢٠٠.

لە هەمان کاتدا چەند بەیت و نیوە بەیتە شیعری (شمشماڵ ـــــ ی مەولەوی ڕۆمی)یشی، وەك ئەم نموونانە، لە جەستەی شیعرەکەی خۆیدا گونجاندوون:

**١. تا نه افتادم ز پا دستم بگیر**

(واتە: تا لە پێ نەکەوتووم، دەستم بگرە)

**٢. بشنو از نی چون حکایت میکند**
**از جدائیها شکایت میکند**

**٣. هرکسی کو دور ماند از اصل خویش**
**باز جوید روزگار وصل خویش**

(واتە: هەر کەسێ لە زێدی خۆی هەڵکەندرێ، داوای گەڕانەوەی بۆ زێدەکەی خۆی، لە ڕۆژگار دەکات)

# مەحوی

## میراتگری پەیام و هەڵوێستی جوامێرانەی مەولانا خالید

ئەگەر داگیرکردنی میرنشینگەلە نیمچە سەربەخۆکانی کورد ـ ی قەڵەمڕەوی عوسمانی، لە کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا، شەقڵێکی بێزاریی و تووڕەبوونی بە شیعری نالی و سالم بەخشیبێ، ئەوا ئەم بێزاری و تووڕەبوونە، لە سەرەتای نیوەی دووەم و دواتری هەمان سەدەدا، بەشێوەیەکی جیاواز و هەڵکشاوتر و تا ئاستی یاخیبوون، بەمیراتیی بۆ شاعیرانی وەك: مەحوی (١٨٣٢ ـ ١٩٠٦)، حاجی قادری کۆیی (١٨٣٥ ـ ١٨٩٧)و شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٣٧ ـ ١٩١٠)، بەجێدەهێڵێ.. کە ئەگەر ئەم هۆیە (هۆی داگیرکردن و لەناوبردنی میرنشینەکانی کورد)، شێوازێکی نیمچە یەکسان و لەیەکچووی بەکەش و هەوای شیعری نالی و سالم دابێ" بەڵام شەقڵێکی سەرومڕ جیاواز و لەیەك نەچووی بەشیعری مەحوی و حاجی قادر و شێخ ڕەزا بەخشیوە" کە هەر تەنیا و تەنیا هۆیەکانی داگیرکردنەکە، رایەڵی هاوبەش و ناوکۆیی ئەم سێ شاعیرەی دواییە و لەم بوارەشدا هەریەکەیان لە چەندان بۆنەدا، شیعری حەسرەتئامێزیان بۆ لە دەستدانی ئەو میرنشینانە بەگشتی و میرنشینی بابان بەتایبەتی هەیە (کەتیایدا چاویان هەڵهێناوە).. ئەگینا جگەلەوەی بناوان و داروپەردوو، واتە: ستراکچەری شیعریی هەریەکە لەم سێ شاعیرە، تایبەتمەندیی و بۆن و بەرامە و دەنگ و رەنگ جیاواز و ڕوانگەی سەربەخۆیان هەیە. لەهەمان کاتیشدا میراتیی و هەوێنی تووڕەیی و یاخیبوونی شیعری مەحوی، دەگەڕێتەوە بۆ هۆی تر و بۆ سەردەمی تری پێش داگیرکردنی میرنشینەکانی کورد، کە سەردەمی سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی بانگەواز و پەیامی مەولانا خالید (**١٧٧٩ ـــ ١٨٢٧**)ی شارەزوورییە، لەدوو

توێی تەریقەتی نەقشبەندیدا و مێژووی ئەم تەریقەتەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند سەدەیەکی زۆر دێرینەتری پێش سەرهەڵدانی مەولانا خالید و وەك بەڵگەگەلی مێژوویی، پێمان دەڵێن لە پێش پێکهینانی دەوڵەتی سەفەوییەوە (١٥٠١)، پەلوپۆی لە کوردستاندا زۆر بڵاوبووبێتەوە و لە هەندێ قۆناغیشدا، رووناکبیرانی کورد لە ڕابەرە درەوشاوەکانی ئەم تەریقەتە بوون، وەك نموونەی (شێخ عەلی کوردی ـ ئامێدی)، کە لە سەرەتای پێکهاتنی دەوڵەتی سەفەویدا لە دەوروبەری قەزوین، وەك مریدێکی چالاکی عوبەیدوڵلای ئەحرار (؟ ـ ١٤٩٠ز) رابەرایەتیی ئەم تەریقەتەی کردووە و نەیارێکی نەترسی دژی سەفەوییەکان بووە و هەر ئەوانیش لە کاتی هێرشی ڕەشەکوژیانەیاندا، بۆ سەر سوننی و نەیارەکانیان، گرتوویانە و کوشتوویانە و ئەم کاری رەشەکوژییەی سوننیش، زەنگی قەڵاچۆکردنی مەزهەبی سوننی بووە لە باکوور و خۆرئاوای ئێراندا، کە لەم شاڵاوەدا، تەریقەتی نەقشبەندی، هاوهەڵوێستێکی دڵسۆز و پتەوی مەزهەبی سوننی بوو لە دژی سەفەویەکان و هەر ئەم هۆیەش، خودی تەریقەتی نەقشبەندی خستە بەر شاڵاوی راستەوخۆی سەفەوییەکان و جێگەی لە مەڵبەندە دێرینەکانیاندا پێ لێژکردن و ناچاری کردن مەڵبەندەکانیان بەرەودوا بۆ تەوریز و ورمێ بگوێزنەوە و لە ورمێشەوە بە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا بڵاوبێتەوە و لە ئاکامدا بەو هۆیەوە کە سوڵتانەکانی عوسمانی، سوننی مەزهەب بوون و شەڕی بەردەوامی سەفەوییان کردووە، شاری ئەستەموولّ و هەندێ قەڵەمڕەوی عوسمانی بکەنە داڵدە و مەڵبەندی چالاکی و دواتریش لە زۆر جێگەی ئاسیای ناوەڕاست و هیندستاندا بڵاوببنەوە و چالاکییان تێدا بنوێنن، کە دوای چەند قۆناغ و ئاڵوگۆڕێکی فیکریی بەردەوام بەسەر ئەم تەریقەتەدا، یەکێك لە شێوازە سەرەکییەکانی ئەم گۆڕانکارییانە، لە هیندستان، لەسەردەستی شێخ ئەحمەدی سەرهیندی (**١٥٦٣ ـ ١٦٤٢ز**)، ناسراو بە (**المجدد**)دا، شەقڵ بگرێ و پەلوپۆی تری بۆ (مەککە) و شوێنانی تر، بڵاوببێتەوە.

ئەم شەقڵە (**مجدد**)ەی لەسەر دەستی ئەم ڕابەرەدا گەڵاڵە بوو، ئایدیۆلۆژیایەکی جیاواز و خوێنێکی تازەی بە بەر ئەم تەریقەدا کردەوە و ئەو تێوری (و**حدة** الوجود)ەش، کە پێشتر ئەم تەریقەتەی پێدەناسرا، کردییە (و**حدة** الشهود) و

بەمەش پێچەوانەی بیروباوەڕەکانی محێدینی عـەرەبی (١١٦٥ ـ ١٢٤٠ز) بـووەوە، کە لە دەمێکەوە ئەم ڕێبـازەی بـە چەقبەسـتوویی هێشـتبۆوە و لەهـەمان کاتـدا بەرەنگاری ئـەو تەقەللایانـەش بـووەوە، کـە دەیانویسـت لـە ڕێگـەی تەریقـەتی نەقشبەندییەوە، سەروپێوەندی ئایینی ئیسلام، لەگەڵ ئایینەکانی تردا گرێ بدەن.

هەر ئەم رابـەرە پێـی وابـوو بـۆ کارکردنـە سـەر بیروبـاوەڕی دەسـەڵاتداران و فـەرمانڕەوایان و ڕێنـوێنی و ئامۆژگـاریی و رازیکردنیـان، بـۆ چـاکە و خزمـەتی خەڵك، پرد و دیالۆگێك لەگەڵیاندا دابمەزرێنێ و لەم پێناوەشدا نامەیەکی زۆری بۆ ئەو فەرمانڕەوا مەغۆلانە ناردووە کە لەو کاتەدا حوکمی هیندسـتانیان کـردووە و لەئاکامدا بە باری سەرنجی خۆی، قایلی کردوون و بەم هۆیەوە لەسەردەمی ئەمدا، ئەم تەریقەتە، ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچـاوی بەخۆیـەوە دیـوە و بـەرەو گەشـانەوە و کامڵبوون و ڕەگ داکوتان و خۆڕزگارکردن لە سێبەر و جێپەنجەی ڕێبازەکـانی تـر، هـەنگاوی هـەڵگرتووە و بـەردەوام جـەماوەری زۆرتـری لێ ئـاڵاوە، کـە داوتـر لەسەردەمی (شاغوڵام عەلی)، ناسراو بـە شـێخ عەبـدوڵلای دەهلـەوی (١٧٤٥ ـ ١٨٢٤ز)دا، خانەقاکەی لە هیندستان بۆتە مەڵبەنـدێکی درەوشـاوە و بەهـەزاران ئەویندار، لە وڵاتانی ئاسیا و ئەفەریقاوە زیارەتیان کردووە، کـە مـەولانا خالیـدی شارەزووری، یەکێك بووە لەو ئەویندارانەی لە سـاڵی (١٨٠٩)دا، بـۆ مـاوەی دوو ساڵ بۆتە شاگردی و ئیجازەی تەریقەتی تازەی نەقشبەندی (المجدد)ی لێ وەرگرتووە و ساڵ (١٨١١ز) بۆ کوردستان گەڕاوەتەوە.

بەڵام مەولانا خالید بـەر لـەوەی لـە کوردسـتانەوە بچـێتە هیندسـتان و دوای ئەوەش بۆی گەڕاوەتەوە، کوردستان بەگشتی و قەڵەمڕەوی بابان و پایتەختەکـەیان (سلێمانی) بە تایبەتی، لەوپەڕی پشێوی و داپـژان و دواکەوتوویـیدا بـوو، چـونکە چەندین سەدەی شەڕی شیعە و سوننی نێوان هەردوو دەوڵەتی قاجاری و عوسمانی و شـەڕی ئـەم دووانـەش لەگـەڵ دەوڵـەتی ڕووس لـە لایـەك و شـەڕی خوێنـاوی و بەردەوامی میرنشینەکانی بابان، سۆران و ئەردەڵان و ئاژاوە و نـاکۆکی نەپسـاوەی نێوان ئەندامانی بنەماڵەی فەرمانڕەوایی بابان لەسەر دەسەڵات، لە لایەکی ترەوە، ببوونە مایەی تێکدانی باری ژیانی کۆمەڵایـەتی و داتـەپینی ئـابووری و بـارێکی گران بەسەر ئەستۆی جەماوەرەوە، خەڵکەکەی بە جۆرێك وەڕس و بێـزار و شـپرزە

کردبوو، کە بەدوای دەرەتان و چارەسەرێکدا دەگەڕان.. بۆیە هەر کە مەولانا خالید گەڕایەوە و بانگەوازی بۆ ڕێبازە تازەکەی بەناو خەڵکدا بڵاوکردەوە، خەڵکەکە وەك بانگەوازێکی ڕزگارکەر بە پیرییەوە چوون و پێشوازییان لێ کرد“ بەتایبەتیش چینی جووتیاران و توێژی بازاڕیی، کە شەڕ و شۆڕی خوێناوی و بەردەوامی ناوچەکە، ژیانی لێ شێواندبوون و زیانی لەبەرژەوەندییەکانیان دەدا.

لەبەرئەوە لە ماوەیەکی زۆر کورت و چاوەڕواننەکراودا، بە هەزاران کەس، شەپۆل شەپۆل لەهەموو لایەکی کوردستانەوە، لە دەوری ڕێبازەکەی مەولانا خالید ئاڵان.

بەڵام سەرباری ئەو هەموو شەڕ و ململانێ و ناکۆکییەی پێشتر باسمان کردن و لەناوچەکەدا بوون، مێملێکی سەرسەخت و بەربەستێکی تری پتەوی بەردەم تەریقەتی نەقشبەندی، کە پێشتر لە ناوچەکەدا بوو، تەریقەتی (قادری) بوو. ئەم تەریقەتەش زانای گەورە و ناودار: شێخ مارفی نۆدێ (١٧٥٣ ـ ١٨٣٨) رابەرایەتی دەکرد و بەو هۆیەشەوە کە ئەم تەریقەتە لە دێر زەمانەوە، رەگوڕیشەی لە هەرێمەکەدا بووە و لەگەڵ سەران و کاربەدەستانی بابانی و عوسمانیدا، سەروپێوەندیی بەهێزی هەبووە و هاوکاتیش گەڕانەوەی مەولانا خالید و بڵاوبوونەوەی خێرا و بەرفراوانی تەریقەتی نەقشبەندی، بە مەترسییەکی گەورە و راستەوخۆ، بۆ سەرخۆی زانیوە، بۆیە هەر زوو کەوتۆتە دوژمنایەتی و زمان لێدان و ڕاپۆرت نووسین لای میرانی بابان و سەرانی عوسمانی و تەنگ پێهەڵچنینی مەولانا خالید و هەڕەشە و تەقەللای تا رادەی تیرۆرکردنی... هەموو ئەمانەش بوونەتە هۆی ئەوەی تەریقەتی نەقشبەندی لەلایەن جەماوەری دژ بەو سیستەمەوە، وەك تاقانە ئەلتەرناتیڤ و هەڵوێستێکی دژ بە زوڵم و زۆرداریی وەربگیرێ... بە تایبەتیش کە مەولانا خالید هەر لەسەرەتای بڵاوکردنەوەی پەیامەکەیەوە، لە ڕێگەی (نووسین)ەوە بۆ سەرانی بابانی و عوسمانی و قاجاری و تەنانەت بۆ خودی شێخ مارفیش، کەوتۆتە سەرکۆنە و رەخنە لێگرتنی سیستەمە سەپاوەکە و هوشیار کردنەوەی سەرلەبەری خەڵك... کە بەم کارەی مەولانا خالید، بۆ یەکەمجار لە مێژووی گوتاری رووناکبیری کوردیدا، جووڵانەوەیەکی

(شـــاریی) و شارســـتانییانە، دیـــالۆگ و مشـــتومڕێکی فەرهـــەنگیی و نیشـــتیمانییانە، لـــەناو رووناـــکبیرانی ئـــەو رۆژگـــارەدا، دێنێتـــە ئـــاراوە و زەمینەیـــەکی بـــەپیت و بەبرِشـــت، بـــۆ هێنانـــە کایـــەی قۆنـــاغێکی نـــوێی رووناکبیریی دەرەخسێ، کە هەر لـەو سـەردەمەدا، گـەورەترین بزووتنـەوەی شیعریی، لەسەر دەستی نالی و سالم و هاورِێکانیان و گەشانەوەی دیـالیکتی (سلێمانی) سەرهەڵدەدا، کە تا ئێستا بەردەوامە و سەرەتاکانی دەگەڕێتـەوە بۆ ئەو رۆژگارەی مەولانا خالید، کە لە رێگـەی تەریقـەتی نەقشـبەندییەوە، باس و خواستی تازەی فەرهەنگیی دەورووژێنـێ و رەخنـەی تونـد و تیـژ لـە رابەرانی لە رێ لادەری ئاییـنی ئیسلام و فەرمانڕەوایانی ملهوڕ و سیستەمی گەندەڵبووی سیاسی دەگرێ... کە ئەگەر لە مێژووی بزووتنەوەگەلی ئـاییـنی ئیسـلامدا، نموونـەی وەك (ئاتـەئیزم ـ ئیلحـاد)، (سـۆفیزم) و (تـەئویلی) و رابەرانی تری وەك (سوهرەوەردی) و (ئـیبن رەوانـدی ـ ٨٢٥ ـ ٨٦٤)، لـەناو گوتـاری رووناـکبیریی عـەرەبی و ئێرانیـدا هـەبووبن، ئـەوا بزووتنـەوەی نەقشبەندی (المجدد)، کە مـەولانا خالیـد لـە کوردسـتاندا پیـادەی کـردووە، نموونەیەکی بەرجەستەی ئەو بزووتنەوانەیە، کە بە گیانی رەخنـەی ئـاییـنی و ریفۆرمخوازیی و واقیـع بینانـەی کۆمـەڵگـەی کوردسـتانەوە، بـۆ چارەسـەری کێشەکانی ئەو کۆمـەڵگایە، هەنگاوی هەڵگرتووە و لەم ڕوانگەیەشەوە بووە، کە ئەو کاتـەی مـەولانا خالیـد بـۆ خوێنـدن لـە هیندسـتان بـووە، شـیعری حەسرەتی دیدار و دیتنەوەی کوردستانی نووسیوە و دواتریش هەر ئەم روانگە نیشتیمانییە، بۆ شاعیرانی وەك نالی و سالم و هاورِێکانیان بۆتە سەرمەشق و چاولێکەری.

ئەگەرچی مەولانا خالیـد هـەر تـەنیا (٩) سـاڵ (١٨١١ ـ ١٨٢٠ز)ی پـڕ لـە ململانێ و رووبەڕووبوونەوە و دەستەویەخەبوونی ئەو واقیعە گەندەڵەی پـێ مـەودا دراو لەو (٩) ساڵەشدا، یەك دووجار رەنجاندیان و گوشاریان بۆ هێنا، تا پایتـەختی بابان (سلێمانی) بەجێ بهێڵێ، بەڵام لە مـاوەی ئـەو (٩) سـاڵەدا، ئـەو واقیعـەی بەجۆرێك هێنایە جووڵە و جۆش و خرۆش، کە پـەیام و بانگـەواز و لایـەنگرەکانی مەولانا خالید، وەك ئاگروپوشوو، بە ئاقاری مـەولانا خالیـدا، بـەرین و بـەرینتر

دەتەنێتــەوە. بەرادەیــەك كــە تــەنیا لــە تــازە شــارێكی وەك ئــەو ســەردەمەی (سلێمانی)دا و وەك كلۆدیوس جێمس ریچ (١٧٨٧ ـ ١٨٢١)، خۆی لەو ڕۆژانــەدا لەناو واقیعەكەدا بووە و دەیگێڕێتەوە، ئاماری مرید و لایــەنگرانی گەیشــتوونەتە (١٢) هــەزار و لــە دەرەوەی كوردستانیشــدا گەیشــتوونەتە (٢٠) هــەزار مریــد و (٣٤) خەلیفەی كورد و (٣٣) خەلیفەی سەر بەنەتەوەكانی تر، كە ئەم ئامــارە زۆر و جوگرافیا بەرینە، بۆ ئەو ماوە كورتەی مەولانا خالید بــۆ كوردســتان هاتۆتــەوە (١٨١١) و تــا كوردســتانی جێهێشــتووە (١٨٢٠)، جێــی ســەرنج و لێ ڕامــان و بەڵگەی ئەوەن، كە جەماوەر چەند لەو سیستەمەی ئەو ڕۆژگارە بێزارن و لەســەروو ئەمەشەوە توانای ئەم رابەرە ڕووناكبیرە دەردەخەن، كــە چــۆن لــەناو ئــەو واقیعــە گــەمارۆدراوەی بــەململانێ و بەگژداچــوونەوەی ســەرانی بابــانی و عوســمانی و تەریقەتی باڵادەستی (قادری)دا، توانیویێتی ئەو واقیعە سەركوت و بێدەنگ كراوە، بهێنێتــە دەنــگ و جووڵــە و ڕاپــەڕین و ئــەو بزووتنــەوە فیكــری و ڕووناكبیرییــە (شــاری)یە هەڵایســێنێ و لــەناو گوشــار و تــەنگ پێهەڵچــنینێكی بەردەوامــدا، مشتومڕ و ململانێیەكە بە خرۆشاوی بۆ دوای خۆی بــەجێ بهێڵــێ و بەیــەكجاریی كوردســتان بــەجێ بهێڵــێ" كــە خــودی بڕیــار و ســەرهەڵگرتن و جێهێشــتنەكەی كوردستانیشی، هەڵوێستێكی تری خوێندەوارانە و شــارییانەی مــەولانا خالیــدە و كاتێ دەبینێ ئاستی ململانێ و ڕووبەڕووبوونەوەكە، خەریكە بگاتــە بــەكارهێنانی زمانێكی تری جیا لە زمانی نووسین و مشتومڕ، كە زمــانی بــاوی چــەك و یــەكتر كوشتنە، ئەوسا بەو بڕیاری سەرهەڵگرتن و جێهێشتنەی كوردستانی، دەیســەلمێنێ كە ئەو بڕوای بەدیالۆگی (شاری)ی و شارستانییانە هەبووە.

مەولانا خالید لە دوای كۆچی كتوپڕی بۆ بەغدا (١٨٢٠) و دواییتر لــەوێوە بــۆ شام و مەرگی ناكاوی هەر لە ئاوارەییدا (١٨٢٧)، دوو كەس لە خەلیفەكانی، لــە هەموو ئەوانیتر چالاكتر و بەنفوزتر بوون و خانەقاكانیان بــوون بەناوەنــدی گرنگــی ئیرشــاد و رابەرایــەتی بڵاوكردنــەوەی تەریقــەت، كــە یەكــەمیان: شــێخ عوســمانی سیراجوددینی بیارە (١٧٨٠ ـ ١٨٦٦) و ئەویتریان شــێخ تــەهای شــەمزینی (؟ ـ ١٨٣٥) بوون، كە ئەگەرچی ناوەندی هەردوو خانەقاكــە، لــە دەرەوەی قەڵــەمڕەوی بابان، واتە: لــە دەرەوەی مشــتومڕ و ململانــێ بەردەوامەكــەی مــەولانا خالیــددا

بوون، بەڵام ئەمی دواییان بە هەمان گەرمایی و جۆشی ریفۆرمخوازانەی مەولانا خالیدەوە، درێژەی بە زیندوو راگرتنی بیروڕاکانی تەریقەتی (مجدد)دا و کەوتە سەرکۆنەی هەردوو سیستەمی حوکمی عوسمانی و قاجاری و لە ئاکامیشدا لە رۆژگاری شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری (١٨٣٠ ـ ١٨٨٣ز)دا، بۆ چاکترکردنی باری ژیانی خەڵك، راپەڕین و شۆڕشی بەربڵاویساڵی (١٨٨٠)ی لە دژی رژێمی قاجاری لێ کەوتەوە و دواتریش هەمان رێڕەو، لە شۆڕشەکانی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی و شێخ سەعیدی پیران و دواتری بەرزان دا بەردەوام بوون و باڵی دووەمیشیان، باڵی خانەقای بیارە و شێخانی هەورامان بوو، کە هەر ئەوەندەی لە مەڵبەند و جەرگەی ململانێ و مشتومڕەکە دوورکەوتەوە و لە نێوان سنووری هەردوو دەوڵەتی قاجاری و عوسمانی جێگیر بوو، ئیتر مۆرکە (رووناکبیری و ریفۆرمخوازی)یەکەی لە دەست داوە و مۆرکی فێرکردنی رۆتینی نوقسان جێی گرتەوە[١٩٢].. کە ئەم هەڵوێستەی ئەم خانەقایە، جێی سەرنج و وردبوونەوەیە، چونکە هەمان باڵی (مجدد)ی نەقشی، لەسەرتاسەری ناوچەکەدا، بەهەمان گیانی ریفۆرمخوازانەی راپەڕیو، لەگەڵ خەم و خۆزگەی خەڵکی ستەمدیدەدا بووە و لە دژی زوڵم و زۆرداریی راپەڕیوە، کە شۆڕشەکانی شێخ شامیلی داغستانی (١٧٩٧ ـ ١٨٧١) و (سۆفی ئیسلام)ی هیندی و (خواجە یوسفی قەشغەری) و (عەبدولقادری جەزائیری)، نموونەی بەرجەستەی پەیڕەوانی ئەم باڵە (مجدد)ەی تەریقەتی نەقشبەندین.

بەڵگەشمان لەسەر خۆ نەبان کردنی خانەقای بیارە، لە بەرامبەر پەیامی ریفۆرمخوازانەی تەریقەتی نەقشیدا، سەرخوارکردنەوەیەکی خێرا و راگوزارییە، لە جیهانی شیعریی لووتکەیەکی شیعریی ناو کەش و هەوا و تەمتومانی فیکری خانەقای بیارە، کە شیعری مەولەوی تاوەگۆزی یە (١٨٠٦ ـ ١٨٨٢).

شیعری مەولەوی تاوەگۆزی لەگەڵ ئەوەشدا کە بۆن و بەرامەی نیشتمان بەهەموو کەژ و کوێستان و گەرمیان و رووبار و قەڵبەز و سروە و درەخت و

---

١- هەڵکەوت حەکیم: **ابعاد ظهور الطريقة النقشبندية في كردستان ـ في اوائل القرن التاسع عشر ـ مجلة دراسات كردية ـ العدد (١) كانون الثاني ١٩٨٤ ـ ص ٥٥ ـ ٧٦.**

مرۆڤییەوە، بانگمان دەکەن و پێمان دەڵێن کە هەموو جوانییەکانی کردگار، وەك (کچە کوردێکی نازدار، بەبەرگ و پۆیلانەی تەواوەوە)[193] لە کوردستاندان" کەچی لەگەڵ ئەمانەشدا سەرجەمی شیعری مەولەوی، یادێك لە میرنشینی بابان ناکات، یادێك بۆ لە دەستدانی میرنشینی بابان، یادێك لە رووناکبیران و شاعیرانی پایتەختی بابان ناکات، کە لەو رۆژگارەدا درەوشاوەترین شاری فەرهەنگی کوردستان بووە. تەنانەت مەولەوی، کە چەندان جار لە هەورامانەوە، نامەی شیعریی بۆ بەغدا بۆ (مەحموود پاشای جاف) دەنووسێ، یان کە مەولەوی خۆی لە بەغدا بووە و لەوێوە نامەی شیعریی بۆ (ئەحمەد پریسی)ی بۆ بناری هەورامان دەنووسێ، بەسەر (سلێمانی) مەڵبەندی مەولانا خالیدی نەقشبەندیدا بازدەدا و لەناوهێنانی ئەو شار و شارۆچکە و جێگایانەشدا، کە لە دوو توێی شیعرەکانیدا بەلێشاو هەن، ناوی تاقە چیا و گوند و شارێکیش ناهێنێ، کە لە جوگرافیای میرنشینی بابان، واتە لە مەڵبەندی مەولانا خالیدان! لەمانەش سەیرتر، لەسەرتاسەری شیعری مەولەویدا، تاقە شیعرێك و تاقە بەیتێك، بەڵکو تاقە حەرفێکیش بەدی ناکەین، کە یادی لە مەولانا خالیدی کردبێت! لە کاتێکدا (مەحوی)، بە سۆزترین قەسیدەی بۆ ستایشی مەولانا خالید نووسیوە، کە ئەمە بەیتی یەکەمی سەرەتا و بەیتی دوابەشی ئەو قەسیدەیە:

**دڵم ئەمشەو نەخۆشی نیسبەتی چاوێکی بیمارە**<br>
**جگەر غەڵتانی خوێنی حەسرەتی کێوێکی خوونخوارە**<br>
**جەمالی رابیگەی، وا دڵ بەرە، بەختی خەواڵووشم**<br>
**بە ئومێدی تەماشایەك، هەمیشە چاوی بێدارە**[194]

---

٢- ئەوانەی ناو کەوانەکە قسەی شاعیری گەورە (گۆران)ن.

٣- دیوانی مەحوی، لێکدانەوەی و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەدی مەلا کەریم، چاپەمەنی کۆڕی زانیاری، بەغدا، ساڵی (١٩٧٧)، لاپەڕە (٤٦١، ٤٦٧).

خۆ ئەگەر ئەم ڕێباز گۆڕینـەی خانـەقای بیـارە و هاوتـەریب نـەبوونی لەگـەڵ پەیامی (مجدد)ی نەقشبەندی دا، ئاوڕدانەوە و لێکۆڵینـەوەی تایبـەتی بوێـت" کـە ئێرە جێی نییە، بەڵام خۆ جیاکردنـەوە و جیـاوازبوونی ڕوانگـە و کـەش و هـەوای شیعری مەولەوی، لەگەڵ ڕێبازی مەولانا خالید و شیعری قەڵەمڕەوی بابان، هـۆی ئەوەیە کە جیهانبینی مەولەوی و داروپەردووی شیعرەکانی لە سەرچاوە قووڵەکانی عیرفانی ئێرانی پاراو دەبێ و ئەم سەرچاوەیەش، تێکەڵەیەکی فرە ڕوانگەیی ئایینە کۆنەکانی ئێرانە، هەر لە بودایی و میتراییەوە، تا زەرتوشـت و ئیـزەدی و ئـەهلی هەق و ئیسلام، کە سەرباشقە بەرجەستەکانی ئەم شـیعرە، جەلالـەددینی ڕۆمـی، واتە: مـەولەوی ڕۆمـی (١٢٠٧ ـــــ ١٢٧٣ز)یـە و پـێش مەولـەوی تـاوەگۆزیش هەموو شاعیرانی دیالێکتی گۆران و مەلای جزیری و دواتریش وەفـایی مـەهابادی یەو کەمێکیش (بێخود)، هەر لەم سەرچاوەیەوە پاراو بوون.

ئەمە لە کاتێکدا کە شاعیرانی هاوڕۆژگاری مەولەوی تاوەگۆزی، وەك نـالی و سـالم و هاوڕێکانیان، کە لە ناوجەرگەی ململانێیەکەی هەردوو ڕێبازی (قادری) و (نەقشـی) و سەرهەڵگرتن و کۆچی مەولانا خالید، لە سلێمانی دا، سەریان هەڵدا، بێ ئەوەش کە هیچیان بە ئاشکرا سەر بە ڕێبازگەکەی مەولانا خالید بن، کەچی هەموویان میراتـی و هەوێنی بزووتنەوە و ململانێیەکەی مەولانا خالیـد گرتنیـەوە و تاڕادەیـەکیش تێـوەی گلان و بێ سڵەمینەوە، شیعریان لەو کەش و هەوا جەنجاڵ و خرۆشاوەدا چاوی هـەڵهێنا و ناسنامە و مۆرکی سەردەمەکەیان لە شیعرەکانیاندا هەڵگرت.

خـۆ ئەگـەر نـەبوونی سـەر و پێوەنـدیی مەولـەوی لەگـەڵ نـالی و سـالم و هاوڕێکانیاندا، بەگریمان و هۆی ئەوە دابنێین، کە نـالی و سـالم، سـەر بەتەریقـەتی نەقشبەندی نین، ئەی خۆ شاعیرێکی وەك (مەحوی)، کە خـۆی و باوکیشـی، نـەك هەر سەر بەتەریقەتی نەقشبەندین، بەڵکو هـەردووکیان بـەرودوا، خەلیفـەی شـێخ عوسمانی بیارە، واتە: خەلیفەی هەمان (پـیر)ی مەولـەوی ـ ن!، کەچـی مەولـەوی تاقە شیعر و تاقە حەرفیکی بـۆ (مـەحوی)ش نییـە!![195] بـەڵام (مـەحوی)، کـە

---

٤- بەڵام مەحوی شیعری بۆ مەرگی مەولەوی هەیە، کە ئەمە هەردوو بەیتی سەرەتا و کۆتـایی ئـەو شیعرەیە:

مەبەستی سەرەکی ئەم نووسینەی ئێمەیە و سەر بە شەپۆلە شیعرییەکەی دوای نالی و سالم و دوای رووخان و لەناوچوونی میرنشینی بابان و دوای ماوەیەکی درەنگتری کۆچی مەولانا خالید، لەگەڵ شاعیرانی هاوتەمەنی خۆی، وەك: (حاجی قادری کۆیی) و (شێخ رەزای تاڵەبانی) و... هتد دا سەرهەڵدەدات" ئەگەر چەندان ڕەگەزی شیعریی، لە شیعرەکانیدا جێی ئاوڕدانەوە و لێکۆڵینەوە بن، ئەوا بەرجەستەترین ڕەگەزی شیعری مەحوی، ڕەگەزی هەڵوێستە، کە سەرومڕی سیماکانی سەردەمی مەولانا خالید لە خۆیاندا کۆدەکەنەوە و بەهەموویان بنچینەی شیعرەکانی مەحوی پێکدێنن.

شیعری مەحوی بەرجەستەکردنی جوامێرانە و راستگۆیانەی ئەو واقیعەیە، کە مەولانا خالید خرۆشاندی و بە خرۆشاویی بۆ دوای خۆی جێهێشت و بەدوایشیدا داگیرکردنی دلڕەقانەی لەشکری عوسمانی بۆ سەر قەڵەمڕەوی بابان بەسەرداهات و جگە لە مەحوی، کەسی تر نەیتوانی وەك مەحوی، لەناوجەرگەی رووداوەکان و ڕووبەڕووبوونەوەدا بمێنێتەوە و بەرگەی ئەو هەموو تەنگ پێهەڵچنین و هەڕەشە و زەبر و زەنگ گوشار و گەمارۆ ڕۆحییە بگرێ، کە مەحوی لە بەرامبەریاندا سەنگەری شیعری لێگرتن و لەگەڵیاندا دەستەویەخە بووەوە... بەرادەیەك کە لە تێکڕای شیعری مەحوی و تەنانەت لە زۆرینەی بەیتە شیعرەکانیشیدا، هەست دەکەین: ها ئێستا نا، تاوێکی تر، چەند جەندرمەیەکی داگیرکەری عوسمانی، هەڵدەکوتنە سەر مەحوی و لێی دەنەون و بەدەست بەستراویی بۆ بەر سێدارەی دەبەن و مەحویش لە دەمێکەوە خۆی بۆ ئەم بەرسێدارە بردنە ئامادەکردووە...

---

دەوری هەر چاوێکی ئەمڕۆ داوە سەد فەوجی بەلا

دین و دڵ یەغما دەکەن، چاری کەن ئەی شێخ و مەلا

***

(مەحوی) ئەم شەو ئەو پەریی شێوەی لە خەو دیبێ، دەبێ

بۆیە ئەمڕۆ (مەولەوی) کەوتۆتە حاڵی حەلوەلا(*)

(*) دیوانی مەحوی لاپەڕە (٢٩).

چـونکه سـەرلەبەری شـیعری مـەحوی، شـیعری ڕەخنـەی توندوتیـژ و پـلار و توانج و لاقرتێ و دەمامك هەڵماڵینە، لەسەر ئـەو واقیعـەی، بـەدرۆ و دەلەسـە و فرت و فێڵ و چاو و ڕاو، جەماوەر دەچەوسێننەوە و ئـایینی ئیسـلامیش دەکەنـە سوپەر و چەتر!.

ئەو واقیعەی مەحوی سەرکەشانە دژی وەستاوەتەوە، ئەوەنـدە سـەخت و دژوار بووە، کە مەحوی بەتەنیا تیایدا ماوەتەوە و بـەرگریی کـردووە و وەك (نـالی) لـە قەسیدە جوانەکـەی: (قوربـانی تـۆزی ڕێگـەتم، ئـەی بـادی خـۆش مرور)ەکەیـدا پێناسەی دەکات: ئەگەر شاعیرێك دڵی لەبەرد نەبێت، ناتوانێ تیایدا بژی... بۆیـە کە نالی (دوای جێهێشتنی یەکجارەکی ئەو واقیعە، کاتێ لـە شـامەوە، نامـە بـۆ سالم)ی بەجێماوی ناو ئەو واقیعە پڕ ترس و بیمە دەنووسێ، پێی دەڵێ: ئەگەر دڵت لەبەرد نەبوایە، چۆن دەتتوانی بەرگەی ئەو هەموو دژوارییە بگریت؟.

## حاڵیی بکە بەخوفییە، کە ئەی یاری (سەنگ دڵ)
## نالی لە شـــــەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامی دوور[١٩٦]

کە هەر نالی خۆی، لە جێگەیەکی تری هەمان بەیتدا، ئاماژەیەکی سـەیر، بـە کەش و هەوا و زەبروزەنگ و دڕندایەتی سەردەمەکە دەکات و بەئەندازەیەك باسـی مەترسی و باڵی ڕەشی داگیرکەرانی عوسمانی دەکات، وەك ئەوەی سیخوڕیان لەسەر هەناسەدانی خەڵکیش دانابێت: (حاڵیی بکە بەخوفییە!)...

بەدوای نالی ـ شدا، شاعیرانی تری هاورۆژگاری مـەحوی و هاوتەمـەنی، وەك: حاجی قادری کۆیی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی و کـەیفی جـوانڕۆیی، هـەر زوو سـەری خۆیان هەڵگرت و لـە ئەسـتەمووڵدا گیرسـانەوە و هـەر لـە ئاوارەییشـدا سـەریان نایەوە. شێخ ڕەزاش لە نێوان سلێمانی و کەرکوك و بەغدا و کۆیە و سنە و بانە و ئەستەمووڵدا، گەڕیدەیەکی نەگیرساوەی بێ لانە و بێ داڵدە بوو.

---

٥- دیوانی نالی، لێکۆڵینەوەو لێکدانـەوەی مـەلا عەبدولکـەریم مـودەریس و فـاتح عەبدولکـەریم، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا ساڵی(١٩٧٦)، لاپەڕە (١٩٧).

کەچی مەحوی، بەهەمان گیانی ڕەخنەگرانەی مەولانا خالیدەوە، بەتەنیا و بێ پشتیوان، لە مەیدانێکی پڕترس و بیمی ڕووبەڕووبوونەوە، کە دەسەڵاتداران بەزەییان بەهیچ زیندەوەرێکی کوردستاندا نایەتەوە و (سالم) واتەنی: دەست لە دار و درەختی پیرۆزی سەرگۆڕی پیاوچاکانیش دەوەشێنن:

## زستانی ئەووەڵێن بوو، دڕا بەرگی (شێخ هەباس)
## ڕۆمیی ئەوەندە شوومن، لە شەخسیش دەخەن زەرەر[197]

و... ئا لەو داروبارەدا، مەحوی بەتین و تاوی بەرزی شیعرەوە، بێباکانە و نەترسانە، بەبێ ئەوەی بۆ ساتێکیش لە هەق بێژیی بکەوێت، گیانی خۆی ئامادەی مەرگ کردووە و تەشەری گرتۆتە ناهەق و داکۆکی لە هەق کردووە و لە خەم و خەونی مرۆڤ دواوە... لە کێشەی ڕۆژانەی مرۆڤ دواوە... هەڵوێستی شیعری جوامێرانەی بۆ دەستەبەرکردنی بەختەوەریی مرۆڤ نواندووە و ڕەخنەی توندوتیژی لە دەسەڵاتداران و ئەوانەش گرتووە، کە هاوکاری دەسەڵاتدارانی بێگانەیان کردووە و بەگژ زوڵم و زۆردا چووە. هەمیشە لەبەرەی هەق بێژیدا بووە و هەرگیز سازشی لەگەڵ دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایانی ڕۆژگاردا نەکردووە. تەنانەت ئەو شیعرەش کە بەبۆنەی سەرکەوتنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦ ـ ١٩٠٩ز)، بەسەر خەڵکی یۆناندا نووسیوێتی و پێخۆشحاڵیی خۆی پێ دەربڕیوە، دەبێ بەچاوی ئەو ڕۆژگارە سەیر بکرێ و لێك بدرێتەوە، کە بەڕای ئێمە، بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە:

١ ـ لەماوەی (٤٠٠) ساڵی ڕابردوودا و بەسۆنگەی شەڕەکانی نێوان سوننی و شیعەوە، دیدی ئایینی بەجۆرێك تێکەڵ دیدی سیاسی ببوو، هەڵوێستی سیاسی لەسەر دادەڕێژرا و لەمەشدا مەزهەبی سوننی، لایەنگریی لەدەوڵەتی عوسمانی و مەزهەبی شیعەش لایەنگریی لە دەوڵەتی قاجاری دەکرد. بەتایبەتیش وەك پێشتر

---

٦- دیوانی نالی، لاپەڕە (٢٠٠).

وتمان: لەکاتی شالاو بردنە سەر رابەرانی تەریقەتی نەقشی و لایەنگرەکانیاندا، لەلایەن شاهەکانی سەفەوی یەوە، رابەران و لایەنگرانی نەقشبەندی، ناچار دەبوون هاوهەڵوێستیی لەگەڵ سونییەکاندا بکەن و بەو هۆیەشەوە کە سوڵتانەکانی عوسمانی، سوننی بوون، بۆیە بەهەلیان دەزانی ئەم شالاوەی سەفەوی بقۆزنەوە و پشتیوانیی لە سوننی مەزهەب و مەزهەبە بەر شالاوەکەوتووەکانی سەفەوی بکەن.

٢ ـ ساڵی (١٨٧٨)، لەگەرمەی خۆ ئامادەکردنی گەلی کورد، بەرابەرایەتی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری و هاوتەریقەتی مەحوی، بۆ راپەڕین و شۆڕش، دژی ڕژێمی عوسمانی، کە تازە لەدوا جەنگی دۆڕاوی لەگەڵ رووس ببووەوە و بەو بۆنەیەشەوە کە گەلی ئەرمەن، لەو جەنگەدا، بە نهێنی و بەئاشکرا، پشتیوانییان لە سوپای رووس کردبوو" سوپای رووسیش بۆ پاداشتدانەوەی چاکەی ئەرمەن" لە کۆنگرەی ئاشتی: سان ستیڤانۆ (٣ مارتی ١٨٧٨) و دواتر لە پەیماننامەی بەرلین (١٣ تەمووزی ١٨٧٨)دا، مەرجی بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا سەپاند، کە دەبێ یاسای ئۆتۆنۆمی، بۆ ناوچە ئەرمەن نشینەکان پیادە بکات و لەمەشدا بەشێکی زۆری خاکی کوردستان، بەر ئەو یاسایە دەکەوت و دەوڵەتانی ئەوروپاش هەمان پشتیوانییان لە کێشەی ئەرمەن کرد، کە ئەگەر هۆشیاریی شێخ عوبەیدوڵلا و بەتەنگەوە هاتنی گیانی دۆستایەتی کورد و ئەرمەنی نەپاراستبایە، ئەم بڕیارەی رووسیا و دەوڵەتانی ئەوروپا، گەلی کورد و ئەرمەنی دەگلاندە شەڕێکی لابەلا و خوێناوییەوە" بۆیە مەحوی ئەم ڕووداوانەی بەوردیی سەرنج داوە و هەموو ژێرکەوتنێکی ئەوروپا و سەرکەوتنی سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی، بەسەریاندا پێ خۆش بووە... کە ڕووناکبیر و شاعیرێکی هەمان رۆژگاری وەك حاجی قادری کۆیی، کە لەو کاتەدا لە ئەستەمووڵ بووە و لە نزیکەوە ڕووداوەکانی سەرنج داوە، لەمەدا هەمان هەڵوێستی مەحوی هەبووە. لەبەرئەوە ئەم شیعرەی مەحوی، بۆ ئەم سەرکەوتنەی سوڵتانی عوسمانی، نابێتە مایەی داکۆکی لە دەسەلاتداران و فەرمانڕەوایان، بەڵکو شیعری ئەو رۆژگار و ڕووداوانەیە، کە مەحوی بەلای خۆیەوە، هەڵوێستی سیاسی لەسەر داڕشتوون.

بۆیە شیعری مەحوی، شیعری هەڵوێستی سیاسی و ڕەخنەی ڕووناکبیرانەی شاعیرێکی (شار)ە و لەو رۆژگار و سەردەمە بە زۆر داسەپاوانەدا، کە هەموو ئازادییەکی مرۆڤی تێدا پێشێل دەکرێ و لە هەموو زەمان و لە هەموو جێگەیەکیشدا، خەمی مرۆڤ دەلاوێنێ" کە ئەم پەیامەی مەحوی، جگەلەوەی درێژەی پەیامی بەپیتترین سەردەمی رووناکبیریی کوردییە، کە بانگەوازە ریفۆرمخوازەکەی مەولانا خالید[198] هەژاندی، لەهەمان کاتیشدا ئەزمونێکی دەگمەن و نموونەیەکی ناوازەیە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا، کە ئەگەر (حافزی شیرازی) و (خاقانی) و (عوبێدی زاکانی) لە ئەدەبی فارسی و (ئەبونەواس) و (ئەبو عەلای مەعەڕی)یش لە ئەدەبی عەرەبیدا، هەمان پەیام و هەڵوێستیان بۆ ئازادی مرۆڤ هەبووبێ، ئەوا پەیام و هەڵوێستی شیعریی مەحوی، لە هەڵوێست و پەیامی ئەوان کەمتر نەبووە.

---

٧- مەحوی بۆ زیاتر بەرجەستەکردن و ئاشکراکردنی هەڵوێستی خۆی، لە هەڵوێستی مەولانا خالید و بیروبۆچوونەکانی، قەسیدەی زۆر جوان و هونەریی لەم بوارەدا، بەناوی (ستایشی حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی) نووسیوە. (بۆ زیاتر ئاگاداری، بنوارە دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ل ٤٦١ ـ ٤٦٧).

(٥) سەرنج: ئەم نووسینە، بۆ ڤێستیڤاڵی مەحوی لە هەولێر، لە رۆژانی (٢١ ـ ٣٠ ئابی ٢٠٠١)دا ئامادەکرابوو.

# بەدواداچوونی وتارێکی

# مامۆستا تۆفیق وەهبی

هاوینی ساڵی (٢٠٠٨ز) خەریکی ئامادەکردنی کتێبێك بووم لە بارەی ئایینی (یەزیدی)یەوەو بۆ چنگخستنی سەرچاوەش بۆ ئەم کارەم، لە ناو دەیان و دەیان سەرچاوەی هەمەجۆردا، کەڵکێکی تایبەتی و جیاوازم لە بەشی یەکەمی سەرجەمی بەرهەمی (عەرەبی)ی زانای گەورە: مامۆستا (تۆفیق وەهبی) وەرگرت، کە بنکەی (ژین)ی هەمیشە چالاك و کارامە، لە ساڵی (٢٠٠٦ز)دا بەچاپیان گەیاندبوو. بەو هۆیەشەوە کە وەك تاقانە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندو رەهەند کوردانە، پشتم پێدەبەستو چەندانجار دەگەڕامەوە سەریو بەوردی بە وشەو ڕستەو پەرەگرافەکانیدا دەچوومەوە، بۆم دەرکەوت بەدەم ئەم کارەمەوە، زۆربەی هەڵە زۆرەکانی چاپو ناتەواوییەکانی تایپکردنەکەشم بەرچاو دەهاتنو بەچاکم زانی بۆ دەستنیشانکردنیان هێماو نیشانەیان لەسەر دابنێم و دواتریشو پاش دەستخۆشیکردنم لە برایانی بنکەی (ژین)، سەرنجەکانی خۆمیان لە بارەی ئەم هەڵە زۆرانەوە عەرزکردن، کە بەسنگێکی فراوانەوە لێمیان وەرگرتو داوایان لێکردم هەڵەچنی بەشی دووەمی سەرجەمی بەرهەمی (کوردی)ی مامۆستای ناوبراو، بەمن بسپێرنو پاشانیش هەر وایان کردو سەرلەبەری بەشی دووەمی نووسینی تایپکراویان بۆم ناردو منیش لەبەر دوو هۆ زۆر بەگرنگو بایەخ پێدانەوە، کاتێکی زۆرم بۆ بەوردی خوێندنەوەی تەرخانکرد:

١.هەلێکی هەڵکەوتو زێڕین بوو بۆ خۆم، تا زۆرینەی بەرهەمی نووسینی ئەم زانا گەورەیە، لە یەك کاتداو بەسەریەکەوە بخوێنمەوە، لە کاتێکدا کە پێشتر دوای

ماندووبوونێکی زۆرو پچڕپچڕ، دەستم بەبەشێکی ئەم گەنجینە شاراوەیە گەیشتبوو. بۆیە چێژو زانیارییەکی بەکەڵکی دامیّو هاوکاتیش بووە مایەی ئەوەی بەهرەو سەرمەشقی شاگردانە، لە شێواز توێژینەوەی خۆماڵییانەی ئەم نووسەرە فرە بەهرەیە وەربگرم.

٢. بۆ ئەوەی ئەم بەرهەمە بەپیتە وەك مەبەستو پەیامی مامۆستا (تۆفیق وەهبی) بەخوێنەران بگات، هەوڵم دا جگە لە هەڵەچنی، لەگەڵ هەندێ وشەدا، ڕێنووسی کوردیی ئێستا لەبەرچاو بگرمو لە زۆر شوێنی پێویستی ناو ڕستەکانیشدا، جارجارە (کاما) یان نوقتەیەك دابنێم، چونکە لە دارشتنی چاپی یەکەمی ئەم چەپکە نووسینانەدا، کە زۆرینەیان (٧٠-٨٠) ساڵ بەر لە ئێستاو پیتچنی (عەرەب) دایانڕشتوون، بۆ خوێندنەوەی ئێستا جۆرە هەڵوێستەو تەمومژێکی دروست دەکرد. لە هەندێ جێگەشدا ئەگەر پێویستی بەڕوونکردنەوەو سەرنجو پەراوێز هەبووبێ، وردە سەرنجو پەراوێزم بۆ کردوون، (وەك ڕاستکردنەوەی دێڕە شیعرێك، یان شتێکی لەو بابەتە)و کۆشاوم ئەو پەراوێزو سەرنجانە، زۆر کەم و کورت بن، بەڵام لەسەر بابەتێکیان، کە بەناوی (پیرەمەگروون)ەوە بوو، بەو هۆیەوە کە لەلایەکەوە: وتارەکە، بۆ خۆم چێژو زانیاریی زۆرم لێ وەرگرتو لەلایەکی تریشەوە: نەمدەتوانی بەبێ هەڵوێستە لەسەرکردنێکی ئارام بەلایدا تێپەڕم، بۆیە هەرچیم دەکرد سەرنجەکەم لەمەی ئێستا بۆ کورتترو چڕتر نەدەکرایەوە. لەبەرئەوە ناچاربووم لە شێوەی پەراوێزی دەرهاوێژمو بیکەمە ئەم ڕوونکردنەوەیەی، کە ناوی (بەدواداچوون)م لێناوەو پێم چاکە بەسەربەخۆو بۆ زیاتریش کەڵك گەیاندن بەخوێنەران، لەم وتارە بەنرخەی مامۆستا (وەهبی)، لە پێش (بەدواداچوون)ەکەی خۆم، وتارەکەی مامۆستای ناوبراو، بخەمە بەردەستو چاوی خوێنەران، ئەوسا ڕوونکردنەوەکەی خۆمی لەسەر دەردەبڕم.(١)

پیرەمەگروون (٢)

**تۆفیق وەهبی**

(ئەگەر لە ملەی تاسڵووجەوە هەڵبگەڕێین بەشاخەکەی نیوەڕۆی خۆرەڵاتیداو بچنە تەپڵەسەرێکی بەرزو ڕووبکەنە ڕۆژهەڵات، چاوتان ئەکەوێ بەکێوو شاخو دەشتاییێ کە سروشت بەهەموو تەڕدەستیی خۆیەوە ڕازاندوویەتیەوەو ڕەنگاوڕەنگی کردووە، بەگشت ئەو ڕەنگانە کە چاو ئەگەشێننەوەو فەرەحی ئەبەخشن بەدڵ، ئەوێ بەشێکە لە نیشتمانی کورد، کە شاعیرو ئەدیبە حەیرانەکانی، بە (کوردستانی) ڕەنگین ناوی ئەبەن.

لەبەرچاوتانا، لەوێ، دەشتاییێکی فراوان درێژ ئەبێتەوە لە شیمالی خۆراوەوە بۆ نیوەڕۆی خۆرەڵات، وە درێژایی خۆرەڵاتی ئەم دەشتاییە، کە ناوی (دەشتی سلێمانی)ی زۆر لێ دێ، ڕیزە دیوارێکی شاخ کشاوە موازی بەزنجیرە شاخەکەی بەرانان، کە ئەمیان دیواری خۆراوایی دەشتەکەیە.

وە ئەگەر وردتر بڕوانن، ڕاست ئاقاری خۆرەڵات لە پەراوێزی بناری شاخی گۆیژە کە یەکێکە لەو ڕیزە شاخانەی سنووری خۆرەڵاتی دەشتەکە، شارێ بەدی ئەکەن، ئەمە شاری سلێمانییە، ئەم شارەیە دڵە زیندووەکەی نیشتمانی کورد.

ئەو ڕێگایەی لە تەنیشتی چەمانەوە لە ملەی تاسڵووجەوە گلۆرئەبێتەوە بۆ دۆڵی تانجەرۆ، ئەکشێ بەناو دەشتاییێکی شەپۆلدەرا بەرەو خۆرەڵات بۆ سلێمانی، کە لە پاش پەڕینەوەی ئاوی قلیاسان، بەسەر پردە تازەکەیان، ئینجا ئەگاتە جێ. سلێمانی شارێکی تازەی کوردستانە (١١٩٩/١٧٨٤) یادگاری ئیبراهیم پاشای بابانە.

وە ئەگەر چاوبگێڕن بۆ لای دەستەچەپەوە، کێوێکی بڵندی تاقانەی بەدەماغتان بەرچاو ئەکەوێ کە هێشتا لووتی بەرزە بەو خەڕۆیی دێرینییەوە، خەڕۆیی ئەو ڕۆژگارەی کە خوایێ بوو هەرێمی سلێمانیو هاوسێکانی ئەپاراست بەشاخەکانیانەوە، دۆڵو ڕووبارو کانییەکانیانەوە، بەمرۆویانەوە، بەگیان لەبەرو کشتوکاڵیانەوە، وە ئاگاداریان بوو. ئەم کێوە بەسامە خۆشەویستە کێوی

(پیرەمەگروون)ی موقەدەسی دێرینییە، کە هێشتا ئەمڕۆش موقەدەسە لە شیعرو گۆرانیی کورددا.

کێوی پیرەمەگروون، ئەبێ وەکو هەموو کێوێکی مانەندی خۆی، لە دەوری بەرددا پەرسترابێ، قوربانی پێشکەش کرابێو سوێندی بەسەر خورا بێ، هەرچەند خوایەتییەکەی لە دەوری تاریخیدا لێی داکەنراوە، بەڵام موقەدەس تەماشاکراوە.

مادەکان لە سەدەی حەوتەمی پێش میلادەوە لە ڕۆژانی جەژنەیاندا، بەوێنە، لە جەژنی سەری ساڵیاندا، لە جەژنەکانی گەڕانەوەی بەهارو هاوینیاندا، لە جەژنی نۆبەرەی سەوزی پاڕانەوە بۆ باران لە پاییزدا، وە بۆ ڕزگاربوون لە بێ بارانیو نەبوونیو نەخۆشیی داگیرکەرو نەخۆشی تر، وە بۆ پاڕانەوە بۆ منداڵ بوون و نەمردن، وە بۆ پاڕانەوە بۆ دووربوون لە دوژمنی داگیرکەر، وە بۆ پیرۆزی بەسەر دوژمنا، سەر ئەکەوتنە تەوقە سەری پیرەمەگروونو قوربانیان پێشکەش ئەکرد، بەهەر گەورەی گشت خوایەکانیان (دیاوس پیتەر) واتا (باوە ئاسمان، خوا ئاسامان)، وە بە خوای نوورو پەیمانو سەرڕاستی، پارێزگاری وڵاتو دێهاتو کەشتگا، (میپرە)ی گەورە (میهر، کە لە پێشا بەخوای خورشید زانراوە)، وە بەبانوو خوا (الهه)،، ئەناهیتا، ناهیدو خوایەکانی تریان.

نەبوخوزنەسەر (بەختەنەسەر ٦٠٤-٥٦١ پێش میلاد)ی شای بابل، قولە عەجایەبەکەی بابلی لاسایی (لە ئاسایی) کێوی پیرەمەگروونی بەشکۆ، یان کێوێکی تری لووت بەرزی وەکو ئەوی، دروست کردووە بۆ دڵخۆشیی بانووشا (مەلیکە) خۆشەویستەکەی، (ئامیتیس)، کە دوێتەی شای ماد (ئەژی دەهاکە) بوو.

(ئامیتیس) ئەشێ بارەها سەر کەوتبێتە سەر ئەو کێوانە بۆ بەجێهێنانی پەرستشی خوای هەرە گەورەیان (دیاوس پیتەر) (باوە ئاسمان)و میپرە (میهر)و خوایەکانی تریان. خوای نوورو پەیمان و وەفاو سەرڕاستی بوو، بەتایبەتی خوای هەرە خۆشەویستیی مادەکان بوو.

لام وایە هەتا دوایی سەردەمی ساسانی پەرستگاییێکی ئاگربوو بێ لە چەشنی (چوارتاق)، لە تەپڵەسەری کێوی پیرەمەگروون، بێگومان لە زۆر دوورەوە دیاربووە. ئەشێ لەسەر کێوی (سەرسیر)یش چوارتاقێك بووبێ، کە ناوی بەدێیەکەی (چوارتا)وە ماوەتەوە.(٣)

بانوو خوا (الهه) ئەناهیتا لە سووڕی ساسانیدا (بانۆك ناو)، واتا (خانم ناو) یاد ئەکرا، ئەشێ کە پەرستشگاییێکی (بانۆك ناو٩ بووبێ لەسەرچاوەکەی پیرەمەگروون. سەرچاوەکە هەر خۆی بانووخوا (ئاناهیتا) بوو، ئەیانپەرست.

(ئەناهیتا) بانوو خوای سەرچاوەو ڕووبارو پیتو بەرەکەتی سەر زەوی‌و هی زاوزێ بوو. بوژاندنەوەی کانیەکان‌و زیادبوونی ئاو، تەجەلیی ئەو بوو، پیت‌و بەرەکەتی بەخش ئەکرد بەزەوی، وە مێردو منالّی ئەدا بەکانیەکان، وە بانوو خوای پیرۆزیش بوو.

لەوەی هەتا ئێستا بەیانمان کرد وا دەرئەکەوێ کە پیرەمەگروون دەمی خۆی پەرستراوە، دەمێ بۆتە پەرستشگا بۆ پەرستنی ئاسمان‌و ئاسمانیەکان‌و دەمێ بۆ ئاگر، ئاو، لە دەوری ئیسلامیدا بۆتە جێی مەرقەدی شەخس‌و پیر، کەوا ئێستا مەرقەدی پیرەمەگروونی لێیە. پیرەمەگروون کەوا دیارە، یەکێ بووبێ لە پیرەکانی ئسماعیلیی کۆن، مەرقەدەکەی لەبن قولەی کێوەکەدایە، ژنان ئەچنە سەری، قوربانی بۆ سەر ئەبرن، داوای زگ پڕبوونی لێ ئەکەن. ئەم شەخسە یەکێکە لەوانە کە حاجەتی ناومالّی، کە وەکو مەنجەلّ و کاسەو کەوچك‌و شتی تر بێ، بەنیاز بۆ ئەبرێ و لای دائەنرێ.

ئەشێ ئەسلّی ناوەکەی (پیرعەنبەر گودروون) (گوردووە) بووبێ. پار لەسەردانی دوایی پیرەمەگروونمدا، لە دێی (زێویە) پێیان وتم کە پیرەمەگروون یەکێکە لە ئەسحابەکان، دیارە ئەوان راست ئەکەن.

ئەو دێیە کە ئێستا ناوی (زێویە)یە، هەمیشە ئاوا بووە، وە جێگای ئاگرەوان، موگ‌و هێربەدەکان بووە کە پیاوی دینیی زەردەشتی بوون. (زێویە) بەپێی ناوەکەیەوە وا دیارە کە لە دەوری ئیسلامیشدا سەردەمێك ناوچەیێکی تەریقەتێ بووبێ، وە (زاویە) (تەکیە)یێکی لێ بووبێ.)

* * *

وەك سەرنجمان دا مامۆستا تۆفیق وەهبی لەم چەند لاپەڕە زۆر کەمەدا (کە لەبارەی دێرینەی چیای پیرەمەگروونەوەیە)، ئەو هەموو زانیارییە مێژووییە دەوڵەمەندەمان بەو خێراییە زۆر هوشیارو زیرەکانەیە بۆ بەسەر دەکاتەوەو دەمانباتەوە بۆ ئەو سەردەمانەی کە ئەم چیایەو ئاقارەکەی لە سەدان و هەزاران ساڵ لە پێشترەوە، مەڵبەندی ئایینی دانیشتووانی ناوچەکە بەگشتیو بەتایبەتیش لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی دەوڵەتی (ماد-سەدەی حەوتەمی پێش زایین)دا، مەڵبەندێکی ڕێبەرانی ئایینی (ماد) بووەو ڕێوڕەسمی ئایینییان تێدا ئەنجامداوەو لە تەکیشیدا کە دێتە سەر ناوی گوندی (زێویە)ی ناوجەرگەو ئامێزی چیاکە، بەهەمان شێوە لەم گوندەش دەدوێو ئەم گوندەش بەدێرینەی چیاکەوە دەبەستێتەوەو دەڵێ: (ئەم دێیە، کە ئێستا ناوی _زێویە-یە، هەمیشە ئاوابووەو جێگەی —ئاگرەوان-و-موگ-و-هیربەد-ەکان بووە، کە پیاوانی ئایینی زەرتوشتی بوون).. کەچی کە راڤەی وشەو ناوی گوندی (زێویە) دەکات، دەڵێ: وا دیارە لە سەردەمی (ئیسلامی)شدا، ناوچەیەکی تەریقەتیێ بووبێو (زاویە): تەکیە-یەکی لێ بووبێ!!. کە وەك دیارە مامۆستا وەهبی وشەی (زێویە)ی بە وشەی (زاویە)ی عەرەبی لێکداوەتەوە، بۆیە ناوی (زاویە) بۆ ڕۆژگاری ئیسلامی دەگێڕێتەوە!

بۆیە کاتێك بەپێو شوێنی بەسەرکردنەوەکەی مامۆستا (تۆفیق وەهبی)دا دەچینەوە، کە دەڵێ: گوندی زێویە، جێگەی ئاگرەوان-موگ-و- هیربە-ەکان بووە، بێ هیچ دوودڵییەك ئەمەی لەگەڵدا دەسەلمێنینو بۆ پشتیوانیکردنی ئەم بۆچوونەیشی، ئەوە بەیاد دێنینەوە، کە هەر لە سەرووتری ئەودیوی چیای پیرەمەگروونەوە ڕیزە چیایەکی تری بەرزو زۆر سەختو رەقەن بەناوی چیای (ژیلوان)ەوە هەیە، کە لەگەڵ زنجیرە چیایەکی تردا بەسەر گوندی (چۆخماخ)ی سەر بەدۆڵی (جافایەتی)دا دەروانن.

چیای (ژیلوان) هەر لە ناوەکەیەوە بیرمان بۆ ئەوە دەبات کە ئەم چیایە بەدرێژایی ساڵانێکی زۆر (ئەگەر نەڵێم چەند سەدەیەکیش) جێگەی (ئاگرەوان=ژیلەوان) بووە، چونکە تا ئێستاش شوێنەواری ئاگری گەورەو کورەی

گەورەی ئاگر بەسەر هەموو ڕووخساری ڕەشداگەڕاوی چیاکەو تاتەبەردە ڕەشەکانییەوە دیارەو دەریش دەکەوێ، کە لە ئاکامو بەهۆی ئەو تەمەنە درێژەی ئەو ئاگرەی لەسەرتاسەری ئەم چیایەو ئاقارەکەیدا هەبووە، شوێنەواری درەختو سەوزایی لێ نییە.

من لە دوو قۆناغی ژیانی پێشمەرگایەتیمدا (١٩٧٤-١٩٧٥) و (١٩٨٠-١٩٨٧) ڕۆژگارێکی زۆرم لە نزیك هەردوو چیای پیرەمەگروون و چیای (ژیلوان)دا، بەسەربردووە، بەتایبەتی سالآنی (١٩٨٦-١٩٨٧)، کە بەماڵەوە لەگوندی (مێولاکە)ی نزیك (چۆخماخ)ی دامێنی چیای (ژیلوان) بووین، زۆرجار هەستێکی قووڵی پڕ لە ڕامان پاڵی پێوە دەنام بەچیای (ژیلوان)دا هەڵگەڕێم و لە دیمەنی ڕەش و هەڵکەوتی سامناکی چیاکە وردببمەوە! سەیر لەمەدایە هەر لە تەنیشت چیای (ژیلوان)ەوە، چیایەکی تر بەناوی چیای (ئاسنگەران) هەیەو شێوەو هەڵکەوتی ئەم چیایەش وێکچووی چیای (ژیلوان)ە، وەك بەناوەکەی ئەمیشدا دیارە، ئەم چیایە تایبەت بووە بەپیشەگەرانی (ئاسن)، بۆ دروستکردنی کەرەسەو چەکی جەنگی، بۆ سەربازانو جەنگاوەرانی سوپایی سەردەمانی پێش هاتنی لەشکرو ئایینی ئیسلام بۆ ناوچەکە.

مێژووی (ناو)ی چیای (ژیلوان)، کە بێ هیچ سێ و دوویەك، گومان لە کوردی بوونی (ژیلوان=ژیلەوان) ناکرێ، دەبێ بۆ سەدان ساڵی بەر لە هاتنی دەسەلآتی عوسمانی بۆ ناوچەکە بێت، چونکە کە دەسەلآتی عوسمانی دەستیان بەسەر ناوچەکەدا پەیداکردووەو وەك ڕەوشتو نەریتی هەموو داگیرکارانێك، کە پێش هەموو شتێك ناوە دێرینو ڕەسەن و کۆنەکانی ناوچەکەیان بۆ زمانی خۆیان (تورکی) گۆڕیوە، هاتوون هەر بەپێودانی ناوی چیای (ژیلوان)، ناوی ئەو گوندەش، کە لە دامێنی چیای (ژیلوان)دایە، بە(چۆخماخ = چۆقماق = چەقماق) ناوناوە، کە هەر بەمانای ئاگرو ژیلەمۆ دێت(٤)..، بەلآم ئەم ناولێنانە (چۆخماخ)، تەمەن نزیکەی (٤٠٠-٥٠٠) ساڵەی عوسمانی، نەك هەر نەیتوانیوە ناوە دێرینەکەی چیای ژیلوان بسڕێتەوەو لەبیر خەڵکی بباتەوە، بەڵکو لە هەمانکاتدا ناوی (ژیلوان) نهێنییەکی دێرینەی زمانی کوردی ئاشکرا دەکات، کە کورد لە سەدان ساڵ پێشترەوە لە جیاتی وشەکانی (موبەد، ئاتوروان، ئاسوروان)ی پیڕەوانی ئایینی

زەرتوشتی، کە بەکوردی (ئاگرەوان) دەگرێتەوە، وشەی (ژیلوان) یان بەکارهێناوە. هەر لەم ڕەهەندەشەوە بیر بۆ ئەوە دەچێ، کە دوای هاتنی دەسەڵاتی ئیسلام بۆ کوردستانو بۆ ڕازیکردنی دەسەڵاتدارانی ئیسلام، لە ناوچەکەدا، لە بری وشەی (موبەد)و (ئاتوروان)، وشەی (ژیلوان)یان بەکارهێنابێ. هەر وەك چۆن لە وڵاتی ئێرانیشدا (سەردەمی ساسانی)، بۆ هەمان مەبەستی دڵنەواییکردنی فەرماندەکانی ئیسلام، لەبری وشەگەلی ئایینی زەرتوشتی وەك: ئیزەد، موگ، موبەد، وشەکانی: یەزدان، هیربەد و مەلەك (فریشتە) یان بەکاربرد.

دەگەڕێمەوە بۆ سەر ناوی (زێویە)و دەڵێم: مێژووی ناوی (زێویە)، لە مێژووی هاتنی ئیسلام کۆنترەو ئەگەر مامۆستا تۆفیق وەهبی لە گوندی (زێویە)ی لای چیای پیرەمەگروندا شوێنەواری ئایینی ئیسلامی دیبێ، ئەمە شتێکی ئاساییەو نەریتو ڕەوشتی هەموو ئاڵگۆڕێکی ڕۆژگارو لەناوچوونی دەسەڵاتی کۆن و پەیدابوونی دەسەڵاتدارانی تازەو ئایینی نوێ، ئاڵوگۆڕی هەمەلایەنەش بەدوای خۆیاندا دێنن، بۆ نموونە: دەسەڵاتدارانی تازە هاتوو، لە شوێن دەسەڵاتدارانی پێشوو دادەنرێن و ئایینی تازەش، جێگەی ئایینی کۆن دەگرێتەوە. لەم بوارەدا چەند نموونەیەك بۆ بیرخستنەوە بەیاد دێنینەوە:

خشایارشا (٥٦٥-٤٨٥پ. ز)ی هەخامەنشی، کاتێ بڕوای بەئایینی (زەرتوش) هێنا، هێرشو لەشکرکێشیی کردە سەر پەرستگەو مەڵبەندەکانی ئایینی (موغ-موگ)ەکانی (ماد)و تێکیدانو داوای لەدانیشتوانی قەڵەمڕەوەکەی کرد لە شوێنو جێگەی ئەو پەرستگایانەی (موگ) پەرستگەی (زەرتوشی) دروست بکەنەوە.. یان کاتێ (هۆلاکۆ ١٢١٧-١٢٦٥ز) هێرشی بۆ سەر ئێران کردو داگیری کرد لە ناوجەرگەی هەندێ پەرستگەی زەرتوشتیدا، مزگەوتی دروستکرد، وەك لە ناو پەرستگەی گەورەو بەناوبانگی (ئازەر گشنسب=شیز)دا، مزگەوتی گەورەی بۆ خواپەرستیی پێڕەوانی ئایینی ئیسلام دروستکرد، بەڵام بەم کارە، ناوی دێرینەی پەرستگەی (ئازەرگشنسب) لەیاد نەچوو..کە لەم ڕووەوە دەیان و سەدان نموونەی لەمجۆرە هەن.. بۆیە بوونی شوێنەواری ئیسلامی لە گوندی (زێویە)دا مانای ئەوە ناگەیەنێ، کە بەهاتنی ئایینی ئیسلام بۆ دۆڵی جافایەتی، ناوی گوندی (زێویە)ش لە ناوچووبێ، هەروەك نموونەی چیای (ژیلوان)ی پێشتر باسکراو، کە وشەو ناوی

(چۆخماخ)ی تورکی نەیتوانی ناوە دێرینەکەی (ژیلوان) لەبیر خەڵکی ناوچەکە بباتەوە.. هەر لەبەر ئەمەشە بەدڵنیاییەوە دەڵێین: ناوی (زێویە) بە ناوی (زاویە)ی عەرەبییەوە نەهاتووە. بەڵگەشمان لەسەر ئەم پێداگرییەمان لەوێوە دێت، کە هەر لە کوردستاندا دەیان گوندو شوێنی تر بەهەمان ناوی (زێوێ، زێوکە، زێوە، زێویە)وە هەن، کە هەموویان لە ڕووی ناوەوە لە بنجدا یەکن‌و لە هەموو ئەم گوندانەشدا، هاوشێوەی گوندی (زێویە)ی لای چیای پیرەمەگروون، (مزگەوت)یان تێدایە، وەك ئەم مشتە نموونەیە:

-زێوێ-ی لای ڕاژان (ناوچەی مەرگەوەڕ).

-زێویە-و- زێوکە-ی لای شاری (شنۆ).

-زێویە-ی کۆنە لاجان (لای شاری خانێ).

-زێویە-ی سەر بەدێستانی (مەنکاریی)ی سەردەشت، کە بەسێوە لاسوورە بەناوبانگە.

-زێوە-و بەر زێوە-ی ناوچەی باڵەکایەتی.

-زێوە-و-دەرە زێوە-ی ناوچەی خۆشناوەتی.

-زێوێ-ی ناو شاری کەرکووك.

-زێوە مەڕ-ی ناوچەی قەرەداخ.

-زێوێ-ی شێخ پیرمووس (تەنیشت بامەڕنێ).

-زێوکە-ی سەر بەناحیەی نەهلێ (نەهلە)ی پارێزگەی مووسڵ.

-زێوە-ی سەر بەناحیەی نەهلێ- مووسڵ.

-زێوە-ی سەیدا، سەر بەناحیەی نێروەو ڕێکان.

-زێوێ-ی شکان سەر بەناحیەی نێوەو ڕێکان (قەزای ئامێدی).

-زێوکاشین-ی سەر بەقەزای ئامێدی.

-زێوکاژیری- سەر بەقەزای ئامێدی.

-زێوا-ی شەفیقێ- سەر بەقەزای دهۆك.

-زێوکا-ی سەر بەناحیەی نێروەو ڕێکان.

-زێوا-ی سەرێ، سەر بەناحیەی نێروەو ڕێکان.

-زێوە-ی سەر بەناحیەی دیانا.

-زێوکه-ی سەر بەناحیەی ناودەشت.
-زێوه-ی ناوچەی نزار له بارزان (سەر بەقەزای ئاکرێ).
-زێوەکه-ی کەندالآن (ناوچەی دۆسکی).
-زێوکا عەبوی (ناوچەی دۆسکی).
-زێوکه-ی محەمەد یاسین (ناوچەی دۆسکی).
-زێوه-ی سەر بەناحیەی زاوێته.
-زێوکێ-ی جیسك (سەر بەناحیەی گولی).
-زێوکا-ی سندیای (سەر بەناحیەی گولی).
-زێوه پیرامیس-ی سەر بەناحیەی سەرسەنگ.
-زێوه-ی سەر بەقەزای ڕانیه.
-زێویه-ی سەر بەقەزای شارباژێر.
-زێوه-ی سەر بەدێستانی دۆڵ.
-زێوه-ی سەر بەدێستانی گەورك-نەڵێن.
-زێوه-ی سەر بەدێستانی مڵکاوی.
-زێوه-ی سەر بەدێستانی مەنگوڕی خۆرهەڵات.
-زێوێ-ی سەر بەدێستانی (ئیل تیمور)ی بەشی ناوخۆی مەهاباد.
-زێوەگەوره-ی سەر بەدێستانی (سوگمان ئاوا)ی دەوروبەری شاری (خۆی).
-زێوه-ی سەر بەدێستانی (فارسینجی)ی سەر بە(ئەسەدئاوا)ی پارێزگەی هەمەدان.
-زێویه-ی سەر بە دێستانی (بیلەوەر)ی بەشی (کامیاران)ی سەر بە پارێزگەی _سنه —کوردستان).
-زێویه—ی سەر بە دێستانی (ئیسفەندئاوا) ی سەر بە شاری (قوروه)ی پارێزگەی (سنه-کوردستان).
-زێویه-ی سەر بە دێستانی ژاوەرۆری هەورامانی تەخت.
-زێویه—ی سەر بە دێستانی (نەمەشیر)ی شاری (بانه).
-زێویه—ی سەر بە دێستانی (گوڵ تەپه)ی ناوچەی فەیزوڵڵا بەگی — دەڤەری شاری (سەقز)(٥).

که له ناو ئەم لیستە ناوەدا و ئەوەی زۆرتر لە مەبەستەکەی ئێمەوە نزیکە، ئەم دواناوە، واتە: (زێویە)ی دەڤەری شاری سەقزە، لە خۆرهەڵاتی کوردستان، کە نزیکەی (٥٠ کیلۆمەتر) دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی سەقز و بە هەمان شێوەی ناوچەی دۆڵی جافایەتیش، شەقڵ و مۆرکی _گوڵ تەپە) ی تورکی، بەسەر ناوچەکەوەیە.

دانیشتوانی ئەم گوندە کوردن، کاریان کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنە، کەشوهەوای زۆزان و ساردە سێرە و جێگەیەکی ئاوێژە و بە بڕشتە. وەك هەر گوندێکی تر، قوتابخانە و مزگەوتی تێدایە. ساڵی (١٩٦٣) شوێنەوارناس و دێرینە زان، کۆڵیاریی و پشکنینیان تێدا کرد. دێرینە و شوێنەواری شارێکی کۆنی تێدا دۆزرایەوە و گەلێ شتومەکی تێدا چنگ کەوت، کە نیشانەی پێشکەوتنی هونەری و وردەکاری و پیشەیی و خوێندەواری بوون. ئەم گوندە لە بنەڕەتدا ناوی (زێبیە) بووە کە لەگەڵ ناوی ئێستایدا زۆر لە یەکەوە نزیکن و گوایە ئەم ناوانە، لەو بەردە نووسە مێژووییانەدا نووسراون، کە سارگۆنی دووەمی ئاشووری (٧٢٢-٧٠٥ پ.ز) و ناسراو بە (شروکین)ی ئیمپراتۆری ئاشووری، ئەم باسانەی لە ساڵی شەشەمی پاشایەتیی خۆیدا یاداشت کردووە و نووسیویە: (شاری ئیزیرتو) ی وێران کردو سووتاند و دووشاری تری (زێبیە) و (ئارمانیدیش) یشی داگیر کردووە، هەر ئەم (سارگۆن)ە دواتر لە بەردەنووسێکدا ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە، کە دوای داگیرکردن، ئەم دوو شارەی (زێبیە) و (ئارمانیدش)ەی سووتاندوون.

لە ئاکامی ئەو کۆڵیاری و پشکنینانەی لەم گوندەدا کران، گەلێ خشڵ و کەرەسەی زێڕینی تێدا دۆزرایەوە. هەندێ لەو شتانەی تێیدا دۆزرایەوە: سینەبەند و گەردنبەندێکی لە زێڕ دروستکراوی هەڵقەهەڵقەیی بوو. کە هەردووکیان بە وێنەی کەللەسەری جانەوەرانی وەکو: شێر، دێو، دەعبا و دڕندەی نەناسراوی ئەفسانەیی نەخشێنرابوون. هەروەها کالانی خەنجەر و نێزە و پەیکان و چەکی تری جەنگی. دیوارەکانی کە لە ژێر زەویدا دەرهێنراون، زۆر سەختن، پلیکانەی بەتاتەبەردی تاشراوی لووس و نەخشی سوورەوەکراوی قاڵب زل دروستکراون. هەندێ لە ژوورەکانی ئەم تەلار سازییەی، بە داری (سەروو) دارەڕا کراون، کە داری (سەروو-

سەوڵ)، ئێستا لەو دەڤەرانەدا نابینرێن. دیوارەکانی بە کاشی سوورەوەکراوی ڕەنگاوڕەنگ نەخشێنراون.

بە پێی لێکۆڵینەوەی دێرینەناسان، ئەم شتانە هەموو، پاشماوەی سەدەی نۆیەمی پێش زایینن. کە دەبێ لێرەدا لە یادمان بێ، لە سەردەمی نۆیەمی زاییندا، دەوڵەتی (مانا)، یان (ماندی) دەسەڵاتی بەسەر ئەم هەرێمانەدا هەبووە و یەکێك بووە لە دەستە دەوڵەتەکانی (زاگرۆس)، کە بەر لە ئیمپراتۆریەتی (ماد)، لای باشووری زەریاچەی (ورمێ)، فەرمانڕەوایەتی کردووە. بەم پێیە، شاری (زێویە = زێبیە) و ئەو شارانەی کە (سارگۆنی ئاشووری)، لەم هەرێمانەدا داگیری کردوون. لە شارەکانی دەوڵەتی مانا بوون .

**ئێستا ئیتر پرسیاریتر دێنە ئاراوە:**

١.ئاخۆ ئەو گوند و شوێنانەی ناویان (زێوێ، زێویە، زێوکە، زێوە) یە، شوێنەواری ناو قەڵەمڕەوەی هەمان شارستانێتی (مانا) ین!؟

٢.ئاخۆ ناوی (زێوێ، زێویە، زێوکە، زێوە) ناوی سەردەمانی پێش ئیمپراتۆریەتی (ماد) ن؟!

٣.ئاخۆ هیچ گوند و جێگەیەکیتر لە کوردستاندا، ئەوەندەی ناوی (زێوێ، زێویە، زێوکە، زێوە) بەم ژمارە زۆرە دووپات بوونەتەوە و هەن؟!

٤.ئاخۆ بنەما و ناوی (زێوێ، زێویە، زێوکە، زێوە) چی بێ و لە بنەڕەتدا چۆن بووبێ؟!

٥.ئاخۆ ناوی ئەم هەموو گوند و جێگایانەی ناویان (زێوێ، زێویە، زێوکە، زێوە)یە، لە وشە و ناوی (زاویە)ی عەرەبییەوە هاتوون؟.

## پەراوێزەکان:

١.نووسینەکەی مامۆستا (وەهبی) بەهەمان شێوازی نووسراوە، کە نیوسەدە لەمەوبەر، لەگۆڤاری (پێشکەوتن) ژمارە (٨)، ساڵی یەکەم، نیسانی ١٩٥٨، ل١-٤دا، بڵاوی کردۆتەوە.

٢.پێشکەوتن (گۆڤار)، ژمارە ٨، ساڵی یەکەم، نیسان ١٩٥٨، ل١-٤، بەقەڵەمی مامۆستا بڵاوکراوەتەوە.

٣.لە بارەی (سەرسیر)و (چوارتا)وە وتارێکم نووسیوە لەبەرەوە بڵاوی ئەکەمەوە، لە ساڵی ١٩٤٥دا لە سلێمانی بۆ یەکەم جار لێبوونەوەی ناوی (سەرسیر)م بڵاوکردبووەوە، وە وتوبووم کە لە (سەردسیر)ی فارسییەوە هاتووە، کە مانای (هاوینەهوار)ە.

٤.هەر لە شێوەی ئەم ناوە تورکییانەی عوسمانی، لە هەمان ناوچەدا، ناوی گوندی (یاخ سەمەر)و (قزلەر)و چەندان گوندی هاوسێی (چۆخماخ) هەن.

٥. بۆ بەسەر کردنەوەی ناوی (زێویێ، زێویە، زێوکە، زێوە) سەیری ئەم سەرچاوانەش کراون:

١.فرهنگ دهخدا، جلد٩،ص ١٣١١٩.

ب.محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، وڵاتەکەت باشتر بناسە. چاپەمەنی ئاراس: ٢٠٠٥، هەولێر،ل. ٣١٠-٣١٣.

ج. د. غەفوور عەبدوڵڵا، گوندەکانی کوردستان، بەرگی: ١،٢،٣،٤، هەولێر، ٢٠٠٥

د. د. غەفوور عەبدوڵڵا، فەرهەنگی جوگرافیایی کوردستان، چاپەمەنی موکریانی، ٢٠٠٨، هەولێر.

# هەندێ ئاشنای نامۆ

-١-

هەندێ جار بەدەم نووسینەوە، بڕێ واژە و زاراوە، دێنە بەر نووکی قەڵـەم" کـە ئەگەرچی بنەڕەت و مەبەستی نووسینەکە، کاری بەو واژە و زاراوانـە نییـە" بـەڵام لەهەمان کاتیشدا بێ ئەوەی دەسـەڵات لەدەسـت خۆتـدا بێـت، لەنگـەرێك، یـان هەڵوێستەیەکی کـورتی کـەم خایـەن لـە ئاسـتیاندا دەگریـت و بـە دەمیشـییەوە پشوویەك دەدەیت. ئەوسا لەم دەرفەتی پشووەدا، بەچاوێکی ناسیاوانە، لـە سـەرو روخساری ئەو واژە و زاراوانە ورد دەبیتەوە و هانا بۆ بیرەوەریت دەبەیت، تا ناویان و مانایان و ناسیاویت لەگەڵیاندا بیر بکەیتەوە و بزانیت چۆن تێکەڵ کـاروانی ئـەو شەپۆلە واژە و زاراوە ئاشنا و ناسیاوە کەوتوون، کە رۆژانە هاوڕێیەتی قەڵەمەکەت دەکەن!

ئەم چەند واژە و زاراوەیەش" بڕێکن لەو نموونانە:

**بان؛ نەبان**

مامۆسـتا هـەژار موکریـانی لـە لاپـەڕە (٤٧)ی بـەرگی یەکـەمی (هەنبانـە بۆرینە)دا، لەبارەی واژەی ((بان))ەوە ئاوای نووسیوە:

١ ـ بان: بانگی نوێژ (مەلا بانی دا).

٢ ـ گازی: (بانی کە بابێ).

٣ ـ لای سەروو: (لە بان ئەو کێفە).

٤ ـ سەربانی خانوو.

٥ ـ بانو: زەمینی دەشت و بڵند: (بان هۆبەتوو، تاڵەبان).

٦ ـ هۆگر و خاوەن بەزەیی: (ئەو مانگایە لە گوێلکەکەی نەبان بووە).

٧ ـ بن، بوون.

دیسان هەر مامۆستا هەژار، لە لاپەڕە (٨٧٧)ی بەرگی دووەمی ((هەمبانە بۆرینە))دا، لەبارەی واژەی (نەبان)ەوە ئاوای نووسیوە:

١ ـ شیردەرێ کە بێچووی خۆی ناوێ و شیری ناداتێ.

٢ ـ کەسێ کە دەنگی لە یەکێ گۆڕیوە: (کاکم لێمان نەبانە و نامان دوێنێ).

٣ ـ بەدمیجاز، هەمیشە قەڵس و تووڕە.

بەڵام لە نێوان هەردوو واژەی (بان) و (نەبان)ی ئەم لێکدانەوەیەی مامۆستا (هەژار)دا، واژەیەکی هاوبەشی وەك (نەبان) دووبارە بۆتەوە، کە وەك وتمان: بەو مانایە دێت" کە شیردەرێك خۆی لە بێچووەکەی دەگۆڕێ، یان: نایەوێ و شیری ناداتێ. کەواتە مانای گشتی واژەی (نەبان) ئاوای لێ دێت: خۆ تێنەگەیاندن و رووپێنەدان و دووری لێگرتن و سەیر نەکردبێ" بۆیە لە فۆلکلۆردا وتراوە:

**تەحا لەو ریزە خاڵانە**

**بۆ من چاکن ئەو چاوانە**

**یاری خۆمە و لێم (نەبانە)**

واتە: یار دەشزانێ من یاری ئەوم" بەڵام رووی سۆز و بەزەیی لێ وەرگێڕاوم و رووم ناداتێ و بەچاوی جارانی بۆم ناڕوانێت، بۆیە دەشێ دوو کەسی ناسیاو، کەلە رێ و گوزەردا تووشی یەك دەبن، یەکێکیان بەهەر سۆنگەیەکەوە بووبێت، خۆی لەوی تریان بێئاگا و نەدیو دەکات، وەك ئەوەی خۆی وا نیشان بدات، کە گوایە نەیدیوە و چاوی بەسەیرکردنی شتێکی ترەوە خەریك کردووە، کە بەمە دەڵێین خۆی لێ (نەبان) کردووە.

ئەی باشە، ئەگەر پێشگری (نە)ی ئەم واژەی (بان)ە، بەو جۆرە بێنینەوە یاد" کە وەك دەزنین لە کوردیدا (نە) بچێتە پێش هەر واژەیەکەوە، دەبێتە پێچەوانەی ئەو شتە، وەك:

**چوون = نەچوون**

**خواردن = نەخواردن**

**خۆش = نەخۆش**

**خەوتن = نەخەوتن**

**بینین = نەبینین**

**بینا = نابینا**

ئەوسا واژەی (بان) دەبێتە پێچەوانەی (نەبان) و مانای (بان)یش دەبێتە: خۆتێگەیاندن و رووپێدان و سەیرکردن. بۆیە لەفۆلکلۆری کوردیدا واژەی (بان) بە مانای تێڕوانین و سەیرکردن و نزیکی کردنە:

**هەتا خۆم کوڕ بووم بە (بان)انەوە**
**کچگەل بە دوعا و بە پاڕانەوە**
**ئێستاکە پیر بووم، پێم دەڵێن خاڵۆ**
**بەرتیلیش دەدەم، نامبەنەماڵۆ**

واتە: هەتا لەتافی لاویدا بووم، کچانی زۆر، پەرۆشی ئەوە بوون روویان پێ بدەم و خۆمیان تێبگەیەنم و بیانلاوێنم و چاوبڕکێیان لەگەڵدا بکەم... کەلە مانا گشتییەکەی ئەم واژەیەوە، هەر سەیرکردن و بینینمان لا گەڵاڵە دەبێت، بۆیە دەبێ مانای واژەی (بان) هەر (بینین) بێت" کە مخابن هێشتا فەرهەنگگەلی کوردی بەمجۆرەی لەبارەوە لێك نەداوەتەوە.

**هەڕی لە بەڕی جیا ناکاتەوە**

ئەمە پەندێکی پێشینانی کوردییە، بەڵام لە (پەندی پێشینان)ە کەی مامۆستا ((شێخ محەمەدی خاڵ))دا نەهاتووە.

لە لاپەڕە (٩٦٥)ی بەرگی دووەمی ((هەنبانە بۆرینە))شدا، مانای واژەی (هەڕ) ئاوا لێکداوەتەوە.

١ ـ هەڕ: قور.
٢ ـ زیقە، گریانی منداڵ.
٣ ـ زەڕەی کەر، گوڕە.
٤ ـ خاك، خۆڵ.

بەڵام ((**هەڕ**)) و ((**هەرگ**)) لە دیالیکتی گۆران ـ دا بە مانای (**قوڕ**) و (**لیتە**) و (**خاکی تەڕ**) دێت. مەولەوی تاوەگۆزی، لەم چەند بەیتەدا ((**هەڕ**))ی بەمانای قوڕ و لیتە هێناوە:

**١ ـ گێچ زرێوار هەرسم مەوج وەردەن.**
**سارای مەریوان تەمام ((هەڕ)) کەردەن (ل: ٥٠٠).**
واتە: زرێباری فرمێسکم شەپۆلی داوەو دەشتی مەریوانی کردووە بە قوڕ.
**٢ ـ ها، کاوان کاوان، دڵ چون دڵڕێشان**
**((هەڕ)) دان وەسەردا، هەردان پەی وێشان (ل: ٥٢٣)**
واتە: بەرزاییەکان وەك دڵ برینداران، دڵیـان لـەت بـووە و چـیاکانیش قوڕیـان بەسەری خۆیاندا داوە.
**٣ ـ یاشێخ ((هەڕ)) گاوان مەیلەکەی لەیلێ**
**سەر بە سەر وەگیان هەرزانەن خەیلێ (ل: ٥٣)**
**واتە: یا شێخ؟** قوڕاوێك کە بەهۆی مەیلی لەیلێ ـ وە لە گیانی دڵـدار بپـڕژێ" ئەوەندە بە نرخە ئەگەر سەربەسەر، بە گیانی خۆی بیگۆڕێتەوە، هێشتا بە هەرزانی دەست کەوتووە.
کەواتە هەڕ، بەمانای قوڕ دێت.
بەڵام ((بەڕ)) واژەیەکی عەرەبییە و بەمانای زەمینی وشك دێت،بۆیـە هـەردوو واژەکە، بەدەستی ئەنقەست، بە پێچەوانەی یەکتر دانـراون، تـا مانـای دژ بەیـەك بدەن و مانا گشتییەکەی ببێتە: ((تەڕ و وشك))" کەلە بنەڕتدا پەندەکە بەرامبـەر ئەو کەسە گێل و نەشارەزایانە بەکار دەهێنین،کە ئاوەزیان بە جیاکردنەوەی: چاك و خراپ، دۆست و دوژمن و تەڕ و وشك ناشکێ، بۆیە دەڵێین: (هەڕ) لـە (بـەڕ) جیـا ناکاتەوە.
سەرنجێکی تر لەسەر ئەم پەندە" لێکدانی هەردوو واژەی (هەڕ) و (بەڕ)ی کـێش و قافیەدارە" کە نموونەی تری ئەمجۆرە واژە دژبەیەکانە، لە زاراوەی تری وەك (تەڕ و بڕ)دا دەبینین و من دڵنیام ئەم دوو واژەیەی ئەم زاراوەیەش لە بنەڕەتدا هەر (تەڕ)و (بەڕ)ی هەمان پێودانی پەندی (هەڕ) و (بەڕ) بـوون، کـە ئێسـتا لـەم زاراوەیـەدا بزوێنی (بەڕ)ەکە سواوە و بۆتە (بڕ) و زاراوەکەش بە گشتی مانای هێشـتا (تـەڕ) دەگەیەنێ" کە نابێ ماناکەی وابێت، بەڵکو دەبێت بە هەمان پێودانی پەندی (هەڕ ـ ی) لەبەڕ ـ ی جیا ناکاتەوە) سەیری بکرێت.

بۆ بیرهێنانەوەی خوێنەر و هەر لەم بوارەدا، زاراوەی (**حازر و بزر**)، (**بەزمەم ڕەزم**)*، هەڵبەز و دابەز) مان لە کوردی دا هەیە، کە بەپێودانی زاراوەی پێشوو، هەردوو واژەکەی ئەمانیش، دژبەیەکن و هاوکاتیش (کێش و قافیە) دارن، تا لەسەر زمان و لەکاتی بەکارهێناندا ئاسان و وەك جۆرە شیعرێکیش بن. هەر بۆیە لەم بوارەدا بیر بۆئەوە دەچێ، کەواژەکانی ئەمجۆرە نموونانە، هەروا بە رێکەوتێك نەچوونەتە پاڵ یەکتری، بەڵکو دەبێ زمانزان، یان فەرهەنگ نووسێك، کاری لەسەر کردبن و لەم نموونانەش زۆرتر بووبن، بەڵام ئێمە هەر ئەم چەند دانەیەمان سنگاوسنگ بۆ مابێتەوە.

## کونە مشکی لێکرد بە قەیسەری!،<br>یان<br>قەیسەریلێکرد بە کونە مشك!؟

ئەمیش پەندێکی دێرینەیە، تەمەنی لەگەڵ دروستکردنی (شار و بازاڕ و قەیسەری)دایە. داخەکەم لە (پەندی پێشینان)ەکەی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ـ دا نەهاتووە. تا ئێستا لە زۆر دەقی کوردیدا دەیبینم بە هەڵە بەکاری دێنن.

ئەگەر لە ڕووی واتاوە سەیری بکەین، هەست دەکەین بەو مانایە هاتووە، کە بەراورد لە نێوان دوو جێگەی وەك (قەیسەری) و (کونە مشك)دا دەکات... بێگومان دەشزنین جیاوازیی لەنێوان ئەم دوو جێگەیەدا، ئەوەندە زۆرە" جێی بەراورد نییە.

چونکە رووی دەمی پەندەکەش لە مرۆڤە" نەك لە مشك، ئەوا دەزانین کە مرۆڤ دەتوانێ لە بازاڕ و قەیسەریدا، بە پان و پۆڕیی بازاڕ و قەیسەرییەکەدا بسوڕێتەوە. بەڵام بەپێچچەوانەوە، مرۆڤ بەکونە مشکدا ناچێت. لەبەرئەوە مادام رووی دەمی پەندەکە هەر لەمرۆڤە (وەك وتمان)، ئەوا دەبێ ئەم مرۆڤە (لەوکاتەدا) ئەوەندە بەتەنگ هێنرابێت، کە مەودای هەنگاوهەڵهێنان و بزووتنی لەبەردەمدا

---

* بەزم و ڕەزم: شادی جەنگ، خۆشی و شەڕ و هەرا.

تەنگەبەر و تەسك و پڕ تەنگوچەڵەمە کرابێتەوە. واتە: ئەگەر لەبەر هەر هۆیەکی گوشاری وەك قەرزاریی، یان دوژمنکاریی، یان هەژاریی بێت“ ئەوا ئاسۆی بەر پێ و بەرچاوی، تاریك و تەنگ دەبێ و تروسکاییەك شك نابات، تا وردە وردە هەست دەکات توانای هەنگاو هەڵهێنان و پەلوپۆ هاویشتن و دەرەتانێك و دەستگرێکی نییە“ بەدەم ئەم تەنگانەیەیەوە بێت. بۆیە هەست دەکات تەنگی پێ هەڵدەچنرێ و دنیای لێ بچووك و بچووکتر دەبێتەوە“ لەم بارەدایە ئەم مرۆڤەی ناو ئەم تەنگەژەیە، ئەو شار و بازاڕ و قەیسەرییەی جارانی لێ تاریك و نووتەك و یەکجار تەنگەبەرە. بۆیە کاتێ کەسێك، کەسێکی تر بەتەنگ دێنێ“ دەڵێن: قەیسەری لێ کردۆتە کونە مشك. کە نموونەی تری ئەمجۆرە پەندەمان، بەم شێوانەی تریش هەن (هەرچەندە هیچیشیان لە ـ پەندی پێشینان ـ ەکەی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ـ دا نەهاتوون).

١ ـ دنیای لێکرد بە چەرمی چۆڵەکە: واتە ئەوەندەی گوشار بۆ بردووە و ئەوەندەی تەنگ پێهەڵچنیوە، ئەم سەر زەمینە بەرینەی لێ تەنگ و بچووك کردەوە“ بەئەندازەی چەرمە چۆڵەکەیەك.

٢ ـ سەری دنیا بەپووش نەگیراوە. واتە: ئەم ئاسمانە بێ سنوورەی تا چاو هەتەر دەکات، هەر ئاوەڵایە، کەچی کە یەکێك داد لە دەست تەنگژەیەك دەکات“ بەرامبەرەکەی دڵخۆشیی دەداتەوە و پێی دەڵێ: سەری دنیا بەپووش نەگیراوە. واتە: هێشتا ئومێد و ئاسۆی رووناك ماون.

لەبەر ئەمانە، شێوەی بەکارهێنانی: ((قەیسەری لێکرد بە کونە مشك)) راستترە، نەك پێچەوانەکەی.

**رەنجبەر، یان رەنجبار؟**

لە کوردەوایدا بەتایبەتیش لەناو گوندنشینەکاندا (رەنجبەر) بەو کەسە دەڵێن، کە بەرامبەر بە کرێیەکی دریاریکراو، کار بۆ کەسێکی تر دەکات، واتە: هەر نزیکە بە (کرێکار)ی ناو شارەکان، کە هەردوو وشەکە لە بنەڕەتدا لە دوو واژەی سەربەخۆ لێکدراون. چونکە واژەی (رەنج) بە تەنیا بەمانای تەقەللا و کۆششە و توانای خستنەکار و وزە بەخشین دەگەیەنێت، وەك چۆن (کرێکار) لە واژەی (کرێ + کار) پێکهاتووە" هەر بەو جۆرەش (رەنجبەر، یان رەنجبار)، لە (رەنج + بەر) و (رەنج + بار) پێکهاتووە.

بەڵام لە وشەی لێکدراوی (رەنج + بەر)، یان (رەنج + بار)دا، جۆرە تێکەڵاوی و گۆڕانکارییەکی زمانەوانیی بەسەردا هاتووە، کەوا پێدەچێ پاشگری (بەر)، یان (بار) لەبنەڕەتدا جۆرێکی تر بووبێت و بەپێی تەمەنی مێژووی دێرینەی ئەم واژەیە، لە کوردەواریدا (کە کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵ کار بوون) و لە دەمێکەوە بەسەر زاری زۆربەی جەماوەری خەڵکەکەیەوە واژەش وەك هەر پێویستییەکی تری ژیان، گۆڕانکاریی بەسەردا دێت، بەتایبەتی بەمەبەستی سفتوسۆڵ بوون و بێ گریوگۆڵ بوون، لەسەر زمان و خێرایی لە بەکارهێنانیشدا، کە خێرایی بەکارهێنانی واژەکە، لەسەر زمان، وای سواندووە، هەروەك چۆن ئێستا لەسەر زمان و گوێمانە" هەر بەو جۆرەش بەکاری بهێنینەوە.

بەڵام بە بەراورد لەگەڵ دەستەواژە هاویاساکانی ترماندا، کە هەمان گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە، بۆمان دەردەکەوێ، کە واژەی لێکدراوی (رەنجبەر) لە سەرەتادا (رەنج + بار)، واتە: (رەنجبار) بووبێ" چونکە:

١ ـ نالی دەڵێ:

**ئاوی سوێری چاو و (بار)ی تاڵی لێو**
**سوێر و تاڵیی، دەم دەدەم و ژەم ژەم دەخۆم**

* * *

واتە: قورساییەکی گران لەسەر لێومە، کە بەددان لێی دەکەمــەوە و دەیخــۆم... بۆیــە لەســەر هــەمان پێــودان دەوتــرێ: (فلانــە کــەس، لــەش بــە بــارە)“ واتــە: بارستاییەکی قورس لەسەر لەشێتی، ئیتر ئــەو بارســتاییە، نەخۆشــیی بێــت، یــان ئەرکی سەختی ژیان...

یان دەوترێ: (فلانە کەس، هیچــی لــەباردا نییــە، واتــە: دەســتە چــاپە و بــێ دەسەلات و بێ خێر.

یان دەوترێ: (فلانە کــەس، نالــەبارە)، واتــە: نایەتــە ژێــر بــاری ئــەو ئــەرك و فەرمانەوە“ کە پێویستە بیکات.

یان دەوترێ: (فلانە ئافرەت منداڵ بارە)، واتە: منداڵی لــە ئەســتۆیە و ئــەرکی سەرشانی قورسە.

کەواتە پوختەی مانای (بار)، لەو نموونانەدا“ بەمانای گرتنــە ئەســتۆ و هاتنــە ئەستۆی ئەرك و فەرمان و قورساییەك، کــە هەنــدێ جــار مرۆڤەکــە، خــۆی بــەپیر گرتنە ئەستۆی ئەو (بار)ەوە دەچێت، وەك نموونەی (رەنجبار)ەکە و هەنــدێ جــاریش دیاردەکانی تری ژیان، وەك هەژاریی و نەخوێنــدەواریی و نەخۆشــیی و کارەســاتی سروشتی، لە ئەستۆی مرۆڤی (بار) دەکات.

٢ ـ لە فۆلکلۆری کوردیدا دەوترێ:

**لەناو سابلاخ دا، بورجێك دیارە بــەقــەد ئــەو بــورجــە، خەم لە دڵم بارە**

واتە: بەبارستایی و قورسایی و بەرزایی ئەو بورجە، بارتــەقای خــەم، نیشــتۆتە سەر دڵم“ بۆیە لەسەر پێودانی ئەم رێسایە، دەوترێ: فلانە کەس خــەمبارە، واتــە: خەم لە ئەستۆیەتی.

٣ ـ دەوترێ: فلانە کەس (نوێژکەر)ە!. کە دیارە لەسەرەتادا وشە لێکدراوەکە، لە وشەی (نوێژ + کار)ەوە هاتووە و ئــەمیش چــونکە لەدەمێکــەوە“ لەســەردەمی پەیدابوونی ئایینی ئیسلامەوە، لەناو کوردســتاندا بــەکار دێــت، تیپــی (ئــەلف)ی وشەی (کار)، کە خۆی زۆر کورت دێتە سەر زمان و گوێ“ بووە بە (بــزوێن = ە) و لە (نوێژکار)ەوە بووە بە (نوێژکەر)، کە هەرگیز رێی تێناچێ ئەم وشــە لێکــدراوە، لە بنەڕەتدا بەو سووکایەتییە لە دایك بووبێت، یان دواتر ویسترابێ سووکایەتی پێ

بکرێت! لەکاتێکدا کە بەڕێزەوە سەیری ئایینی ئیسلام کراوە، چونکە نموونەی تری لەمجۆرە وشەیەمان زۆرن، وەك: وشەی (راوکەر)، کە ئەمیش دیارە لە بنەڕەتدا (راو + کار) بووە، وەك وشەی (وەرزشکار).

٤ ـ تیپی (ئەلف)ی تێکڕای ئەو وشانەی سەرەوە، کە هەموویان لە بنەڕەتدا حەرفی (ئەلف) بوون و لەبەر کورتیی تیپەکە، لەسەر زمان و گوێچکە و لەو جێگەیەدا سواون و گۆڕدراون بەتیپی (ە)، واتە: بە (بزوێن)، ئەوەمان لا دروست دەکات، کە وشەی لێکدراوی (رەنجبەر)، هەر (رەنجبار) بووە.

هەرچەندە لەشیتەڵکردنی وشەی (رەنجبەر)دا، وا دێتە بەرهەست، کە (رەنجبەر) بەو کەسە بڵێن گوایە بەری رەنج و تەقەللاکە، بۆ خۆی ببات.

بەڵام وەك وتمان: لەو وشانەدا (بار)ی سواون و بوون بە (بەر) و لەو گۆڕان و سواندنەشدا، مانایان ناگۆڕدرێ و وەك خۆیان دەمێننەو... ئەگینا ئەگەر وابێ" ئەو کاتە کە دەوترێ: (فلانە ئافرەت منداڵەبەرە)" ئاخۆ دەبووایە مانای وابێت، کە گوایە منداڵەکەی دزیوە؟!(*).

* * *

-٢-

هەندێجار بەدەم بینین و بیستنەوە، برێ واژەو زاراوە بەر چاو و گوێ دەکەون، دەم و دەست بەری چاو لێڵ و گوێچکەش لە بیستن بێزار دەکەن: ئیتر بەپەلە بڕیار دەدەیت گوێچکەو چاوت، لەبیستن و بینینی ئەو رەشەبایە دووربخەیتەوە، کە بە مەبەستی شێواندن و کاولکاریی، رووی لەزمانی کوردی کردووەو هیچ دامودەزاگایەکی (زمانەوانی)ش دەسەڵاتی بەرگریی لەم وێرانکارییە پێناکرێ، کەلە هیچ قۆناغێکی مێژووی زمانی کوریدا، ئەوەندەی ئێستا، مەترسیی بۆسەر زمانی کوردی پەیداکردبێ. وەك نموونەی (دڵۆپێك لە زەریا):

**ناوزەد:**

واژەی ناوزەد! لەچییەوە هاتووە، کە لەم چەندساڵەی دواییدا، زۆر نەشارەزایانە لەنووسینی کوردیدا بەکاری دەهێنن!. بۆیە پێم باشە شتێك لەسەر ئەم واژەیە بڵێم: کە (**زەد**) لەبنەڕەتدا چاوگی قرتاوی (**زَدَنْ — زەدەن**)ی زمانی فارسییەو بەمانای (**لێدان**)ە، کەچی ئەوەی سەیرە ئەو نووسەرانەی بەوهۆیەوە کە ماناکەی نازانن، زۆرجار واژەی (**ناوزەد!**) و هەندێ جاریش دیومە و بیستوومە بە (**ناوزەنگ**)یشی بەکاردەبەن!... لەم سەرنجەمدا لەسەر ئەم واژەیە، مەبەستم ئەوەنییە بڵێم نابێ واژەی بیانی بەکار ببرێ. بە پێچەوانەوە من بڕوام وایە دەوڵەمەندترین زمان، ئەو زمانەیە کە (**ئەنتێن**)ی واژە وەرگرتنی زمانگەلی بیانی بەهێزە و زیرەکانە واژەی بیانی دەقۆزێتەوەو لە شوێنی پێویست و شیاو و لەهەناوی رستەی ڕەسەنی زمانەکەیدا بەکاری دەهێنێ. چونکە (**زمان**) بەبەکارهێنانی واژەی بیانی، نابێتە زمانێکی نامۆ، بەڵکو بەبەکارهێنانی رستەی سەر بە میعماری بیانی، دەبێتە زمانێکی ئاڵۆز و نامۆ... لەم بوارەدا ئەگەر شاعیرانی کلاسیکی کورد بەنموونەو لەناویشیاندا (**نالی**) بەیاد بهێنینەوە، دەبینین واژەگەلێکی زۆری بیانی (**عەرەبی و فارسی**) بەکاردەهێنێ، بەڵام لەناو کەش و هەواو هەژموونی رستەی خۆماڵییانەو ڕەسەنی کوردا دەیانگونجێنێ. لەم بۆنەیەدا

ئەگەر هەر لەسەر واژەی (**ناوزەد**) بوەستین و بلێین گریمان لەجێی واژەی (**نـاوزەد**)، واژەیەکی تری کوردیمان نـەبێت، ئـەوا قەیناکـە ڕێ پێـدراوە. بـەڵام خۆشـبەختانە چەندان واژەی ترمـان لـەجێی واژەی (**نـاوزەد**) هەیـە وەك **نـاودێر** دەکـرێ، یـان: **ناودەبرێ**.

*   *   *

### جەنگی جیهانیی یەکەم:

### جەنگی جیهانیی دووەم:

ئـەم ڕسـتەیە تەرجەمەیـەکی دەقـاودەقی عەرەبییـە، کـەهیچ ڕستەسـازیی و بیرکردنەوەیەکی کوردییانەی تێدا لەبەرچـاو نـەگیراوە. کـە ئەگـەر بـەجیا لەسـەر وشەکانی ڕستەکە قسەبکەین، ئاوای لێدێت: جیهان، مەبەست لەو گۆی زەوییەیە، کە ئێستا ئێمەی لەسەر دەژین. ئیتر جیهان (لەئێستادا) گۆیەکی تری زەوی نییـە، مرۆڤی لەسەر بژی. کەواتە (**جیهانی یەکەم و جیهانی دووەم و سێیەم**) نییە. بەڵام مەبەست لە واژەی (جەنگ)ی ئەم ڕستەیە، ئەو جەنگەیە کە لەسـەدەی ڕابـردوودا لەسەر ئەم گۆی (جیهان)ە روویانداوەو مەبەستیش لـە جـەنگی یەکـەم و جـەنگی دووەم، یان: یەکەم جەنگ و دووەم جەنگە. بەم پێیە میعماری ڕسـتەکە بۆکـوردی ئاوای لێدێت: (جەنگی یەکەمی جیهانیی) یان : (**یەکەم جەنگی جیهـانیی**) و بـۆ دووەم جەنگیش بەهەمان شێوە دەبێتە: **جـەنگی دووەمـی جیهـانیی**، یـان **دووەم جەنگی جیهانیی**.

*   *   *

**(کان)**ی پاشگری **(کۆ)**، وەك: **شاعیرە سۆفییەکان:** لێرەدا **(کان)**ی پاشگر **(سۆفی – ییەکان)**، مەبەست و تایبەت لە (کۆ)ی ئەو شاعیرانەیە، کە سۆفی مەشرەب و سۆفیزمن. لەبەرئەوە دەبێ بنووسرێ: **شاعیرانی سۆفی**، یان ئەگەر پاشگری **(گەل)**، کە زۆرتر بۆ ئەمجۆرە **(کۆ)** یانە بەکاردەبرێ و لەبنەچەشدا ئەردەڵانییەو لەسەدان ساڵەوە سەرلەبەری کورد بەکاری دەبات، شتێکی لەبار و جوانە و لەناوچەکانی گەرمیان و ئەردەڵاندا زۆر ڕۆیشتووەو بۆ دەیان وشەی وەك: **کوڕگەل، کچگەل، پیاوگەل، ژنگەل، گەلی کورد** و... هتد، بەکاری دەبەن. ئەوسا ئەم ڕستەیەمان ئاوای لێدێت: **(شاعیرگەلی سۆفی)**. هەرچەندە هەندێك زمانەوانانی کورد، پێیان وایە پاشگری **(کان)**ی سۆفییە-کان، **ئامرازی خستنەسەر**ەو دەشێ وەك خۆی: **(شاعیرە سۆفییەکان)** بنووسرێ. کە من لەگەڵ ئەمەدانیم و پێم وایە ئەم **(ئامرازی خستنەسەر)**ە، تەنیاو تەنیا بۆ **(سیفەت)** دەبێ، وەك: **کچە جوانەکان، کوڕەقۆزەکان، سێوەگەورەکان، هەورەبەرزەکان**، نەك بۆ **(ناو)**، کە مخابن بەپێودانی ئەم هەڵە باوە، دەیان و دەیان دەستەواژە و ڕستەی وەك ئەمجۆرە ڕستە ئاڵۆز و شپرزانە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی هیچ تایبەتمەندییەکی زمانی کوردی لە ئێستادا بەکاردەبرێن و گۆڕینەوە و سڕینەوەشیان، زۆر سەخت و ئەستەمە، وەك ئەوەی دەڵێین و دەنووسن: **حیزبە کوردستانییەکان!** لەکاتێکدا وەك دەزانین هەر **(یەك)** کوردستان هەیە، بەڵام لەکوردستاندا چەندان حیزب هەیە، کە دەبێ سیغەی **(تاك)** بۆ **(کوردستان)** و سیغەی **(کۆ)**ش بۆ **(حیزبەکانی کوردستان)** بەکاربرێ... بەڵام هەڵەباوەکە لەوێدایە، کە پاشگری **(کان)**ی **(کوردستان- ییەکان)**، بۆ حیزبەکانە، نەك بۆ کوردستان و بەم پێیە دەبێت بوترێ و بنووسرێ: **(حیزبەکانی کوردستان)**، یان: **(حیزبگەلی کوردستان)**. هەر لەم بوارەدا نموونەی تری لەمجۆرە دەهێنینەوە دەڵێین: لەکوردستاندا ڕووبارو چیای زۆر هەیە و بۆ ناوهێنانیان بە **(کۆ)**، دەبێ بوترێ: **ڕووبارەکانی کوردستان، چیاکانی کوردستان**. نەك **ڕووبارەکوردستانییەکان!**، یان **چیاکوردستانییەکان** و... هەر بەو پێودانەش دەبێ بوترێ: کچانی سلێمانی، نەك کچە سلێمانییەکان! و شەقامەکانی سنە، نەك **شەقامە سنییەکان!**. **کوڕان**، یان: **کوڕگەلی دیاربەکر**، نەك **کوڕەدیاربەکرییەکان!**.

یان دەوترێ و دەنووسرێ: (**ڕێکخراوە دیموکراتییەکان**)!، کە ئەمیش وەك ڕستەی پێشوو، دەبێ سیغەی (**کۆ**) بۆ (**ڕێکخراوەکان**) بێت، نەك بۆ (**دیموکراتی**). چونکە لەکوردیدا وشەی (**دیموکراتی**) جەمع ناکرێتەوە، بەڵکو وشەی ڕێکخراو جەمع دەکرێتەوە و بۆ ئەم ڕستەیەش دبێ بوترێ و بنووسرێ: (**ڕێکخراوگەلی دیموکراتی**) و هەر لەنموونی ئەم هەڵە باوانەدا دەنووسرێ: **وڵاتە ئەوروپییەکان!، هێزە ئەمریکییەکان، هەواڵە وەرزشییەکان!.** کە لەمەشدا دەزانین (**ئەوروپا**) بریتییە لە چەندا وڵات و بەهەموویان (**یەك**) کیشوەریان پێك هێناوە و ئەم کیشوەرەش وەك وشەی (**کوردستان**)ی پێشتر باسکراو، جەمع ناکرێتەوە. واتە: یەك ئەوروپا هەیە. بۆیە دەبێت دەستەواژەکە بەمجۆرە دابڕێژرێ: (**وڵاتانی ئەوروپی**) و... **هێزەکانی ئەمەریکا**، نەك: **هێزە ئەمەریکییەکان!، هەواڵەکانی وەرزش، نەك هەواڵەوەرزشییەکان!.**

حۆئەگەر بگەڕێینەوە بۆ خودی ئەو ڕستەو نموونە عەرەبییانەی، ئەمجۆرە ڕستە کوردییانەیان لێوە تەرجەمەکراوە، ئەوسا بۆمان دەردەکەوێ کە وەرگێڕە کوردەکە، نەزمانی کوردی دەزانێ نە عەرەبی. ئەگینا لە ڕستەو نموونە عەرەبییەکەشدا، ئەو سیغەی (کۆ)یەی ئێمە مەبەستمانە و دەبێ بە (کۆ) بنوسرێن، لەوێشدا هەر وان، وەك ئەوەی لە عەرەبیدا دەنووسرێ: **ألشعراء الصوفیون، الدول الاوربیة، الاحزاب الکوردستانیة، المنظمات الدیمقراطیة، القوات الامریکیة، الاخبار الریایضیة**. واتە: وشەکانی **ألشعراء** ، **الدول، الاحزاب، المنظمات، القوات، الاخبار**، هەموویان (**کۆ)ن و** وشەکانی (**الاوربیة، الکوردستانیة، الدیمقراطیة، الامریکیة، الریایضیة)ش**، هەموویان بە سیغەی (تاك) هاتوون، کەچی وەرگێڕە نەشارەزا کوردە، سەقەتیان دەکات و لەباریان دەبات و بەمجۆرە ئەم کوردی نەزانانە، زمانی کوردی کاول دەکەن.

# ئەم کتێبەم خوێندەوە:

## (شاری سلێمانی-ململانێی گروپە کۆمەڵایەتییەکان: ١٨٢٠-١٩٢٠)

### (١)

گەورەترین تەنگژە لە بەردەم نووسینەوەی لایەنە جیاجیاکانی مێژووی گەلی کورددا، نەبوونی سەرچاوەیە، سەرچاوەش بەواتای نەبوونی نووسەری کورد خۆی، واتە: نووسەری خۆماڵییە!. کە ئەم دیاردەیە بەتەنیاو لە سەرتاسەری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، هەر تایبەت بووە بەکوردو هەر کوردیش بەم شێوە سەمەرەیە ماوەتەوەو پێی وایە دەبێ گەڕیدەو لێکۆڵەرو سیاسەتمەداری بیانیی، هەموو کەرەسەو پێداویستیو پلانی هەموو بوارەکانی ژیانی ئابووریو کۆمەڵایەتییو سیاسییو..هتد، بۆ بنووسێتەوەو دەستەبەر بکەن!. ئەمەش بێگومان هەر لە ئەفسانەو میتۆدەکانی خەیاڵدا جێگەیان دەبێتەوە. کەچی زۆر لە نووسەرانی کورد، ئەم دیاردەیە بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە، کە کورد بەدرێژایی مێژوو، دەوڵەتی نەبووەو نەبوونی دەوڵەتیش وای کردووە زەمینەی لەبار، بۆ زۆر کاری گرنگو لە ناویشاندا بۆ کاری نووسین نەڕەخسابێ!. کە ئەم قسەیە چەند لە راستیشەوە نزیك بێ، بەڵام راستییەکی لاوازە، یان ئەگەر بوێرم بڵێم: بیانوویەکی لاوازەو مانای خۆبەدەستەوەدانە بۆ هەلومەرجی سەپاو. چونکە ئەگەر کورد دەوڵەتی نەبووبێ، بەڵام لە سەدان ساڵ لەمەوبەرەوە، چەندین میرنشینی خۆی هەبووە، کە ئەم میرنشینانە، ئەگەر دەوڵەتیش نەبووبن، نیمچە دەوڵەت بوونو نەتەوە دراوسێکانی تری کوردستانیش، هەر لە رێگەو ژێر سێبەری ئەو میرنشینو نیمچە دەوڵەتانەوە، سەدان کتێبیان لە بارەی زمانو فەرهەنگو مێژووی خۆیانەوە خستۆتە ناو

کتێبخانەکانی دنیاوە[1]. بەڵام ئێمە، لە ماوەی نێوان ئەو (٣٠٠-٤٠٠) ساڵەی دەسەڵاتی میرنشینەکانی کورددا، ژمارەی نووسەری کوردو بەرهەمەکانیان (واتە: ئەو بەرهەمانەی لە سەر بابەتێکی فەرهەنگیو مێژوویی کوردیان نوسیبێ)، لە ژمارەی پەنجەکانی تاقە دەستێك کەمترن!. لەبەرئەوە گەڕانەوە بۆ لەسەرنووسینی هەر لایەنێکی ژیانی ئەو سەردەمەی گەلی کوردو قۆناغی دوای لە ناوچوونی ئەو میرنیشینانەش، دەبێتە ئەو کارە دژوارانەی رەنجی بێبڕانەوەو خوێنی جگەریان دەوێ. چونکە لە یەکەمین پێویستیو کەرەسەی نووسینەوە، کە سەرچاوەو بەڵگەنامەیە، ئیتر دەبێ مەڵبەندەکانی ئەرشیفی وڵاتانی دەرەوەی کوردستانیان بۆ بپشکێنرێت، کە ئەمیش خۆی داستانێکی ترە، بەتایبەتیش نوسین لە سەر لایەنێکی هێشتا دەست بۆ نەبراوی وەك بابەتی سوسیۆلۆگی (کۆمەڵناسی)ی کۆتاییەکانی ژیانی میرنشینی بابان، کە لەچاو میرنشینەکانی تری کورddاو بەنموونە: میرنشینی ئەردەڵاندا، کە لە هەموو روویەکەوە لە میرنشینەکانی تری کورد، سەقامگیرترو دامەزراوتر بووە، کارێکی سەختە، چونکە میرنشینی بابان لە دوا پەنجا ساڵەی تەمەنیدا، بەسۆنگەی شەڕو تێهەڵچوونیان لەگەڵ هەردوو دەسەڵاتی عوسمانیو ئێرانیو هاوکات شەڕو ململانێی خۆبەخۆی خۆیشیاندا، کارێکیان بەسەر میرنشینەکە هێناوە، داری بەسەر بەردییەوە نەمێنێ.

ماموستا جەعفەر (فازیل کەریم ئەحمەد) کتێبێکی بەناونیشانی سەرەوە چاپو بڵاوکردۆتەوە، کە وەك لە ناونیشانی کتێبەکەوە دەردەکەوێ، تەرخانە بۆ ململانێی گروپە کۆمەڵایەتییەکانی شاری سلێمانی، لە نێوان سەد ساڵی (١٨٢٠-١٩٢٠ز)دا هەڵبژاردنی ئەم بابەتو تەقەللاش بۆ دیتنەوەی سەرەداوەکانی سەرەتاو چۆنێتی ئەو ململانێیە، لە زۆر رووەوە کارێکی:

١.ئازایانەیە. چونکە ئەگەرچی هێماو نیشانەکانی ئەو زۆرانو ململانێ نهێنیو ئاشکرایە، ئەوەندە ئاکامیان لێ کەوتۆتەوە، کە چاودێری وردو نزیك، بەئاسانی دەلاقەو درزەکانی پاشماوەی ململانێیەکە (هەست) پێدەکات، بەڵام هەر تەنیا (هەست)ی پێدەکات، نەك بتوانێ دەست لە سەر بنەماو هۆیە زانستییەکانی ئەو ململانێیە دابنێ. لەبەرئەوەی سەرەتاکانی ئەو زۆرانو کێشمە کێشمەیە، ئەوەندە تەماوییو پڕ توونکە توونکەن، کە چاوی (هەست) هەر تەڕیان ناکاتو

دەبێ ڕاستەوخۆ ڕێگەی بۆ لەبەر بگیرێ. لەبەرگرتنی بوارێکیش، کە پێشتر ڕێچکەی نەشکێنرابێ، کارێکی ئەستەمە. بۆیە من ئەم کارە، بەکاری (نەکردە) ناودەبەم، چونکە لەلایەکەوە پێشتر کەس نەیکردووە، لەلایەکی تریشەوە، بەهۆی دژوارییی ئەنجامدانی کارەکەوە، لە دەست هەموو کەس نایەت، کە نووسەر خۆی ئەم چەڵەمانەی لە پێشەکی کتێبەکەیدا دیاریی کردووەو لێیان نەسڵەمیوەتەوە..

٢.زیرەکانەشە، چونکە هەر هەڵبژاردنی ئەو قۆناغەی ژیانی کۆمەڵایەتیی سلێمانی، جیاوازییەکی سەروچڕی لەگەڵ سەرلەبەری شارەکانی تری کوردستاندا هەیە، لەبەرئەوەی شاری سلێمانی بەپێی بڕیارێکی میرانی بابان دروستکراوە (١٧٨٤ز)و بۆ ئەوەش زۆر بەخێرایی ببێتە مەڵبەندێکی درەوشاوەی فەرهەنگی، بازرگانیی، کۆمەڵایەتیی، زۆر بەپەلەش زاناو رووناکبیری ناوداری ئەو سەردەمەی کوردستانیان بۆ پایتەختەکەیان بانگهێشت کردووەو تەکیەو خانەقاو مەدرەسەیان بۆ ئامادەکردوون. هاوکات وەستاکارو پیشەگەری چاك‌و دەست رەنگینیشیان بۆ کاری بیناسازیی‌و پیشەی جیاجیا، لە دەرەوەی قەڵەمڕەوەکەیانەوەو بەتایبەتیش لە شارەکانی (سنە)و (بانە)و (سەقز)ەوە بۆ نیشتەجێبوون لە (سلێمانی)دا هانداوە. تەنانەت جووتیارو کرێکارو سەربازیشیان لەو ناوچەو ئیلانەوە خواستوون، کە بەر لە دروستکردنی (سلێمانی)، بەشدارییان لە بەڕێوەبردنی میرنشینەکەدا نەبووە[٢].. بەم بۆنەیەوە پێکهاتەی سلێمانی، پێکهاتەیەکی هەمەجۆرەو بەیەکتر جیاوازو نامۆبوون. کە لەم پێکهاتە جیاوازانەشدا، شەرم‌و شکۆ لەیەکتر کەمتر دەبێتەوە. بۆیە لەم بارەدا ئاستی ململانێیەکەش زیاتر هەڵدەکشێ‌و هەر پۆلەیان ویستوویانە بەپەلە ببنە خاوەنی دەسەڵات‌و دارایی‌و جێگەکردنەوەی خۆیان، کە هەر خودی ئەم خواست‌و تەقەللا هەمەجۆرە، لە هەمان کاتدا ماك‌و تۆوی ململانێ‌و بەربەرەکانێیەکی نهێنی‌و هەندێ جاریش ئاشکرای لە پرۆسەی پێکهاتەی (سلێمانی)دا کردووەو لە هەمان کاتدا سەرباری ئەم دۆخەش، کە هێشتا ململانێیەکە شەقڵی نەگرتبوو، ململانێیەکی توندتر لە ساڵی (١٨١١ز)[٣] بەدواوە، نەك هەر تێکەڵ

ململانیٚ فراوانەکە بوو، بەڵکو جڵەوی ململانێیەکەیشی بەدەستەوە گرت، کە ئەویش ململانێی نێوان هەردوو رێبازی (قادری)و نەقشبەندی) بوو، کە یەکەمیان زانای ناودار شێخ مارفی نۆدیٚ (١٧٥٢-١٨٣٨ز)و دووەمیشیان مەولانا خالید (١٧٧٩-١٨٢٧ز) رابەرایەتییان دەکرد.

بەڵام ئەم ململانێیەیان لە ململانێی چین‌و دەستە جیاجیاکانی تری ناوشاری سلێمانی بەتەوژمترو ئیقلیمگیرتربوو، چونکە بەشێکی فراوان لە بەشداران‌و پێکهاتەکانی ململانیٚ پێشووەکەش، بەدوو شێوەی جیاواز، تێکەڵ ئەم ململانێیەبوون‌و بەمەش پرۆسەی ململانێی گروپگەلی کۆمەڵایەتیی سلێمانی، تین‌و تاوی بەکوڵی تێرژاو گەیشتە ترۆپك‌و بەجۆرێك بینی خواردەوەو رەگی داکوتا، کە لە دوای مەرگی هەردوو رابەری تەریقەتەکەش، هەر درێژەی کێشاو پسانەوەی بۆ نەبوو.

بۆیە دووبارەی دەکەمەوە، کە هەڵبژاردنی ئەو قۆناغەی ژیانی کۆمەڵایەتیی شاری سلێمانی، بۆ لێکۆڵینەوە لە سیماو کرۆك‌و جۆری ململانیٚ‌و کێشمەکێشمەکانی کۆمەڵایەتیی، هەڵبژاردنێکی ژیرانەیە.. لە پاڵ ئەم هەڵبژاردنەشدا، نووسەر لە ناوجەرگەی ئەم ململانێیەدا، بۆ بابەتێکی دیاریکراو دەگەریٚ، کە پێشتر لە بەرنامەکەیدا رەنگی بۆ رشتووە، ئەویش بەدیارخستنی (چەمکی هاوشارییبوون، واتە: بازرگان‌و کاسب‌و روناکبیر)ە لە شاری سلێمانیدا، کە ئەم پۆلە خەڵکە لە پرۆسەیەکی مێژووییدا، چینی بورژوا پێکدێنن‌و نووسەر بەپەرۆشەوە بەدوای بابەتی گەرا خستن‌و چرۆکردنی ئەم چینەی شاری سلێمانیدا دەگەریٚ‌و لەم پێناوەشدا بەماندووبوونێکی پشوودرێژانەوە، پەلی بۆ زۆر سەرچاوەو بەڵگەی دەست بۆ نەبراوی بابەتەکەی بردووە.. بەڵام مخابن، سەرەرای ئەو هەموو تەقەللایەش، کەچی رۆڵی بورژوای کوردی لە شاری سلێمانیدا، رۆڵێکی ساواو لاوازی بووە. چونکە وەك نووسەر خۆی دەڵیٚ: (ئێمە ئەمرۆش لە روومان نایەت باسی ئەوە بکەین، کە چینی بورژوامان هەیە، یان هەبوویێت.. لە (پێشەکی).

بەڵام دەرنەکەوتنی رۆڵی کارای بورژوای کورد لە ماوەی سەد ساڵی (١٨٢٠-١٩٢٠ز)ی دیاریکراودا، پشووی نووسەری سوار نەکردووە، بەڵکو بەهەمان تەقەللای دیتنەوەی دوورترین تروسکەو بچووکترین بەڵگەوە لە ئیستگەکان‌و خاڵی

رووداوە بچووكو گەورەكانی تەمەنی سلێمانیدا، لەنگەری گرتووەو رووداوەكانی دواندووە.

یەكەمین ئیستگەی بەرجەستەی ئەو رووداوانەش، راپەڕینی ساڵی (١٨٨١)ز)ی شاری سلێمانییە، كە ماوەی (٣) رۆژی خایاندووەو تیایدا شاری سلێمانی ئازادكردووە.

نووسەر ئەم زانیارییەی لە سەرچاوەیەكی (مێجەرسۆن)ەوە هێناوە (ل٦٤)، كە ئەویش سەرەتای سەدەی پێشوو، بەسەردانێكی نهێنی لە سلێمانی ماوەتەوەو وەك (سۆن) باسی دەكات، ئەم راپەڕینە، ئاكامی یەكگرتنی نوێنەرانی چینی بورژوای شاری سلێمانییە، دژی بەرەی شێخان (نەوەكانی شێخ مارفی نۆدێ)، بۆ ئەوەی لە یەك كاتدا پەلاماری حاكمی عەسكەریی عوسمانیو بنەماڵەی شێخان پێكەوە بدەنو لە شاریان دەرپەڕێنن.

لەم راپەڕینەدا (وەك سۆن دەیگێڕێتەوە) نوێنەرانی چینی بورژوا، پێوەندییان بەهۆزی (هەمەوەند)ەوە كردووە، كە ئەو زەمانە بەعەشیرەتێكی جەنگاوەرو چاونەترس ناویان رۆیشتووە (ل٦٤).

لەم راپەڕینەدا ئەوەندەی نامێنێ شار بكەوێتە دەست كۆمەڵانی خەڵك، بەڵام (پەلاماری هێزی سەربازیی عوسمانی، بەتوندی هێرشیان كردە سەر راپەڕیوەكانو سەركوتیان كردنو..ل٦٥).

نووسەر ئەم رووداوەی لە دوو جێگەی كتێبەكەیدا بەسەركردۆتەوە (ل١١، ٦٤)، بەڵام لە هیچكامیاندا لەنگەری لایان نەگرتووەو كەمو زۆر وردەكارییو سەرنجو لێكدانەوەی خۆی لەسەر نەكردووە. لە كاتێكدا من چاوەنوارم دەكرد هەڵوێستەی لەسەر بكاتو تەقەللای ئەوەبدات چاوهەڵبخاتو ئاسۆی جوگرافیای شاری سلێمانی تێپەڕێنێو بۆ ناوچەكانی تری كوردستان لەگەڵ رووداوەكانی تری شارو ناوچەكانی كوردستاندا، هاوئاهەنگییان پێبكات. بەمەش دەستەچیلەو پشتیوانیی زیاتر، بۆ روونكردنەوەی ئەم رووداوە پەیدا دەبوو. كە نووسەر ئەمجۆرە كارەی بۆ روونكردنەوەی چەند بابەتێكی تری كتێبەكەی كردووە، وەك لە (لاپەڕەكانی: ٥٩، ٩٠)دا، نموونەی لە هەندێ هەواڵو رووداوی شاری كرماشانەوە، بۆ سلێمانی گواستۆتەوە.

لەبەرئەوە پێم باشە من لای خۆمەوە مۆڵەت لە نووسەر وەربگرمو بەمجۆرە چڕو خێرایە، لەم رووداوەی ساڵی (١٨٨١ز)ی شاری سلێمانی بدوێم:

راپەڕینی ساڵی (١٨٨١ز)ی شاری سلێمانی، هاوکات و هاوئاهەنگە لەگەڵ تەنینەوەی جەماوەرییانەی شۆڕشی (١٨٨٠-١٨٨١)ی کورد، کە شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری (١٨٣٠-١٨٨٣ز) رابەرایەتیی کرد. ئەم شۆڕشە کە ناوەندی سەرکردایەتییەکەی لە(نەهری)ی بارەگاکەی شێخ عوبەیدوڵڵا بوو، دوای زنجیرەیەك کۆبوونەوەی فراوان لەگەڵ نوێنەرانو سەرانی هەموو ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، کە نوێنەری شاری (سلێمانی)یشیان تێدابووە،[٤] لە بەهارو کۆتایی هاوینی (١٨٨٠ز)دا سازدرا، بڕیاردرا بۆ رزگارکردنی کورد، لە دەست زوڵمو ستەمی هەردوو دەوڵەتی قاجاریو عوسمانی، بەدوو قۆناغ دەست بەئازادکردنی کوردستان بکرێ. قۆناغی یەکەم لە کوردستانی بندەستی ئێرانو پاشانیش کوردستانی عوسمانی ئازاد بکرێ.

بۆ ئەم مەبەستە، لە کۆتایی (مانگی ١٨٨٠/٩ز)دا، هێزی سوارەو پیادەی کورد،[٥] لە دوو قۆڵەوە بەرەودوا، هێرشیان بۆ سەر ناوچەکانی موکریانو ئازەربایجانی خۆرهەڵات (تەورێز)و خۆرئاوا (ورمێ) بردو لە ماوەیەکی زۆر کورتدا زۆربەی ناوچەکانیان ئازادکردو لە ناوچە کوردنشینەکانی وەك: سابلاخ، سەقز، بانەدا بەنیازی پێکهێنانی دەوڵەتی کوردستان، فەرمانڕەواو کاربەدەستیان بۆ دیاریکردن.

ئەم بەرنامەیەی شێخ عوبەیدوڵڵاش هەڕەشەیەکی ترسناکی بۆ دەوڵەتی ئێران بەتایبەتیو بۆ هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو رووسیاش بەگشتی دروست کرد. بۆیە ئێران بەپەلە هەموو هێزەکانی خۆی لە سەرتاسەری ئێرانەوە، بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشەکە خڕکردنەوەو رووسیاش بەهەمان خێراییو بۆ رێگەگرتن لە تەنینەوەی شۆڕشی کورد، هێزی سەربازیی خۆی نارده ناوچەی (جەلفا)و تورکیاش هێزێکی زۆری بۆ سەر سنوورەکانی ئێران-عوسمانی دامەزراندو بەهەموویان گەلەکۆمەکێی سەربازییو دیپلۆماسیشیان لە بەرنامەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا کرد. لەبەرئەوە هێزەکانی کورد، لەبەرامبەر هێزی سوپای ئێرانو چەکدارانی خۆبەخشی ناوچە عەجەم نشینەکاندا، نەیانتوانی هەردوو شاری (تەورێز)و (ورمێ) بگرنو لە دوای

شەڕو تێهەڵچوونو پەلاماری خوێناویی لە نێوان هەردوو هێزی کوردو سوپای ئێرانیدا، کە نزیکەی دوو مانگو نیوی خایاند، هێزەکانی کورد لە (١٨٨٠/١١/١٢ز)دا، تێکشکانو تێکشکاویی بەرەو سنوری عوسمانی (ناوچەی هەکاری) پاشەکشەیان کرد. دەوڵەتی ئێرانیش لە (١٨٨٠/١١/٢٢ز) بەدواوە، لە تۆڵەی ئەم هێرشەی شۆڕشگێڕانی کورددا، کە کوردانی هەموو ناوچە کوردنشینەکانی ئێرانن بەهەموو جۆرێك بەشداریی و هاوکارییان کرد، کەوتە سزادانی بەکۆمەڵو سووتاندنو کاولکردنو تالآنکردنی گوندو مەزراکانیان. دانیشتووانەکانیشیان لە ترسی گیانی خۆیان، بەدەیان هەزار کەس ئاوارەی ناوچەو شارەکانی رەواندزو نەهریو هەولێرو سلێمانیو شوێنە سەختەکان بوون.. بەم بۆنەیەوە نزیکەی (٤-٥) مانگ سوپای ئێران، زۆر دلڕەقانە، هەموو گوندە کوردنشینەکانیان کاول کردو بوونە چۆڵەوانیی.. شێخ عوبەیدوڵلاو فەرماندەکانی تری شۆڕشیش، بەهەموو جۆرێك کەوتنە کۆکردنەوەو دالدەدانیانو رێکخستنەوەی جەماوەر بۆ هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشو پێوەندیو نامەگۆڕینەوە لەگەڵ سەرانی خێڵەکانی پشدەرو رانیەو قەلآدزێو کۆیە.

لەم سەروبەندەدا، بەپێداگریی ئێران، هەردوو دەوڵەتی رووسیاو بەریتانیا، گوشاری زۆریان بۆ سەر دەوڵەتو دەرباری عوسمانی دەبرد، تا بەهەر شێوەیەك دەبێ، رێگە لە سەرهەڵدانەوەی راپەڕینی کورد بگیرێو شێخ عوبەیدوڵلا لە ناوچەی (هەکاری) دووربخرێتەوە. لەم پێناوەدا سەرانی دەوڵەتی عوسمانی، دەیانویست بەئارامییو لەسەرخۆ لەگەڵ شێخ عوبەیدوڵلادا بجوولێنەوەو بەخۆشیی لەداوی بخەن.. لە زستانی (١٨٨١ز)دا، بەگەرمیی کەوتنە هاتوچۆ بۆ لای، لە بارەگاکەی خۆی لە نەهری.. سەرەتای ئەم سەردانانەش بەوە دەستی پێکرد، کە سوڵتانی عوسمانی، یاوەرێکی جەنگیی خۆی بەناوی (کۆلۆنێل ئەحمەد بەگی یاوەر) بەنوێنەرایەتی خۆی بۆ لای شێخ عوبەیدوڵلا ناردو کۆبوونەوەی نهێنیو دووقۆڵییان کردووەو بەناوی سوڵتانیشەوە بەڵێنی پشتیوانیکردنی لە هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش لە ئێرانداو جێبەجێکردنی هەندێ لە داخوازییەکانیشی لە قەڵەمڕەوی عوسمانی پێدا. ئیتر هەر ئەم یاوەری سوڵتانی عوسمانی (کۆلۆنێل ئەحمەد بەگ)ە، بەهەمان مەبەست سەردانی شێخ عوبەیدوڵلای کردووەو هاوئاهەنگیی کۆکردنەوەو سازدانی

جەماوەری ناوچە جیاجیاکانی کوردستانی لەگەڵ شێخ عوبەیدوڵڵا بەگشتیو لەگەڵ شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵادا بەتایبەتی کردووەو بەجووتەش (شێخ عەبدولقادرو کۆلۆنێل ئەحمەدبەگ)، لە سەرەتای مانگی (٣/١٨٨١ز)دا، سەردانی شاری (رەواندز)و (هەولێر)یان کردووەو لە هەردوو شارەکە، بەرێنوێنی و ئامۆژگاریی ئەحمەد بەگی کۆلۆنێل، کۆبوونەوەیان بەو سەرۆك عەشایەرو جەماوەرە زۆرەوە کردووە، کە پێشتر شێخ عوبەیدوڵڵا لە هەموو ناوچەکانەوە بانگهێشتی کردبوون.. لە هەولێریش تەلگرافێکی تێروتەسەلیان بەناوی جەماوەری کوردستانەوە بۆ خاوەن شکۆ (سوڵتانی عوسمانی)، بەسکاڵاو گازەندەوە بەمجۆرە کردووە:

(.. بۆچی دەوڵەتی رووس لایەنگریی لە کۆمەڵو دینی خۆی، بۆ پشتیوانیی لەگەڵ (قەرەباغ)و (سربستان) کردووە، کەچی بەرێزتان، کە خەلیفەی موسڵمانانن، چۆن رازی دەبن دەوڵەتی عەجەم، بۆ خزمەتی مەزهەبی خۆی، خوێنی ئێمە بڕێژێو ماڵمان تالان بکاتو مەزهەبمان بگۆڕێو لە نیشتمانی راستەقینەی خۆمان ئاوارەمان بکات!؟..)[٦].

دوای کۆبوونەوەیەکەی هەولێر، شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵا، بەنیازی بەسەرکردنەوەی عەشایەرەکانی ناوچەی (کۆیە)و (پژدەر)و رێکخستنەوەیان، سەردانی کۆیەو پژدەری کردووەو لەوێشەوە بۆ (بیتوین) چووەو ماوەیەك میوانی (مامەند ئاغای پیران) بووە.[٧]

زانیارییو بەڵگەکانی بەردەستم، کە لەسەر شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵا کۆمکردوونەتەوە، تا ئێرە هەواڵی ئەوەیان تێدا نییە، کە شێخ عەبدولقادر لەم بەسەرکردنەوەی ناوچەکانی باشووری کوردستاندا، کە لە مانگی (٣/١٨٨١ز)دا کردوونی، سەردانو کۆبوونەوەی بەعەشایەرو جەماوەری شاری (سلێمانی)ش کردبێ، دەشێ لە سەرچاوەو بەڵگەی تردا، کە چنگ من نەکەوتوون، نوێنەرانی شاری (سلێمانی)یشی دیبێ، بەڵام چەند مانگێك دوای ئەم زنجیرە سەردانو کۆبوونەوەو خۆئامادەکردنەوەیە بۆ هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش، دیسانەوە دەربارەی عوسمانی، لە ژێر گوشاری ئێرانو رووسیاو ئینگلستاندا، گوشاریان بۆ شێخ عوبەیدوڵڵا بردووە، کە دەبێ سەردانی سوڵتانو ئەستەموڵ بکات.. وەك

دەردەکەویٚ شیٚخ عوبەیدوڵڵاش تارِادەیەك بروای بە بەڵیٚنەکانی دەربارو سەرانی عوسمانی کردبیٚ، بۆیە دوای تەنگ پیٚ هەڵچنینو گەمارۆدانی بارەگاکەی بەهیٚزی سوپاوە، بەناچاریی لە (١٨٨١/٦/٤ز)دا، بۆ ئەستەموولٚ براوە.[٨]

ئەم بەڵیٚنو پەیمان شکیٚنییەی سولٚتانو دەرباری عوسمانی بەرامبەر بە شیٚخ عوبەیدوڵڵاو جەماوەری کوردستان، بۆ داکۆکی لە مافەکانیو دواتر گرتنو بردنی شیٚخ عوبەیدوڵڵا بۆ ئەستەموولٚ، جەماوەری کوردستانو پەیرِەوانی ریٚبازی نەقشی توورِەو بیٚزار کردووەو ئەوەی (میٚجەرسۆن)یش سەبارەت بە پیٚوەندیکردنی نویٚنەرانی شاری سلیٚمانی، بە خیٚڵی (هەمەوەند)ەوە دەیگیٚریٚتەوە، روونکردنەوەو بەرجەستەکردنیٚکی جوانی رووداوەکانە. چونکە ئەگەر سەرەداوەکانی ئەم گیٚرِانەوانە، لەگەڵ یەکتر گریٚبدەینەوە، ویٚنەیەکی روونتری شیٚوەی راپەرِینو بیٚزاریی دەربرِینەکەمان بۆ دەردەکەویٚ، بەوەی کە خیٚڵی (هەمەوەند)، وەك خیٚڵیٚکی سەرکەشو یاخی لە دژی هەموو دامودەزگاکانی ئیدارەی دەوڵەتی عوسمانیو بەرەی (شیٚخان)یش وەك پاڵپشتو هاوکاریٚکی رژیٚمی عوسمانی، دەبیٚ بۆ راپەرِین دژی دەسەڵاتو ئیدارەی عوسمانی، پەنا بۆ هیٚزیٚکی دژی عوسمانی ببریٚ، کە لەو کاتەدا خیٚڵی (هەمەوەند)ە.

لەم رووداوەدا ویٚنەی دوو دەستەی دژ بەیەکی ئەو رۆژگارەی شاری (سلیٚمانی)مان لە بەرچاودا بەرجەستە دەبیٚ:

بەرەی دەسەڵاتدارانی عوسمانیو هاوکارانی، کە بەرەی (شیٚخان)نو بەرەی نویٚنەرانی چینی بورژوا، کە نویٚنەرانی ئەم چینە، پیٚکهاتەیەکی تیٚکەڵە لە کاسبکارانو پیشەوەرانو خویٚندەوارانو پەیرِەوانی ریٚبازی نەقشی، رۆڵی سەرەکییان لەم بەرەیەدا هەیە، ئەگەر نەڵیٚم هەموو رابەرایەتیکردنەکەی ئەم بەرەیە، وەك دواتریش و بەتایبەتی لە سەرەتای سەدەی بیستدا، هەر ئەمانن. چونکە ئەو شیعرو لاواندنەوانەی لەو بۆنەیەدا بۆ گرتنو بردنەکەی شیٚخ عوبەیدوڵڵا بۆ ئەستەموولٚ، لە لایەن پەیرِەوانی ریٚبازی نەقشییەوە لە شاری سلیٚمانی وتراونو دواتریش لە کۆرِو موناجاتی ئایینیدا، بەدەفەوە خویٚندراونەتەوە، تا دوای سەرەتاکانی سەدەی پیٚشووش هەر بەسەر زاری پەیرِەوانی نەقشییەکانی

(سلێمانی)یەوە بوون. لەم بارەیەوە ئەفسەرو رووناکبیر: رەشید شەوقی (١٩٠٣-١٨/١٠/١٩٦٧ز) لە بیرەوەرییەکانی منداڵی خۆیدا ئاوای دەگێڕێتەوە:

(.. چونکە دەنگخۆش بووم، دەفێکیان بۆ دروست کردبوومو فێری گۆرانی دەروێشانیان کردبووم، ئەو گۆرانییەش ئەوەبوو کە بەسەر شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریدا وترابوو، کە ئەو خوالێخۆشبووە ویستبووی لە کوردستانی ئێراندا، سەربەخۆیی دەوڵەتێکی کوردی رێکبخاتەوە، بەڵام لەبەر نووستوویی گەلەکەیو هێرشی ئێران و تورکی خەلیفە، بۆی سەرنەگرتو تورکان بەدیل بردیان بۆ بەغداو لەوێشەوە بۆ ئەستەموولّ. ئەمەش یەکێکە لەو گۆرانییانە:

**شێخ عوبەیدوڵڵام بەزەلیلی**

**بردیان بەرەو خوار بەدیلیی**

**حافیزی بێ جوبرائیلیی**

**دەمرم بۆ شێخ عوبەیدوڵڵا[٩]**

هەڵبەتە هاوکارییو پشتیوانیکردنی دەستەی بازرگانو پیشەوەرو خوێندەواران لە رێبازی نەقشی، هەر بەتەنیا لەم بۆنەیەدا (١٨٨١ز) نەبووە، بەڵکو لەسەرەتای دەرکەوتنو درەوشانەوەی (مەولانا خالید)ەوە، وەك کەسێکی رزگارکارو ئەلتەرناتیف، بۆ چارەسەری کێشەکانیان بۆیان نواڕیوەو ئومێدی زۆریان پێی بووە. لە ناو ئەم جەماوەرە فراوانەشدا نوێنەرانی خوێندەواران، لە هەموو دەستەو توێژێك زیاتر لە مەولانا خالید ئاڵاونو داکۆکییان لێکردووە. چونکە جگە لەوەش کە وەك رابەرێکی ئایینی، خاوەن بیروبۆچوونو زانیاریی نوێ ناسیویانە، هاوکات وەك دیاردەو وەرسووڕانێکی نوێی رووناکبیریی، کە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا (١٨١١-١٨٢٠ز)، گۆمی لیخنو مەندی رووناکبیری دەڤەرەکەیشی شڵەقاندووە، دڵبەستەو سەراسیمەی بوون.[١٠]

بەم پێیە، ئەو ململانێ درێژخایەنەی لە نێوان (بەرەی شێخان)ی سلێمانیو بەرەکەی تردا، کە بازرگانو پیشەوەرو پەیڕەوانی رێبازی نەقشی پێکیان دەهێنا،

لە ناوەرۆکدا خوێندەواران رابەرایەتییان دەکرد. بەواتایەکی تر: ململانێی نێوان خوێندەوارانو نەخوێندەواران بوو، کە ئەمجۆرە ململانێیە، دژوارترین و سەختترین ململانێی مێژووە، چونکە نەخوێندەوار کاتێ کە دڵنیا دەبێ لەگەڵ خوێندەواراندا دەبەزێ، ئەوسا لە شێوازی هەڕەشەو تۆقاندنو تیرۆر زیاتر، شێوازێکی تر شك نابات و هەر لە سەرەتای ململانێکەشەوە بەر لە هەمو کەسێك، بەم شێوازە لەگەڵ خودی "مەولانا خالید"دا جوڵانەوەو لە شاری سلێمانی دەریان پەڕاند.. کە لە بەرامبەردا مەولانا خالید، هەڵوێستی خوێندەوارانەو پاراستنی ئاسایشی قەڵەمڕەوی بابانو سەرومالّی دانیشتووانی کوردستانی هەڵبژارد. هاوکات هەر خودی مەولاناش لە هەمان رۆژگاردا، راستەوخۆ بە(شێخ مارفی نۆدێ)ی رابەری بەرەی شێخانی وتووە: ئێوە لەم ململانێیەتاندا لەگەڵ مندا، پشت بە نەخوێندەواران دەبەستن[١١] و ناتوانن وتووێژو دیالۆگی خوێندەوارانەو رووبەڕوو لەگەڵماندا ساز بکەن.[١٢]

دەرپەڕاندنی مەولانا خالید لە شاری سلێمانی، ئەگەر تینو تاوی ململانێیەکەیشی بە هەڵچوویی رانەگرتبێ و جۆرێکیش لە هەرەسو پاشەکشێی لای بەرەی لایەنگیرانی مەولاناو خوێندەواران نیشاندابێ، بەڵام ململانێیەکەی بەزیندوویی راگرتووەو هاوهەڵوێستیو سۆزی رووناکبیرانی لە دژی ناهەقیی و غەدر خۆش کردووەو بەرەیەکی ئۆپۆزسیۆنی رانەگەیەندراوی لێ پێکهێناون.

لەم بەرەیەدا سەرباری ئەوەی کە خەڵك، بەرەی شێخانو دەسەڵاتی تورکی عوسمانییان بە بەرەی دژی خۆیان دادەناو قینیان بەرامبەریان ئەستوورتر دەبوو، هاوکات لای خوێندەواران بەگشتیو لای شاعیرانی وەك: سالمو کوردیو نالی بەتایبەتی، گیانی بەرگریی نیشتمانیی، لە دژی دەسەڵاتی داگیرکارانەی عوسمانی، پەرەی سەندو لە شیعرو بەرهەمیاندا، بەزەقیی رەنگیدایەوەو (مەولانا خالید)یان وەك رەمزی ئەو غەدرو رقە، بەکاردەهێنا. نالی لەو قەسیدە بەناوبانگەیدا، کە لە شامەوە بۆ (سالم)ی ناردووەو بریتییە لە (٤٣) بەیت، لە (١١) بەیتیاندا باسی یادو خۆشەویستیی خانەقاکەی مەولانا خالید دەکات[١٣]. (سالم)یش لە زۆربەی شیعرەکانیدا، تورکی عوسمانی، بەدزێوترینو دڵڕەقترین دوژمن چواندووە، کە دیارە لەمەدا هاوپەیمانەکانی تورکی عوسمانیشی مەبەستە.

بەمجۆرە ئەم پرۆسەی ململانێیە، هەر درێژەی کێشاوەو بەو هۆیەشەوە کە لەو سەردەمەدا هۆیەکانی راگەیاندن: رۆژنامە، رادیۆ.. لە کوردستاندا نەبوون‌و شیعری ئەم شاعیرانە، لە خانەقاو تەکیەو مزگەوت‌و کۆڕو کۆمەڵی رووناکبیراندا، دەستاودەستی کردووە، ئەوا بەردەوام دەستەو پۆلی تری جەماوەرو خوێندەوارانی دەستەکانی دوای خۆیان، بەم گیانە پەروەردە بووە، کە بێزاریی نامەکەی بازرگان‌و کاسبکارو زانایانی شاری سلێمانی، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەو روونتر لە ساڵی (۱۹۰۲ز)دا، لە دژی گەورە بەرپرسێکی وەك پارێزگا (متصرف)ی سلێمانی، بۆ سوڵتانی عوسمانی، دەبێتە دووەمین راپەڕینی دوای یەکەمین راپەڕینی ساڵی (۱۸۸۱ز)ی شاری سلێمانی‌و ئەمیش هەر تەواوکەرو درێژەدەری ئەو رقە پیشخواردووەیە، کە جەماوەری هوشیاری شاری سلێمانی، لە دژی دەسەڵاتدارانی عوسمانی‌و هاوپەیمانەکانیان ئەنجامیان داوە.. کە ئەم راپەڕین‌و مانگرتنە، لەوەی بیست ساڵی پێشتر، خەستترو پشوودرێژتریشە، چونکە ماوەی مانگێك درێژەی کێشاوە.

ئەم بێزاریی نامەیە، کە لە لاپەڕە (٦٥)ی کتێبەکەی مامۆستا جەعفەردا ئاماژەی پێکراوە، ژمارە (۱۰٦) کەس ئیمزایان کردووە، لەمانەش (۸۲)یان ئیمزای بازرگان‌و (۲٦)یان ئیمزای زانایانی ئایینین، کە دڵنیام ئەگەر بتوانرایە لێکۆڵینەوە بۆ ناسینەوەی ناوی ئەو (۲٦) زانا ئایینییە بکرابایە، ئەوا بێ هیچ گومانێك، یەك کەس لە کۆی ئەو (۲٦) زانایە، سەر بەڕێبازی (قادری-بەرەشێخان) نەبوون.

ئەم رووداوانەو رووداوی پاشتریش، کە (۱٥-۲۰) ساڵ دوای ئەم رووداوە دەردەکەوێ، سەرهەڵدانی دەستەیەکی تری نوێنەرانی بورژوای نیشتمانپەروەرن، کە بریتین لە بازرگان‌و پیشەوەران بە گشتی‌و بەتایبەتیش رووناکبیران‌و لە ناو ئەو رووناکبیرانەشدا ئەو دەستە رووناکبیرەی کە بە(مننەوەران) ناسران.. سەرهەڵدانی ئەم شەپۆلەش، کە دەکەوێتە پێش ساڵانی (۱۹۲۰ز) سەدەی پێشوو، هەر بەرووبووم‌و سەرئەنجامی ئەو پرۆسەی ململانێ درێژخایەنەی پێشووترە، کە ئەم شەپۆلەی لە هەناوی خۆیدا پێگەیاند. ئەم شەپۆلە، جگە لەو بازرگان‌و پیشەوەرانەی کە نموونەیان لە راپەڕین‌و مانگرتنەکانی پێشتردا بوون، ژمارەیەکی

زۆری سیاسەتمەدارو نووسەرو شاعیرو رۆژنامەنووسی گەورەشیان تێدابوون، کە لە هەڵوێستی سیاسیو بەرهەمی نووسینو شیعریاندا، زۆر توندتر لە دەستەکانی پێش خۆیان، دژی لایەنگرانی دەسەڵاتی عوسمانیو نەخوێندەوارانو بەرەی شێخان بوون، بەجۆرێك کە سەرەڕای تیرۆرکردنی درەوشاوەترینی جووتە رووناکبیری ناو ئەم شەپۆلەی وەك: جەمال عیرفان (١٨٨١-١٢/١٢/١٩٢٢)و عارف صائیب، بەڵام شێلگیرانەترو بێ پەروا، بەرهەمێکی ئەدەبیی رەخنەئامێزو جوامێریان خستە سەر خەرمانی ئەدەبی کوردی، کە وەك ئاکام، لەبەرهەمی هیچ کامیاندا، ددانی خێر بە بەرەی شێخاندا ناهێنرێ، بەڵکو سەرومڕ رەخنەیە لە بەرەی شێخان.. رەخنە بەهەموو جۆرەکانییەوە: رەخنەی دڵسۆزانەو ژیرانە، رەخنەی لاقرتێو کاریکاتێر ئامێز.. کە ئیتر هەر ئەم ئەدەبەش، بووە مۆرکو شەقڵی سەرتاپاداگری ئەدەبی نیوەی یەکەمی سەدەی بیست.

بەجۆرە ململانێی درێژخایەنی ئەم گروپە کۆمەڵایەتییانەی شاری سلێمانی، کە مامۆستا جەعفەر، ماوەی سەد ساڵی نێوان (١٨٢٠-١٩٢٠ز)ی بۆ دیاری کردوون، سەرئەنجام مێژوویەکی درێژیشی پڕ لە جموجووڵو بزووتنەوەو هەڵچوونو داچوونی بەهەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی، ئابووریی، سیاسیی، فەرهەنگیی، ئەدەبیی.. بەشاری سلێمانی بەخشیوە، کە بەهەموو ئەم جیاوازییانەش، جیاوازییەکی تایبەتمەندی بەشاری سلێمانی داوەو لە شارەکانی تری کوردستانی جیاکردۆتەوەو کردوویەتی بە شارێکی نموونەو پێشەنگو ئاڵای پێشڕەوایەتیی لەو بوارەدا پێ داوەو بەدرێژایی ئەو ماوە دیاریکراوە (١٨٢٠-١٩٢٠ز)و دواتریش، دەستپێشخەر بێو فەرهەنگی جیاجیا، بەشارەکانی تری کوردستان ببەخشێت.

کەواتە کاتێ ئەم سیما جیاوازانە، شاری سلێمانی لە چاو شارەکانی تری کوردستاندا جیاواز نیشان دەدەن، ئیتر دەبووایە هەر نووسەر خۆی، وەڵامی ئەو جیاوازییانەش بداتەوە، کە لە نێوان شاری سلێمانیو شارێکی وەکو (رەواندز)دا هەیەو دەپرسێ: بۆ هەمان دیاردە، لە شاری رەواندز، کە پێتەختی میرنشینی (سۆران) بووە، بیری بزووتنەوەی نەتەوەیی، لەوێش (رەواندز) سەری هەڵنەدا ؟!(ل٣٥).

بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارە، هەر لە هەناوی ئەو ئەنجامگیرییەدایە، کە وتمان: شاری سلێمانی لە ئاکامی پرۆسەیەکی ململانێی پێکهاتەیەکی جیاوازو درێژخایەندا، ئەم ئەنجامەی لێکەوتەوە، کە ئەم ململانێیە، لە پێش گواستنەوەی پێتەختی میرنشینی باباندا، کە لە (قەڵاچوالان) بوون، رووی نەداوە، چونکە شاری (رەواندز) بەپێوانەی شاری (سلێمانی)، ئەوەندەی پێکهاتەی تێکەڵو جیاوازو دژە بەرژەوەند، تێدا کۆنەبوونەتەوە، تا پرۆسەیەکی ململانێ دروست بکەن.. لەبەرئەوە ئەگەر میرانی بابانیش، پێتەختەکەیان هەر لە(قەڵاچوالان) بهێشتایەتەوە، ئەوا (قەڵاچوالان)یش هەروەك شاری (رەواندز) دەمایەوە، ئەگەر نەڵێم زۆر پاشکەوتووتریش دەبوو.

هەر لە بواری ئەم بەراوردانەدا، نووسەر دەپرسێ: بۆ شارێکی چکۆلانەی وەکو سابڵاخ (مەهاباد)، کە سەردەمێك پێتەختی میرنشینی موکریان بووە، دەبێتە ناوەندی بزووتنەوەی نەتەوایەتی، کەچی شارێکی گەورەتری وەکو (سنە)، کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ پێتەختی والییەکانی ئەردەڵان بووە، ناتوانێ خەرمانەی بیری نەتەوەیی لە خۆی بئاڵێنێ؟! (ل٣٥).

وەڵامی ئەم پرسیارەش ئاسانە، ئەگەر هەوڵبدەین پێشینەیەکی مێژوویی دەڤەری موکریانو شاری (سابڵاخ) بەسەر بکەینەوەو بڵێین: شایەکانی سەفەوی رقێکی کۆنیان لە کوردانی باکووری خۆرئاوای ئێران لەسەر ئەوە هەڵگرتبوو کە کوردانی سوننی مەزهەبی ئەو ناوچانە، لە شەڕی چاڵدێران (١٥١٤ز)دا، پشتیوانییو هاوکارییەکی راستەوخۆی سوپای عوسمانییان کردو شوێنەواری ئەو پشتیوانییەش، تا رۆژگاری شا عەبباسی یەکەم (١٥٨٧-١٦٢٩ز)، هەروا بەزەقیی مابووەوەو کوردانی ناوچەکانی: تەرگەوەڕ، مەرگەوەڕ، سۆما، برادۆستو موکریان، کە (ئەمیرخانی برادۆست- خانی لەپزێڕین) فەرمانڕەوایان بوو، هەر بەهێز دەبوونو خۆیان قایم دەکرد.. شا عەبباس ئەم گومانی خۆقایمکردنانەی لێ کردنە بیانووپێگرتنو لە ساڵی (١٦٠٩ز)دا، هێرشێکی گەورەی ناردە سەریان. پاش شەڕێکی سەختو ئابڵوقەدانێکی درێژ، شا عەبباس قەڵاکەی ئەمیرخانی گرتو هەزاران کەسی لێ کوشتن. شا عەبباس بەوەشەوە نەوەستاو لەشکرەکەی شوێن ئەو هێزانەی کورد خست، کە مەیدانی شەڕەکەیان رووەو موکریان دەهێنا.

هێرشێکی گەورەیشی بۆ سەر موکریان کردو لەوێش کوشتارێکی زۆری لە کوردان کرد[١٤].. ئەم هێرشەی شا عەبباس کە (٦٠) شەست هەزار سواربوون، ماوەی (٤) رۆژو (٤) شەو، خەریکی قەتڵو عام بوون[١٥].

نووسەرێکی عەجەم، کە باسی شەڕو کوشتاری دوامەیدانی ئەم تێهەڵچوونەی کوردو سوپای سەفەوی دەکات، دەڵێ: ئەو شوێنەی ئەو دوا کوشتارەی کوردیان تێدا کردووە، بە(کوردقڕان) ناسراوە[١٦].. واتە: سەرلەبەری کوردانی جەنگاوەرو ناوچەکانیشیان لە ناوبردوون. ئەو مەیدانەش کە ئەم نووسەرە عەجەمە باسی دەکات، ناوچەی (شار وێران)ی تەنیشت باکووری خۆرهەڵاتی ئێستای شاری (مەهاباد)ە، کە نووسەرانی سەفەوی، هەر بەم کوشتارو کاولکارییەشەوە نەوەستاونو دەیان هەزار بنەماڵەی کوردیان لەم ناوچانە، بۆ ناوچەکانی (خۆراسان)ی خۆرهەڵاتی ئێران گواستەوەو لە جێی ئەوان، دەیان هەزار بنەماڵەیان لە ئیلی ئەفشار، لە ناوچە کوردنشینەکاندا بەتۆپزیی نیشتەجێ کرد.. ئەمەش بووە یەکەمین سۆنگەی دروستکردنی ناکۆکی قووڵی هەمەلایەنەی نەریتی ژیانو جۆری جیهانبینیو خووڕەوشتی کۆمەڵایەتییو پەروەردەی ئاینو زمان، لە نێوان دوو نەتەوەی جیاواز، واتە: کوردو عەجەمدا، کە ئەم ناکۆکییە، هەتا هاتووە قووڵترو توندتر بۆتەوەو ئارامو ئاسایشی لە ناوچەکەدا نەهێشتووە، چونکە سوپای عەجەم بەبەردەوامیی بۆ تەمێکردنو سەرپێ دانەواندنی ئیلەکانی کوردو هێنانە ژێر باری فەرمانبەریی، هەمیشە شەڕیان بەکورد فرۆشتووەو کوردیش بۆ پاراستنی کەسایەتی سەربەخۆی خۆی، هەر لەبەر هەڵستیو ناکۆکییو ململانێدا بوون.. کە ئەم ستەمو زوڵمە نەتەوایەتییە هەر درێژەی کێشاوەو زەمینەی بۆ چەندان جار یاخیبوونو شەڕوشۆڕی ئیلەکانی (بڵباس)و دواتریش بۆ شۆڕشی ساڵی (١٨٨٠ز)ی پێشتر باسکراومان خۆش کردووە.. کە لەم شۆڕشەدا، یەکەمین شاری کوردنشین، کە لەلایەن شۆڕشگێڕانی کوردەوە رزگارو ئازادکراو هاوکات بەمەبەستی پێکهێنانی ئیدارەی دەوڵەتی سەربەخۆی کورد، فەرمانڕەوای کوردی بۆ دیاری کرا، شاری سابڵاخ بووەو هەر شاری سابڵاخیش ناوەندو بارەگای سەرەکی فەرماندەی هێزەکانی کورد (قۆڵی ئازەربایجانی خۆرهەڵات). دوای سەرکوتکردنی ئەم شۆڕشەش، راپەڕینی (سمکۆ)ی شکاك لە ساڵانی (١٩١٥-١٩٣٠ز) دەست

پێدەکات، کە چەندان جار شاری سابلاخی لە ژێر دەسەلاتی ئێران ئازاد کردووە. دوای ئەویش لە سالانی (١٩٤٠ز) بە دواوەی سەدەی پێشووەوە، پێکهێنانی کۆمەڵەو ڕێکخراوی نەتەوەیی- سیاسیو دروستبوونی کۆماری کوردستانیش، هەر لە هەمان دەڤەری مەهابادا روو دەدەن، کە هەموو ئەم ڕووداوانە، کامی سەربەخۆییو ئازادییان بەم هەرێمە بەخشیوە. بۆیە بەردەوامیش خەباتیان بۆ بەدەستهێنانی ئازادی کردووە.

دەمێنێتەوە سەر بڕگەی دوایی پرسیارەکەی نووسەرو سەرهەڵنەدانی بیری ناسیونالیستی کورد لە شاری (سنە)دا، کە وەڵامەکەیشی ئەوە دەبێ: بەو هۆیەوە ئەو هەلومەرجەی لە ناوچەی موکریاندا روویداوە، لە شاری (سنە)ی پێتەختی ئەردەلاندا رووی نەداوە، ئەوا دیارە ئەم ئاکامەیشی لێ نەکەوتۆتەوە. هەرچەندە هەر ئەوکاتەی سەرانی سەفەوی بەفەرمانی (شا عەباس)، هێرشیان بۆ سەر ناوچەکانی موکریان کرد، لە بەرنامەیەیاندا هێرش بۆ سەر ناوچەکانی ئەردەلانیش بکەن، بەلام لەبەر زۆر هۆ (کە ئێرە جێی نییە) ئەمەیان بۆ نەچووە سەرو دواتر بەهۆی ئەو خزمایەتییەی لە نێوان شا عەباسو خان ئەحمەدخانی میری ئەردەلاندا هاتبووە گۆڕێو شا عەباس (زەڕین کولاه خانم)ی خوشکی خۆی بەخان ئەحمەدخان دابوو، لە کاتی لەشکرکێشی سوپای سەفەویدا، بۆ سەر ناوچەکانی موکریان، شا عەباس داوای لە خان ئەحمەد خان کرد، تا ئەویش لەشکرو هێزی خۆی کۆبکاتەوەو لەو هێرشانەدا هاوکاریی سوپای سەفەوی بکات. خان ئەحمەد خانیش لەشکری ئەردەلانی کۆکردەوەو بەدەم بانگەوازی شا عەباسەوە چووەو بەجۆرێك لەسەرکوتکردنی دانیشتووانی موکریاندا بەدڵو بەکوڵ بەشداربووە، کە ئەو بەشە دانیشتووەی موکریان، کە لەدەست سوپاکەی خۆیو شا عەباس، رووەو (رەواندز) هەڵاتنو خۆیان لەقەلاو شوێنە سەختەکانی رەواندزدا قایم کردووە، شوێنیان کەوتووەو گەمارۆی داونو سزای توندی بەسەردا سەپاندوون[١٧].. بەلام لە رۆژگاری ئەم لەشکرکێشیو هێرشانەی سوپای سەفەوی دا بۆ سەر ناوچەکانی موکریان، هێشتا شاری (سنە) دروست نەکرابوو و پێتەختی میرنشینی ئەردەلان لە قەلای (حەسەن ئاوا) بوو، چونکە شاری سنە، لە سالی (١٦٣٥ز)دا دروست کراوە.

## (٣)

بەرلەوەی ئەم چەند سەرنجە گشتگرە دوایی پێ بهێنم، بەپێویستی دەزانم چەند وردە سەرنجێکی تریش روونبکەمەوە:

١.نووسەر لە دوو جێگەی کتێبەکەیدا (ل٥٣، ٨٣)، لەنگەری لای بابەتی مردنو شوێنی ناشتنی (سلێمان پاشای کوڕی ئەوڕەحمان پاشای بابان) گرتووە. لە هەردوو جێگەکەشدا چەندین لێکدانەوەو بۆچوونی جیاوازی سەبارەت بەهۆی ناشتنی سلێمان پاشای بابان، بەتەنیشت گۆڕی (شێخ مارفی نۆدێ)وە دەربڕیوە، کە لە یەکەمیاندا دەڵێ: (ناشتنی سلێمان پاشای بابان بەتەنیشت گۆڕی شێخ مارفی نۆدێوە، شتێکی گرنگەو جۆرێکە لە پشکداریکردنی پیاوە ئایینییەکان لە دەسەڵاتی دونیاییدا، دوور نییە گەر هاوکێشەی پشکداریکردن لە دەسەڵاتی سیاسیدا، بەقازانجی مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی ببووایە، داهاتووی میرنشینی بابان بەجۆرێکی تر نەبووایە).

لە دووەمیشیاندا دەڵێ: (مردنی شێخ مارفی نۆدێ-١٨٣٨ز-و ناشتنی لە گردی سەیوانو مەرگی سلێمان پاشای بابان لە هەمانساڵداو ناشتنی بەتەنیشت گۆڕەکەی شێخ مارفەوە، ناکرێ کاری رێکەوت بێت. دەتوانرێ لە ئاوێنەی ئەکتیکی سمبولیو میتۆلۆجییەوە، ناشتنی دوو کەسایەتی- دینی-و دنیایی- بەتەنیشت یەکەوە، کە راستییەکی نەشاراوەیە، پیاوی- دنیایی- کورد، هیچ حسابێکی بۆ —پیاوی ئایین-ی نەکردووەو هەریەکەیان لە شوێنێك نێژراون. میران، پاش مردنی سلێمان پاشا، هەستی سیاسیو مێژوویی خۆیان هەبووەو هەستیان کردووە لە سەر داروپەردووی دەسەڵاتی ئەواندا، ئەوا دەسەڵاتێك خەریکە لەدایك دەبێتو دەسەڵاتی ئەوان بەرەو ئاوابوونو تێکشکان دەچێتو بیانووی بوونی، خەریکە خۆی خۆی دەسڕێتەوە، رەزامەندیی یەکسانیبوون، تەنانەت لە

گۆڕستانیشدا، جۆرێك بووە لە ددان پێدانانی دەسەڵاتی ئایینی ئەوەی رازیبووە باوکی بەتەنیشت پیاوێکی ئایینییەوە بنێژرێ، ئەحمەد پاشای بابان بووە..).

وەك لەسەرووتر وتمان: ئەم لێکدانەوەو بۆچوونانەی نووسەر، لەمەڕ ناشتنی سلێمان پاشا، بەتەنیشت گۆڕی شێخ مارفەوە دەربڕیون، جگە لەوەی زۆر لە یەکتر جیاوازن، لقو پۆپیشیان زۆر لێ دەبێتەوە، بۆیە پێم باشە بۆ کۆکردنەوەی ئەم بیروبۆچوونە جیاوازانەو سەروبەرکردنیان، چەند روونکردنەوەیەك بخەمە روو:

١.سەرەتا ئەوە بەیادی نووسەری ئەم کتێبەو خوێنەرانیش دێنمەوە، کە (کلودیوس جێمس ریچ) لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ کوردستان (١٨٢٠ز)و ئاشنابوونی لەگەڵ میرانی بابانو ئاگاداربوونی لە هەڵوێستی ئایینیو سیاسییان، لە یادداشتی رۆژی (٢٤ی حوزەیرانی ١٨٢٠ز)دا، لە باسی مەولانا خالیددا دەنووسێ: (عوسمان بەگ پێی وتم: خۆیو مەحموود پاشاو زۆربەی سەرانی کورد، مریدی ئەون..)[١٨]. بەم پێیەو بەگوێرەی ئەم هەواڵەی (ریچ)، دەبێ (سلێمان بەگی برای مەحموود پاشا، کە دواتر دەبێتە: سلێمان پاشا، مریدو لایەنگیری شێخ مارفی نۆدێ بێ.. لە یادیشمان بێ، کە ئەم هەواڵەی (ریچ)، لە گەرمەی ناوبانگو دەسەڵاتی (مەولانا خالید)دایەو هێشتا لە (سلێمانی) دەرنەپەڕێنراوە. بۆیە شتێکی ئاساییە ئەگەر سلێمان پاشا لە ژیانی خۆیدا وەسێتی کردبێ، گۆڕەکەیشی لە تەنیشت گۆڕی شێخ مارفی نۆدێوە بێ، کە بە ڕابەری ئایینی خۆی زانیوە.

٢.لەوەشدا کە نووسەر دەڵێ: (پیاوی دنیایی کورد، هیچ حسابێکی ئایین نەکردووە)، من بیروڕام پێچەوانەیەو بۆ ئەمەش دیسان بام هەر لە گەشتنامەکەی (ریچ)دا، یادداشتی هەمان رۆژی ناوبراو، بۆ بەڵگەی ئەوە بهێنمەوە، کە پیاوی دنیایی کوردە، زۆر رێزی لە پیاوانی ئایین گرتووە، وەك نموونەی نێوانی مەحموود پاشای بابانو مەولانا خالید: (میر -مەبەستی ریچ لە مەحموود پاشای بابانەوە-، وا خووی گرتبوو، لە بەرامبەر مەولانا خالیددا بەپێوە بوەستێو قەننەی بۆ تێبکات)[١٩]

٣.سەبارەت بەو لێکدانەوەیەش کە نووسەر دەڵێ: (میران، پاش مردنی سلێمان پاشا، هەستی سیاسیو مێژوویی خۆیان (هەبووەو هەستیان کردووە لە سەر داروپەردووی دەسەڵاتی ئەواندا، ئەوا دەسەڵاتێك خەریکە لە دایك دەبێتو

دەسەڵاتی ئەوان بەرەو ئاوابوونو تێکشکان دەچێتو بیانووی بوونی، خەریکە خۆی دەسڕێتەوە).

من پێم وا نییە میرانی بابان پێشبینی ئەوەیان کردبێ، کە دوای لە ناوچوونی ئەوان، دەسەڵاتێکی تر، لە رابەرایەتی (شێخ)و (شێخان) جێگەیان دەگرێتەوە! بۆیە بۆ رێز لێنان لەو دەسەڵاتە داهاتووەی شێخان، بەچاکیان زانیبێ، گۆڕەکەی سلێمان پاشا، لە تەنیشت گۆڕی شێخ مارفەوە بێت. خۆ ئەگەر لەم روانگەیەوە سەیری داهاتووی دەسەڵاتی خۆیان بکردابایە، واتە: بەهیوای دەستبەرداربوونی دەسەڵاتیان بوونایە، دەبووایە (ئەحمەد پاشا)ی کوڕو جێنشینی (سلێمان پاشا)، کە راستەوخۆ دوای مەرگی باوکی، دەبێتە میرنشینی بابان، خەریکی ئامادەکردنو پێکهێنانی ئەو سوپا نوێیە نەبێ، کە بۆ بووژاندنەوەو بەهێزکردنی میرنشینی بابان، ئاواتی زۆری پێوە بەستووەو زۆری پێوە ماندوو بووەو هەر ئەو سوپایەشە، کە (نالی) بەشیعر[٢٠]و هەموو ئەو گەڕیدانەش، کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (ئەحمەد پاشا)دا، سەردانی کوردستانیان کردووە، ستایشی دەکەن.

لە ناو ئەو گەڕیدانەدا، نموونەی وەك (فلیکس جۆنز)ی ئینگلیزی، لە بارەی ئەم سوپایەوە دەڵێ: هەر یەك ساڵ دوای بەدەسەڵات گەیشتنی، توانی هێزێکی سەربازیی بەرچاو، لە سەر شێوەی تاکتیکی ئەورووپایی رێك بخاتو رایان بهێنێ.[٢١] هەروەها گەڕیدەی فەرەنسایی (یۆژین فلاندن)، هەر لە بارەی ئەحمەد پاشاو سوپاکەیەوە دەڵێ: (بیروڕایەکی بەرزی لە بارەی گرنگیی سوپاکەیەوە هەیەو زۆری حەز لە هونەری جەنگەو حەزدەکات سوپاکەی لە سەر شێوەی ئەورووپییانە پەروەردە بکات. چەند قوتابییەکی لە ئەستەموولەوە هێنابوو.. لە ناو ئەو قوتابییانەدا، یەکێکیان جێگەی بڕوای ئەحمەد پاشا بوو، یەکێك بوو لە هاوخەباتکارانی خۆی، کوردێك بوو لە ناو ریزی سوپای (میسر)دا خزمەتی کردبوو.. ئەحمەد پاشا بۆ نیشاندانی توانای سوپاکەی، مانۆڕێکی لە بەرچاومان پێکردن، کە دەبێ بڵێم بەوردییەوە جێبەجێکران. بۆ ئێمەش دووربوو لەوەی چاوەنوارمان دەکرد)[٢٢].

٤.هەر لە باس‌و خواسی مەرگی (سلێمان پاشای بابان)و لە جێدانانی (ئەحمەد پاشا)ی کوڕیدا، نووسەر ئاماژەی بەو شیعرە جوانەی (نالی)ش کردووە، کە بەتایبەتی بۆ ئەم بۆنەیەی نووسیوەو سەرەتاکەی بەم بەیتە دەست پێدەکات:

**تا فەلەك دەوری نەدا، سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو**
**کەوکەبەی میهری موبارەك، طەلعەتی پەیدا نەبوو**

لەم بۆنەیەدا پێم خۆشە منیش چەند روونکردنەوەیەك لەسەر ماناو مەبەستی ئەم شیعری (بۆنە)یەی نالی دەربڕم:

١.پێشتر ئاماژەیەکمان بەوەکرد، کە (سلێمان پاشا)ی باوکی ئەحمەد پاشا، وەك لایەنی ئاییندارییی، سەر بەرێبازی قادری‌و لایەنگرو مریدی شێخ مارفی نۆدێ بووە.

٢.لە رێگەی گەشتنامەکەی (ریچ)یشەوە (یادداشتی رۆژی ١ی حوزەیرانی ١٨٢٠ز)، لەوە دەگەین کە لە کاتی سەردانەکەی (ریچ)دا بۆ سلێمانی، سلێمان پاشا تەمەنی (٣٠) ساڵان بووە.[٢٣] کە لە ساڵی (١٨٣٨ز)یشدا کۆچی دوایی کردووە، ئەوا تەمەنی دەبێتە (٤٨ ساڵ)، ئەم تەمەنەش بۆ تەمەنی پیرێتیی، هێشتا زۆری ماوە، لە بەرئەوە دەشێ مردنەکەی وەك شتێکی چاوەنوارِ نەکراو بووبێ‌و دانیشتووانی (سلێمانی) بۆی بەداخ بووین‌و بەشێکی (بۆنە)ی شیعرەکەی (نالی)، بەر ئەم لایەنە دەکەوێ.. لایەنی تری گرنگ‌و بەرچاوی شیعرەکەی (نالی)، تایبەت‌و تەرخانە بۆ هاتنە سەرکاری (ئەحمەد پاشا)ی کوڕی سلێمان پاشاو ستایشکردنی‌و بەلای منەوە مەرگی (سلێمان پاشا)، هەر تەنیا بیانوویەکە بۆ شیعر وتنەکەی (نالی) بۆ (ئەحمەد پاشا). چونکە چ مانای گشتی‌و ئاشکراو شاراوەی شیعرەکەو چ شیعری تری (نالی) بۆ سوپاکەی ئەحمەد پاشاو چ رووداوەکانی تری دوای مەرگی سلێمان پاشا، بەڕوونیی دەریدەخەن، کە پێوەندی‌و دۆستایەتی پێشتری نێوان ئەحمەد پاشاو نالی، زۆر توندو پتەو بووە. بۆ سەلماندنی

ئەمانەش، با لای ئەو شیعرەی نالی هەڵوێستەیەك بكەین، كە بۆ بۆنەی مەرگی سلێمان پاشاو لە جێدانانی ئەحمەد پاشا وتوویەتی:

**تا فەلەك دەوری نەدا، سەد كەوكەبی ئاوا نەبوو**
**كەوكەبەی میهری موبارەك، طەلعەتی پەیدا نەبوو**

مانای ئاشكرای بەیتەكە دەڵێ: تا سووڕی گەردوون، خولی خۆی تەواو نەكردو تا (سلێمان پاشا)ش نەمرد، ئەستێرەیەكی گەورەتری وەك (ئەحمەد پاشا) دەرنەكەوت.

**تا نەگریا ئاسمان‌و تەم وڵاتی دانەگرت**
**گوڵ چەمەن ئارا نەبوو، هەم لێوی غونچە وا نەبوو**

واتە: تا رۆژگاری ناخۆش‌و پڕ ستەمی پێشوو (رۆژگاری سلێمان پاشا) بەسەر نەچوو، رۆژگارێكی جوانترو و سەوز دەرنەكەوت. هەرچەندە ئەگەر نەیارانی ئەو رۆژگارەی (نالی) لە سەر ئەوە لێپێچینەوەیان لەگەڵ نالیدا بكردایە، كە بۆچی دەڵێ: رۆژگاری سلێمان پاشا، وڵات پڕ لە گریان‌و هەورو تەم بووە؟ شیعرەكە ئەوەی لە ناوەرۆكدا لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، تا نالی لە وەڵامدا بڵێ: مەبەستم لە گریانی ئاسمان‌و تەمی وڵات، ئەو شیوەن‌و گریانەی دانیشتووانی قەڵەمڕەوی بابانە، كە بۆ مەرگی سلێمان پاشایان كردووە.

تا چەمەن پیرا لە سەر ئەسڵی درەختی لانەدا
فەرعی تازە، خوڕەم‌و بەرزو بوڵەند باڵا نەبوو

واتە: تا باخەوان لقی سەرەوەی نەبڕی (كە سلێمان پاشایە)، لقی تازە (كە ئەحمەد پاشایە)، سەری دەرنەهێناو بەرزنەبووەوە.

وەك قیاسێكی كە مو**ثبەت** بێ، نەتیجەی بێتە جێ
حەمدولیللا، شەه كە عالی جا بوو، خاڵی جا نەبوو

واتە: ئەگەر ئەو قسەو پەندە وابێ، کە دەڵێ پیاوی گەورە، وەچەی گەورەی لە پاش بەجێ نامێنێ، ئەوا سلێمان پاشا وا نەبووە، چونکە پایەبەرزێکی وەك ئەحمەد پاشای کوڕی لە دوای خۆی بەجێهێشتووە.

شاهی جەم جا (نالیا)، -تاریخ جم- تەئریخیە

دا نەڵێن لەم عەصرەدا، ئەسکەندەری جەم جا نەبوو

واتە: کە مێژووی ساڵمەرگی سلێمان پاشا، بەپێی —تەئریخ جەم-، کە بەحیسابی ئەبجەد ساڵی ١٨٣٨ز- دەگرێتەوە، ئەوا (وەك مامۆستا مەسعود محەمەدیش جەخت لەسەر ئەم مانایەی ئێمە دەکاتەوە)،[٢٤] ساڵی دەستپێکردنی فەرمانڕەوایی ئەحمەد پاشاش وا دەگەیەنێ کە سەردەمەکەی وەك ڕۆژگاری (جەمشید شا) دەبێ.

٣.هەر (نالی) شیعری تری پێشتر باسکراوی بۆ ئەو سوپایەی بابان هەیە، کە ئەحمەد پاشا، بەهیوای نۆژەنکردنەوەی سوپای بابان پێکی هێناوەو ئومێدی زۆری لە سەر هەڵناوە. ئەم شیعرەش ئەگەرچی بۆ ستایشی ئەو سوپایەیە، بەڵام هاوکات ستایشە بۆ ئەحمەد پاشای دامەزرێنەری ئەم سوپایە.

ئەم دوو شیعری (بۆنە)یەی نالی، کە بۆ لە سەر تەخت دانانی ئەحمەد پاشاو سوپاکەی نووسیونی، لە باری دەسەڵاتی شاعیرێتیی (نالی)یەوە نیشانی دەدەن، کە نالی لە ساڵانی سەروبەندی وتنی ئەم شیعرانەدا، لە لووتکەدا بووە، بەڵام پێش ئەم دوو شیعرە، شیعری بۆ لەسەر تەخت دانانی (سلێمان پاشا)ی باوکی ئەحمەد پاشا نەوتووە.

٤.هەر ئەم دۆستایەتییو نزیکایەتییەی نێوان (نالی)و (ئەحمەد پاشا) بووە، کە کوردناسێکی وەك (ئەلیکساندەر خۆدزکۆ)، کاتێ داوا لە ئەحمەد پاشا دەکات، تا بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر زمانی کوردی-دیالیکتی سلێمانی- هاریکاریی بکات، ئەحمەد پاشا لەسەرتاسەری کوردستاندا، هەر تەنیا (نالی) وەك زمانزانی باڵادەست، بۆ (خۆدزکۆ) باسدەکات.[٢٥]

٥.ئەحمەد پاشا دوای ئەوەی لەبەردەم سوپای عوسمانی (نەجیب پاشا)دا دەشکێ (١٨٤٦ز)، لە ڕێگەی کرماشان- گەڕووس- سایین قەڵا-وە دەچێتە (شەمدینان)و ماوەی (٥ مانگ) لە خانەقای (شێخ تاهای نەهری- شەمزینی) دەمێنێتەوە.[٢٦]

ئەم بڕگەیەی دوایی (مانەوەی پێنج مانگ لە خانەقای نەهری)، بەڵگەی بەهێزە بۆ پشتیوانیی لەوەی کە ئەحمەد پاشا سەر بەرێبازی نەقشبەندیو پێشتر لە لایەنگیرانی رێبازی مەولانا خالید بووەو هەر ئەم هۆیەش لەگەڵ (نالی)دا، کۆی کردوونەتەوەو دۆستایەتییانی توندو بەهێزکردووەو هەر لەم روانگەیەشەوەیە، کە (نالی) ئەم ستایشە زۆرەی لەو دوو شیعرەی پێشتر باسکراویدا دەکات.

لە بۆنەی چاوگێڕان بەستراکچەری رستەسازیی ئەم بەرهەمە بەپێزەدا، بەهەلی دەزانم ئەم کتێبە بکەمە بیانوو، بۆ زۆر لەو نووسەرانەی کورد، کە شێوەی داڕشتنی رستەسازییو رێنووسی کوردی نووسینیان، لە روانگەی رستەسازیی زمانی عەرەبییەوە سەرچاوە دەگرێ، کە هەردوو زمانی کوردیو عەرەبی لە رووی داڕشتنی رستەسازییەوە زۆر لە یەکتر جیاوازو نامۆن. لەبەر ئەوە خۆزگە دەخوازم رستەسازییو داڕشتنەکانیان کوردانەترو روونو رەوانو زولاڵتربێ..

با لەم بوارەدا ئەم چەند نموونەیە هەر لەم کتێبەی لەمەڕ خۆماندا بەنموونە بهێنمەوە:

١.باشتر وایە دەقەکەی نووسەر، لە پاش گۆڕینی بۆ سەر رێنووسی ئەم سەردەمە، سەرلەنوێ بخوێنرێتەوە، هەر بۆ ئەوەی خوێنەری ئازیز، خۆی ئاشنایەتی لەگەڵ شێوازی بیرکردنەوەی ئەو کاتەدا پەیدا بکات..ل٣١).

لە راستیدا چەند جارێك ئەم پەرەگرافەم خوێندەوە، ئەوسا توانیم بزانم نووسەر چی دەڵێ! لە کاتێکدا دەتوانرا ئەم پەرەگرافە بەم شێوە روونو رەوانە دابڕێژرێ: بۆ ئەوەش خوێنەری ئازیز، خۆی ئاشنایەتی لەگەڵ شێوازی بیرکردنەوەی ئەو کاتەدا پەیدا بکات، باشتر وایە دەقەکەی نووسەر (پاش گۆڕینی بۆ سەر رێنووسی ئەم سەردەمە)، سەرلەنوێ بخوێنرێتەوە.

٢.بەڵگە عوسمانییەکان-ل٣٦: بەڵگەکانی عوسمانی.

٣.بەرهەمە کوردییەکان-ل٤١: بەرهەمی کوردی= بەرهەمگەلی کوردی.

٤.ناوەندە بازرگانییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست-ل٤١: ناوەندەکانی بازرگانیی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

٥.وڵاتە ئەوروپییەکان-ل٤٢، ١٠٨: وڵاتانی ئەوروپا.

٦.سەبارەت باری ئابووری-ل٤٧: سەبارەت (بە) باری ئابووری.

٧.له ولاّته عوسمانییه‌کاندا-ل٤٧: له ولاّتانی عوسمانیدا.
٨.ئه‌فسه‌ره ئینگلیزه‌کان-ل٩٩: ئه‌فسه‌رانی ئینگلیز.
٩.جه‌نگی جیهانی یه‌که‌م-ل١٠٠: یه‌که‌مین جه‌نگی جیهانی= جه‌نگی یه‌که‌می جیهانی.
١٠.ناداد په‌روه‌ریی-ل١٠١: بێدادی.
١١.سه‌رچاوه ئینگلیزییه‌کان-ل١٢٥: سه‌رچاوه‌کانی ئینگلیز= سه‌رچاوه‌گه‌لی ئینگلیزی.
١٢.زۆربه‌ی زۆری وه‌کو دڕکی ناو ئاردی لێهاتووه-ل١٤٧: زۆربه‌ی زۆری وه‌کو ئاردی ناو دڕکی لێهاتووه. چونکه ئه‌گه‌ر (ئارد) له ناو (دڕك)دا. بڕژێ، کۆناکرێته‌وه. (پیره‌مێردی شاعیر) په‌ندی ئاردی ناو دڕکی به‌مجۆره له شیعردا به‌کاربردووه (سه‌یریش ئه‌وه‌یه شیعره‌که‌ی پیره‌مێردیش هه‌ر له‌مه‌ڕ شاری سلێمانیو بۆنه‌ی گواستنه‌وه‌ی پێته‌ختی بابانه، له قه‌لاّچوالانه‌وه بۆ (سلێمانی)و گله‌یی گواستنه‌وه‌ی پایته‌خت له سلێمانی ده‌کات:

**ئاردی ناو دڕك، چۆنه، واین ئێره**
**فه‌رموو: دوو ده‌سته دۆست هه‌ڵبژێره**
**له‌گه‌ڵ یه‌ك ناڕۆین له ڕێی راسته‌وه**
**خوا ئه‌وه بگرێ شاری گواسته‌وه!**

١.ئه‌و شیعره‌ی له لاپه‌ڕه‌کانی (٨٦-٩١) داو به‌ناوی شیعری (مه‌لا حه‌مدوون)ه‌وه راگه‌یه‌ندراوه، به‌شیعرێکی ده‌ست هه‌ڵبه‌ستی ئه‌م رۆژگاره‌ی ده‌زانم.
٢.شیعرێکی (سالم)، که بۆ (عه‌زیز به‌گی بابان)ی نووسیوه‌و له (مێژووی ئه‌ده‌بی کوردی-به‌رگی سێیه‌م)ی دکتۆر مارف خه‌زنه‌داری وه‌رگرتووه‌و له لاپه‌ڕه‌کانی (١٧٩-١٩٠)دا بلاّویکردۆته‌وه، زۆربه‌ی به‌یته‌کانی له باری (کێش)ه‌وه له‌نگ‌و له باری رێنووسیشه‌وه پڕ هه‌ڵه‌و په‌ڵه‌و بێ سه‌روبه‌رن‌و ساغکردنه‌وه‌ی زۆرتریان ده‌وێ.

**پەراوێزەکان:**

١.لەکاتێکدا هەندێ لەو میرنشینانەی دراوسێی کورد، وەك: ئاق قۆینولوو و قەرە قۆینولوو، ئەگەرچیش نامۆو نەشارەزای ئەو ناوچە تازانەش بوون‌و لە سەدان‌و هەزاران کیلۆمەتر دوورترەوەو لە ڕێگەی هێرش‌و داگیرکردنەوە هاتوونەتە ئەو ناوچانەو بەخێراییەکی سەیر، قەوارەو دەسەڵاتیان تیایاندا دامەزراندو بەو میرنشینانەشەوە نەوەستاون‌و بوونەتە دەوڵەت‌و ئیمپراتۆر!.

٢.بۆ نموونە: ئیلی جاف، لە دوای دروستکردنی شاری سلێمانی‌و لە ماوەی دەسەڵات گرتنەدەستی ئەوڕەحمان پاشای بابان (؟-١٩١٣ز)دا تێکەڵ سوپاو بەڕێوەبردنی میرنشینی بابان بوون. (بۆ زیاتر زانیاریی، بنوارە: گەشتنامەی کلودیوس ریچ بۆ کوردستان، وەرگێڕانی بۆ کوردی محەمەد حەمە باقی، چاپی سێیەم، چاپ‌و پەخشی دەزگای ئاراس.

٣.لەو ساڵەدا مەولانا خالید، دوای وەرگرتنی ئیجازەی تەریقەتی نەقشبەندی، لە هیندستان بۆ کوردستان گەڕاوەتەوە.

٤.ئەم هێزانەی کورد لە ناوەڕاستی (مانگی ١٠/١٨٨٠ز)دا، گەیشتنە (٦٠) هەزار کەس.

٥.خالفین: خەبات لە پێناوی کوردستاندا، ل١١٣، هەروەها: شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلا، لە بەڵگەنامەی قاجاریدا، محەمەد حەمەباقی، ل.٧٧

٦.امیر **نظام** گروسی: گزارشهاو نامەهای دیوانی‌و **نظامی**، بەکوشش ایرج افشار، تهران ١٣٧٣ش، ص١٩٦-١٩٧.

٧.هەمان سەرچاوە، ص٢٦٣. هەروەها: محەمەد حەمە باقی، شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلا لە بەڵگەنامەی قاجاریدا، ل.٢٣٨

٨.شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلا لە بەڵگەنامەی قاجاریدا، ل.٢٤٠

٩.بەسەرهاتووی کاکە ڕەشید شەوقی، ئامادەکردنی سدیق ساڵح، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان، زنجیرەی ١٩٥، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٣، ل٦٥-٦٦.

١٠.بێگومان وەك شاعیرێکی پێشەنگ‌و نموونەش، کە بابەت‌و باس‌و خواسی تازەو سۆزی نیشتمانیی، ئاوێتەی هەڵوێست‌و شیعری خۆی کردبوو، لای شاعیرانی ئەو سەردەمە (نالی‌و سالم‌و کوردی‌و مەشوی) چاوی لێکراوەو هەوێنی شیعری ئەویان وەك دەستەچیلە، بۆ شیعری خۆیان خواستووە، کە ئەم راستییە، شاعیرێکی وەك (سالم)، لە جیاتی (نالی‌و کوردی‌و مەشوی) ددانی پێدا دەنێ‌و دەڵێ:

لە رۆژی ئیمتیحانا دیم بەرابەر **طالب**‌و مەعشووق کە مەربەستەی هونەر هاتن، لە تیپی عیشق بازانا

لە یەك لا: نالی‌و مەشوی، لە لایێ: سالم‌و کوردی لە هەڵگامەی هونەر گەرمیی، تکا جۆ بوون لە: (مەولانا).ل٣٥

١١.بۆ زیاتر زانیاریی، بنوارە: مودەڕیس، مەلا عەبدولکەریم: یادی مەردان، بەرگی یەکەم، نامەی ژمارە (٥٢)ی مەولانا خالید (بەزمانی عەرەبی) بۆ شێخ مارفی نۆدی، ل٣٩٦-.٣٩٨

١٢.هەمان سەرچاوەی ناوبراو. نامەی ژمارە (٦١)ی فارسی، مەولانا خالید بۆ عوسمان پاشای برای مەحمود پاشای بابان، ل٢٠٩-.٢١٢

١٣.هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٤-.١٩٧

١٤.اسكندر بيگ تركمان: تاريخ عالم **آراي** عباسى، ج٢، تهران، انتشارات امير كبير، ١٣٥٠ش، ص٨٠٧-٨١٠. نصرالله فلسفى: زندگانى شا عباس اول، ج٣-٤، تهران، انتشارات علمى، ص.١١٠٢

١٥.عەلی خان گونەخان ئەفشار، شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاریدا، وەرگێڕانی لە فارسییەوە محەمەد حەمە باقی، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان، چاپخانەی دەزگای ئاراس، ٢٠٠٧، ل١٤٩-.١٥٠

١٦. نصرالله فلسفى: زندگانى شا عباس اول، ج٣-٤، تهران، انتشارات علمى، ص.١١٠٢

١٧.مێژووی ئەردەڵان، مەستوورەی کوردستانی، گۆڕینی بۆ کوردی: د.حەسەن جاف‌و شکور مستەفا. چاپی دووەم ٢٠٠٥، چاپەمەنی ئاراس، ل٣٨-٤٠. هەروەها، علی اکبر وقايع نگار كردستانى، حديقەی ناصريه در جغرافيا و تاريخ

کردستان، بەتصحیح محمد رئوف توکلی، تهران ١٣٦٤ش، ص١٣١-١٣٣و زۆر سەرچاوەی تر.
١٨.گەشتنامەی کلودیوس جێمس ریچ بۆ کوردستان (١٨٢٠ز) وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە محەمەد حەمە باقی، چاپی سێیەم، چاپەمەنی ئاراس، ل.١٤٢
١٩.هەمان سەرچاوە، ل.١٨٨
٢٠.ئەمە یەکەمین بەیتی سەرەتای ئەو شیعرەی نالییە، کە لە ستایشی سوپاکەی ئەحمەد پاشادا وتوویەتی

ئەم تاقمە مومتازە، کەوا خاصصەیی شاهن
ئاشووبی دڵی مەملەکەتو قەلبی سوپاهن —دیوانی نالی، ل ٣٤٠.

٢١.ئەلیکساندەر خۆدزکۆ، چەند لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆژی دەربارەی زمانی کوردی (دیالیکتی سلێمانی)، وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە بۆ کوردی: نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپەمەنی بنکەی ژین. سلێمانی، چاپخانەی شڤان، ساڵی ٢٠٠٥، ل.٤٩
٢٢.محەمەد حەمە باقی، کورد لە سەفەرنامەی بیانیدا، وەرگێڕان لە فارسییەوە، گۆڤاری رامان، ژمارە (٥٩)، ل٢١٠-٢١٤.
٢٣.گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان، وەرگێڕانی بۆ کوردی محەمەد حەمە باقی، ل.١٣٢
٢٤.مەسعود محەمەد: دەستەو دامانی زالی- چاپی دووەم، چاپەمەنی دەزگای ئاراس، ٢٠٠٧، ل.١١٩
٢٥.بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە، بنوارە: ئەلیکساندەر خۆدزکۆ- چەند لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆژی دەربارەی زمانی کوردی-دیالیکتی سلێمانی- وەرگێڕانی بۆ کوردی: نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپەمەنی بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٢٦.نەوشیروان مستەفا ئەمین: میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی رۆمو عەجەمدا، چاپی دووەم، چاپەمەنی خاك، سلێمانی ١٩٩٨ز، ل١٦٨.

# هێمن موكريانی

# و

# ڕۆژنامەی كوردستان (١٩٥٩-١٩٦٣)

سەرنج: ئەم وتارە کە لە ژمارە (٢٦)ی گۆڤاری (ڕۆژنامەنووس)دا بڵاوبۆتەوە، هەڵەی زۆر و پەلەپەل و شپرزەیی بەسەردا هاتبوو، بۆیە بەشێکی هەرەزۆری(لە نیوەی زۆری) لێ پەڕیو و ناتەواو چاپکرابوو. لەبەرئەوە بە پێویستمان زانی سەرلەنوێ هەڵەگیریی و ڕاستکردنەوە و ناتەواوییەکانیشی پێ زیاد بکەینەوە.

* * *

لە دوای شۆڕش، یان کودەتای (١٤ی تەمووزی١٩٥٨)ی عێراق، کە رژێمی ئەو سەردەمەی عێراق، لەلایەن ژەنەراڵ عەبدولکەریم قاسم و چەند ئەفسەرێکی سوپای عێراقەوە، رووخێنرا و رژێمی کۆماریی هاتە جێی و ئازادیی بەزیندانییانی سیاسی و رۆژنامە و گۆڤار و چاپەمەنی و کاری ئاشکرای حیزبایەتی و سەندیکاکانی کرێکاران و پیشەکارانی تری نەتەوەکانی عێراق دراو گەلانی عێراق هەوایەکی ئازادیان هەڵمژی و لەماددەی (٣)ی **دەستووری کاتیی** عێراقیشدا، ددان بەوەدانرا، کە گەلی کوردی عێراق، لەگەڵ گەلی عەرەبی عێراقیدا، هاوبەش و برایەو بەمەش سەر لەنوێ باس و خواسی ئازادی و مافەکانی گەلی کورد لە عێراق و دەرەوەی عێراقیشدا هاتنەکایە و بەشێکیش لەم باس و خواسانەی ماف و ئازادی کورد و تروسکانەی هیوا، لە خۆرهەلاتی کوردستانیشدا دەنگدانەوەو زەبری خۆی نواند و بەم هۆیانەوەو لە بەرامبەر ئەمانەدا، رژێمی پاشایەتی ئێرانیش، بۆ ڕاگرتنی لەنگەری داروباری ناوخۆی ئێران و پاراستنی ئاسایش و ئارامیی کوردستانی ئێران و بۆ ئەوەش ئەو رژێمە ، لە وەڵامی ئەو گۆڕانکاریی و ئازادییانەی لە عێراقدا بۆ کوردانی باشوور، سەریان هەڵداوە و هاوکات بۆ ئەوەی هەر بە رواڵەت بە کوردانی وڵاتەکەی خۆی و میدیاکانی جیهانیش بڵێ کە کوردانی خۆرهەلاتیش مافی روناکبیریی و ئازادیی دەربڕینیان هەیە، بۆیە هەشت ـ نۆ مانگێك دوای ئەم رووداوانەی عێراق، ساڵی (١٩٥٩)، بە چاکی زانی رۆژنامەیەك بە زمانی کوردی و بۆ چەندین بابەتی هەمەلایەنەی کوردەواریی دەربکات. بۆ ئەمەش بە هاوکاریی چەند نووسەرێکی کوردانی خۆرهەلات، رۆژنامەیەکیان بە ناوی (کوردستان)ەوە دەرکرد.

ژمارەی یەکەمی ئەم رۆژنامەیە (کوردستان)، لە رۆژی چوارشەممە: ١٥ی مانگی گوڵانی ٢٥٧١ی کوردی، بەرامبەر بە مێژووەکانی: ئۆردیبە هەشتی ١٣٣٨ی هەتاویی، شەووالی ١٣٧٨ی کۆچی، ٦ی نیسان (مەی) ١٩٥٩ی زایینی، چاپ و بڵاوبووەوە، کە دەستەی نووسەرانی بنەڕەتیی رۆژنامەکە بریتی بوون لە:

١ ـ عەبدولحەمید بەدیع زەمانی، خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری لێپرسراو
٢ ـ دکتۆر محەمەد سدیق موفتی زادە ـ سەرنووسەر
٣ ـ عەبدولڕەحمان موفتی زادە ـ نووسەر
٤ ـ ئەحمەد موفتی زادە ـ نووسەر
٥ ـ عابید سیراجوددینی ـ نووسەر
٦ ـ شوکرولڵای بابان ـ نووسەر
٧ ـ خوسرەو شێخکانلووی میلانی ـ نووسەر

ئەم رۆژنامەیە بۆ ماوەی چوار ساڵ چاپ و بڵاوبۆتەوە، کە مەکۆی بڵاوکردنەوەکەی شاری تاران بووە و ئەمەش ناوونیشانی یانەکەی بووە: مەیدانی بەهارستان ـ شەقامی سەفی عەلی شا، پلاکی ژمارە (٢١٨)، ژمارەی تەلیفۆن: ٣٢٠٠٣.

لە ماوەی ئەو چوار ساڵەشدا (٢٠٩ دوو سەد و نۆ) ژمارەی لێ دەرچووە و هەروەك یەکەمین ژمارەی لە مانگی نیسانی (١٩٥٩ز)دا دەرچووە، بەڵام دوای چوارساڵ دەرچوونی و دوای رووداوە خێراکانی پاش (١٩٥٨) و سەرەتای دەرکەوتنی پەشیمان بوونەوەی رژێمی عەبدولکەریم قاسم، لە بەڵێنەکانی بەرامبەر مافە رەواکانی کورد و هێرشی راگەیاندنەکانی شێفینیزمانی عەرەبیی دژی کێشەی کورد و قەدەغەکردنی کاری سیاسی و داخستنی رۆژنامە و گۆڤاری کوردی لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ و هێرشی راستەوخۆی سوپای عێراق لە ئەیلوولی (١٩٦١)دا بۆ سەر کوردستان و کاولکردنی گوند و ئاواییەکانی کوردستان، هەموو ئەمانەش تەقەللا بوون بۆ کپکردنی هەموو مافێکی کورد، بۆیە رژێمی (شا)ش هاوتەریب لەگەڵ رژێمی عێراقدا بۆ کپکردنی دەنگی کورد، لە دەرکردنی رۆژنامەی **کوردستان** پەشیمان بووەوە و لە مانگی نیسانی (١٩٦٣)دا، بڕیاری داخستنی رۆژنامەکەیان دەرکرد.

ئەم رۆژنامەیە، لە ماوەی چوارساڵ دەرچوونیدا بەو هۆیەوە کە لە لایەکەوە دەستەیەکی روناکبیری گەورە و قەڵەم بە بڕشتی کورد، هەڵیان سووڕاندووە، باس

و خــواس و بابــەتی هەمــەجۆرەی زۆر دەوڵەمەنــد و بایەخــداری بوارەکــانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی، کۆمەڵایەتیی، ئــابووریی، زمانــەوانیی، شوێنەوارناسـیی، کەلەپووری تێدا بڵاوبۆتەوە، لە لایەکی تریشەوە و بەو هۆیەوە کە ئــەم رۆژنامەیــە لەو قۆناغەدا و دوای جوانەمەرگ کردنی **کۆماری کوردستان** (١٩٤٦) لە **مەهاباد** و دوای کپکردن و قەدەغەکردنی گۆڤار و رۆژنامە و نووسـین بــە زمــانی کــوردی، تاکانە رۆژنامە و تاکانە دەرەتانێك بووە تا نووسەران و روونــاکبیرانی خۆرهــەڵاتی کوردستان، بە هەلی بزانن و بە ئاشکرا بەرهەم و بابەتی خۆیانی تێدا بڵاوبکەنەوە، بۆیە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا، زۆرترین نووسەر، لــە هــەموو ناوچــە جیاجیاکــانی کوردستانی ئێرانەوە(بەتایبەتی)، بێ پسانەوە بەرهەمی هەمــەجۆرەی بــۆ بنێــرن و بەمەش هەموو شێوە دیالێکت و بن دیالێکتەکانی زمانی کوردی تێدابڵاوبۆتــەوە، کە لەم بوارەدا دەبێ بڵێین ئەم رۆژنامەیە یەکەمین رۆژنامە و یەکەمین تەقەللایە بۆ بڵاوکردنەوەی هەموو شێوەزار و بن زارەکانی زمــانی کــوردی و لــەم پێنــاوەدا بــۆ هەریەکە لەم زاراوە و بن زاراوانە، لاپەڕەی سەربەخۆ و تەوەر و ستوونی تایبەتییان بۆ تەرخانکردووە و ئەمەشیان لەو روانگە و مەبەستەوە کردووە، تا بەهەر شێوە و دنەدانێك بێت، نووسەرانی بەشــە جیاجیاکــانی کــوردانی خۆرهــەڵات بجــوولێنن و خۆیان بکەونە نووسین و زیندووکردنەوەی زمان و کەلەپووری ناوچــەکانی خۆیــان و لەم رێگایەشەوە لە لایەکەوە گەلێ نووسەری شێوەزار و بن زارەکانی تری کــوردانی خۆرهــەڵات بــاس و بابــەت و لێکۆڵینــەوەی بایەخــداریان لــە رۆژنامەکــەدا بڵاوکردۆتەوە، کە شایانی ئاوڕلێدانەوەن. لە لایەکی تریشەوە، هەر ئــەم دنــەدان و هاندانــەی نووســەرانی ناوچــە و شــێوەزارە جیاجیاکــانی خۆرهــەڵاتی کوردســتان، زەمینەی بۆ ئەوە خۆشکرد، تا نووسەران و دڵســۆزانی ئــەو ناوچــە و شــێوەزارانە، دەستنووسی دێرینەی سەدان ساڵەی پارێزراوی شیعری ناوچــەکانیان و کەلــەپوور و فۆلکلۆرێکی فرە دەوڵەمەندیان بەرچاوخستووە و بۆ رۆژنامەکەیان نــاردووە و لــەم بوارەدا سامانێکی زۆر بەنرخیان لە رێگــەی رۆژنامەکــەوە، بەرچــاوی خوێنــەران و لێکۆڵەران خستووە. هاوتەریب هەر بەم کارەی رێگەخۆشکردن بۆ نووسین بە زاراوە و بن زاراوەکانی زمانی کوردی، ئەم دەســتە نووســەرانەی رۆژنامــەی **کوردســتان**، جگە لەوەی گەلێ نووسەری نەناسراویان بەرچــاو خســتووە، لــە هــەمان کاتیشــدا

دەڤەر و قەڵەمڕەوی نووسینیان بە زمانی کوردی، لەو شێوەزارە سنووردار و ناسراوە، هەراوتر و فراوانتر کرد، کە پێشتر و لە ئەزموونی رۆژنامەی (**کوردستان**)ی زمانحاڵ و ئۆرگانی **کۆماری کوردستان**، لە مەهاباددا قەتیس بووە و زۆرتر هەر بە دیالیکتی (**سۆران**)، یان (**موکریان**) چاپ و بڵاودەبۆوە.

هەر ئەم کاری هاندانەی نووسەرانی ناوچە جیاجیاکانی خۆرهەڵاتی کوردستان، کارێکی کرد زۆربەی نووسەرانی خۆرهەڵاتی کوردستان، بەتایبەتیش نووسەرانی هەرێمەکانی **سنە، ئەردەڵان، کرماشان، هەورامان، لوڕستان،** بەشداریی و هاوکاریی نووسینی رۆژنامەکە بکەن، کە بۆیەکەمین جار نووسەرانی شاری(**سنە**)، نەك هەر بە (**شیعر**)، کە لەناو نەتەوەی کوردا، پێشەنگی بێ یەك و دووی هەموو ژانرەکانی تری ئەدەبی یە، بەڵکو بە (کورتە چیرۆك) بەرهەمیان تێدا بڵاوکردۆتەوە و ناوە درەوشاوەکانی ئەم بوارەش، تا ئێستا زۆر کەم لای چیرۆکنووسانی کوردستان ناسراون. هاوکات نووسەرانی تری ناسراو، وەك **مامۆستا سەیید تاهیری هاشمی، هەژار**(١٩٢١-١٩٩١)، **هێمن** (١٩٢١-١٩٨٦)... بەشداریی راستەوخۆ و بەردەوامیان لەگەڵ ئەم رۆژنامەیەدا نەپساندووە.

لەم رووەوە ئەوەندەی بابەتگەلی ئەدەبی (دەق، لێکۆڵینەوە، وەرگێڕان)، مێژوو، زمانی کوردی، لە رۆژنامەکەدا گرنگییان پێ دراوە ئەوەندە باس و خواسی سیاسەت لە رۆژنامەکەدا زەق نەکراوەتەوە و هەر تەنیا رووبەری لاپەڕەی یەکەم و چەند ستوون و نیوە لاپەڕەی سەر رۆژنامەکەی داگیرکردووە.

لە دەرەوەی کوردستانی خۆرهەڵاتیش، نووسەرانی کورد، لە شارەکانی کوردستانی باشوور و بەغداد و وڵاتانی ئەورووپاوە نامە و نووسینیان بۆ ئەم رۆژنامەیە ناردووە و پێوەندییان لەگەڵدا بەستووە و دەستخۆشیی و هاوکارییان کردووە.

سەر لەبەری ژمارەکانی هەر چوارساڵی ئەم رۆژنامەیە (**کوردستان**)، کە لەدەمێکەوە لەلایەن شاعیری ناسراوی شاری سەقز مامۆستا نافیع مەزهەر — شپرزە(١٩١٤-١٩٩٨)ەوە بەشێوەیەکی زۆر دڵسۆزانە، پارێزراو و راگیرابوون و ژمارەکانی هەر ساڵێکیش بە جیا، جزوبەند (تەجلید) کرابوون و بەرێزیشیان بەو بۆنەیەوە کە لەماوەی مانەوەی درێژ خایانی نووسەری ئەم چەند لاپەرەیەدا،

لەشاری (**سەقز**)، ئاشنایەتی و پێوەندیمان پەیداکردبوو، پێ سپێریی بنەماڵەکەیانی کردبوو، کە دوای مەرگی خۆی، ژمارەکانی رۆژنامەی (**کوردستان**) بەمن بسپێرن و بنەماڵەکەشیان بە سوپاسەوە هەر وایان کردو ئێستا نزیکەی (١٣) ساڵێك دەبێ، ئەو ئەمانەتە بەلای منەوەیە و منیش لە دوای گەڕانەوەم بۆ هەولێر، کاتێ برایانی (بنکەی ژین)ی خۆشەویست، زانیان ژمارەکانی رۆژنامەی (کوردستان)لای منە، داوایان لێم کرد رێگە بەوان بدەم سەرلەنوێ چاپی بکەوە، کە ماوەیەکە بنکەی ناوبراو ئامادەی چاپیان کردووە و لەماوەیەکی کورتدا، لەگەڵ ئەکادیمیای کوردستان، وەك پرۆژەیەکی هاوبەش ، چاپ وبلاوی بکەنەوە.

لەماوەی ئەم چەندین ساڵەدا، کە ژمارەکانی رۆژنامەی (**کوردستان**) بەلامەوە بوون و ناوبەناو لە زۆر دەرفەتدا بابەتە جۆربەجۆرەکانیم بەسەر کردوونەتەوە و لای هەندێکیشیان لەنگەری راگوزاریی و لای نووسینە بە پێزەکانی وەك نموونەی دکتۆر محەمەد سدیق موفتی زادە(١٩١٥-١٠٨٤)ش بەتایبەتی لەنگەر و هەڵوێستەی درێژم گرتووە، کە دیارترینیان لێکۆڵینەوە بەنامێکەی ناوبراوە، لەسەر شاعیری گەورە: **مەولەوی تاوەگۆزی**[١]، جگە لەم لێکۆڵینەوەیەی، لێکۆڵینەوەی قووڵیشی لەسەر (**باباتاهیری هەمەدانی**) و (**زمانی کوردی**) کردووە.[٢]

بەڵام وەك پێشتر وتمان رژێمی ئێران، هەر بە ڕواڵەت بانگەشەی باس و خواسی ماف و ئازادیی رووناکبیری کوردیی، لە رۆژنامەی (**کوردستان**) دا، بۆ میدیاکانی دەرەوەی وڵات و بەتایبەتیش بۆ راگەیاندنەکانی وڵاتانی ئەوروپا مەبەست بوو، کە لەو کاتەدا چالاکی (**کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد**) لە ئەوروپادا، لەو پەڕی گەشەسەندن و ناساندنی کێشەی کورد بوو بە وڵاتانی ئەوروپادا، نەك ئاڵوگۆڕێکی راستەقینە و بنەڕەتیی لەناوخۆی کوردستانی ئێران و خاوکردنەوەی ئابلۆقە لەسەر زمان و ئەدەب و رووناکبیریی کوردیی ... تەنانەت ئەم رۆژنامەیەی (کوردستان)یش، کە گوایە بەڵگەونیشانەی ماف و ئازادیی دەربڕینی رووناکبیرانی کوردانە، کەچی وەك کوردانی خۆرهەلات دەیگێڕنەوە، ئەگەر خودی رۆژنامەی (**کوردستان**)یش، لەناوخۆی کوردستانی ئێراندا، بەدەست کەسێکەوە ببینرایە، کەسەکەیان دەگرت و لە زیندانیان دەنا!.. بەواتەیەکی تر: خوێنەرانی چاپەمەنی

کوردی یان لە ژێر سانسۆر و گوشاری دەسگای (**ساواك**)دا دادەنان و چاودێریی جموجووڵیان دەکردن. کە هەر لەسەروبەندی دەرچوونی رۆژنامەی (**کوردستان**)دا، شاعیرێکی ناوداری وەك (**هێمن**)، لە بیرەوەریی خۆیدا دەیگێڕێتەوە[٣]، دوای جوانەمەرگ کردنی (کۆماری کوردستان)، لەوپەڕی تەنگ پێ هەڵچنین و ژێر گوشارو ترساندن و لێپێچینەوەی دەسگای (ساواك)ی ئەو سەردەمەدا بووەو تا مێژووی دەرچوونی ئەم رۆژنامەیەی _کوردستان — ١٩٥٩)، دووجار ناچارکراوە ماڵ و منداڵ و زێد و نیشتمانی خۆی بەجێ بهێڵێ و روو لە ئاوارەیی بکات، کە جاری یەکەمیان لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٧ و جاری دووەمیش ساڵی (١٩٥٩)بووە..[٤] کەچی لەلایەکی ترەوە و هاوکات هەر لەسەرەتای دەرچوونی رۆژنامەی(کوردستان)ەوە، پەیتا پەیتا رۆژنامەی (**کوردستان**) یان بۆ (**هێمن**)، بۆ (مەهاباد) ناردووەو داوای هاوکاریی و بەرهەمیان لێ خواستووە!. (**هێمن**)یش پاش دوو مانگ کەمتر لە مێژووی دەرچوونی رۆژنامەی (**کوردستان**) ەوە، سەروپێوەندی لەگەڵ گرتوون و نامە و بەرهەمی بۆ ناردوون و لە دووتوێی (هەندێ) لەو شیعر و نووسینانەشدا، سووکە باج و گومرگێکی وەك لە کۆڵ خۆکردنەوە و هێورکردنەوەی ئەو گوشارەی لە سەریّتی، لەو بەرهەمانەی ئاخنیۆن، کەمن لێرەدا هیچ داکۆکی و پاکانەیەکم بۆ ئەو جۆرە باج و گومرگ و هەڵوێست و بەرهەمانەی(**هێمن**) نییەو (**هێمن**)یش خۆی دواتر و دوای کۆکردنەوەو رێکخستن و چاپی یەکەمی دیوانی شیعرەکانی خۆی بەناوی (**تاریك و روون**)، کە شەهید قاسملوو پێشەکی بۆ نووسی و (**هێمن**)یش بە پەخشانێکی یەکجار بەرز و شیرین و ناوازە، چمکێکی مێژووی خۆی و دەڤەرەکەی، کردە سەرەتای (**تاریك و روون**)، خۆی لە هەندێ لەو شیعر و نووسینیانە نەبان کرد، یان خۆی بوارد، کە لە باری ئەدەبییەوە لاوازن، یان وەك باج و گومرك لە رۆژنامەی (**کوردستان**)دا بڵاوبوونەتەوە و لە (**تاریك و روون**)دا چاپی نەکردنەوە.

بەدەم بەسەرکردنەوەی رۆژنامەی(کوردستان)ە وە، لە (٣١)سی و یەك ژمارەی رۆژنامەکەدا، بەرهەمی نووسین و شیعری (هێمن)م بەرچاوکەوتن. ئەو(٣١) ژمارەیەش بە پێی زنجیرەی بڵاوکردنەوەیان ئەمانەن:

١.  ژمارە (٧) ل٤: شیعری: (کچی مەهاباد)
٢.  ژمارە (١٢) ل٤: شیعری: (بانەمەڕ) ـ بەشی یەکەم.
٣.  ژمارە (١٣) ل٤: شیعری: (بانەمەڕ) ـ بەشی دووەم.
٤.  ژمارە (١٤) ل٤: شیعری: (بانەمەڕ) ـ بەشی سێیەم
٥.  ژمارە(٩٣)، ل٩،٢، شیعری: (بەهاری بێ خەزان).
٦.  ژمارە(٩٥)، ل٤، ٩، شیعری (ڕۆڵەی ماد).
٧.  ژمارە(٩٦)، ل٩،شیعری: (زیپکی شاهانە)، (دڵی شاعیر)، (خونچەی سیس).
٨.  ژمارە(٩٧)، ل٣، شیعری: (بەهاری لادێ) و ل١٩(نامە).
٩.  ژمارە(٩٨)، ل٣، ٦، شیعری: (کۆچی یار).
١٠. ژمارە(١٠٠)، ل٣، شیعری: (بلوێری شوان)
١١. ژمارە (١٠٦)، ل٢، نامەی هێمن بۆ ڕۆژنامەی کوردستان.
١٢. ژمارە (١٠٧) ل(٤ ـ ٩)، شیعری (چارەنووسی شاعیر).
١٣. ژمارە (١٢٢) ل (٣ ـ ٤)، شیعری (ماچی شیرین).
١٤. ژمارە (١٢٣) ل١٠، شیعری (کەمتەرخەمی).
١٥. ژمارە(١٣٠)، ل٢، وتار و نووسین.
١٦. ژمارە(١٣١)، ل٧، ١١، نامە، وتار (پاشماوەی ژمارەی پێشوو).
١٧. ژمارە(١٣٢)، ل١١، (پاشماوەی وتاری ژمارەی پێشوو).
١٨. ژمارە (١٣٣)، ل٤، دوو پارچە شیعر.
١٩. ژمارە(١٣٤)، ل١٢، (شیعر).
٢٠. ژمارە (١٣٨)، ل٨، شیعر.
٢١. ژمارە (١٤٣)، ل٣، شیعر.
٢٢. ژمارە(١٧٢)، ل٣، ١٠، (نامە و شیعر)
٢٣. ژمارە (١٧٣)، ل٢، پاشماوەی وتاری ژمارەی پێشوو، لەگەڵ شیعری: (سایەی غەم).
٢٤. ژمارە(١٧٤)، ل (٣، ٤)، شیعری: (خاوەنی زێڕ).
٢٥. ژمارە (١٧٥) ل١١، شیعری (ئارەزووی فڕین).
٢٦. ژمارە(١٨٤)، ل(٤، ٩، ١٠) (چیرۆکی وەرگێڕاو).

٢٧. ژماره (١٨٥) ل٦، شیعری (کیژی لادێی).
٢٨. ژماره (١٨٦) ل٣، شیعری (تۆم هەر لە بیرە).
٢٩. ژماره (١٨٧) ل (٣، ١٠)، شیعر.
٣٠. ژماره (١٩٤)، ل١١، شیعری (گێژەڵووکەی خەزان).
٣١. ژماره (٢٠٠)، ل١١، شیعری (شینی گۆران)ی شاعیر.

لەو (٣١) ژمارەیەی رۆژنامەی (کوردستان)دا، کە نامە و نووسین و شیعری (هێمن)یان تێدا بڵاوبۆتەوە، ئاماژە بە ناونیشانی ئەوانەیان دەکەین، کە لە (**تاریك روون**)[5] دا بڵاوبۆتەوەو ئاڵوگۆڕ لە ناوونیشان و ژمارەی بەیت و دارشتنەوەی تازەیان بەسەردا هاتووە و (هەندێ) لەوانەشیان کەلە(**تاریك و روون**)دا بڵاوبوونەتەوە.

١ ـ ژماره (٧) ل٤: شیعری (کچی مەهاباد). ئەم شیعرە لە رۆژنامەی (کوردستان)دا (١٠) بەیتە و لە (بارگەی یاران، ل٩٧)دا (٨) بەیتە، کە بەیتی (٣) و (٥) رۆژنامەی کوردستان، لە (بارگەی یاران)دا نین و ئەمانەن:

١ ـ لە کوێ وەك من دەزانێ: چەندە شیرین و رەزا سووکی
کەسێکی تۆی لە رێ بازا، لە ژێر چارشێوی رەش دا دی؟
٢ ـ دڵی سەد عاشقت کردە نیشانەی تیری موژگانت
کچی کوردی، لە تیر ئەندازیا، مەعلوومە ئوستادی

٢ ـ ژماره (١٢) ل٤، شیعری (بانەمەڕ)، بەشی یەکەم، بەڵام لە (بارگەی یاران، ل٩٨)دا، ناوونیشانی ئەم شیعرە بۆتە (بەهاری کوردستان).
٣ ـ ژماره (١٣)ل٤، شیعری (بانەمەڕ)، بەشی دووەمی.
٤ ـ ژماره (١٤) ل٤، شیعری (بانەمەڕ)، بەشی سێیەمی.
٥ ـ ژماره (٩٣) ل٩، شیعری (بەهاری بێ خەزان)، ئەم شیعرە لە دیوانی (تاریك و روون)دا نییە دوای ساڵ و نیوێك دابڕانی (هێمن) لەگەڵ رۆژنامەی (کوردستان)دا، دووبارە لە مێژووی ئەم ژمارەیە بەدواوە، سەرو پێوەندی (هێمن) لەگەڵ ئەم رۆژنامەیەدا دەست پێدەکاتەوە و رۆژنامەکەش لە بەرامبەر ئەم

سەرلەنوێ پێوەندییەی (هێمن) لەگەڵیدا، ئەم پێشەکییەی لەلاپەڕە(٢) دا نووسیوە:

برای زاناو هۆنەر و بەڕێز کاك سەیید **محەمەد** ئەمین شیخ الاسلامی

لەسەرەتای دەرچوونی ڕۆژنامەوە — کە نامە جوانەکەت لەگەڵ ئەو هەموو شوێنە[٦] بە نرخانەدا بۆ ناردووین — ئێمە بەدڵ و گیان هەمیشە چاوەڕوانی گەیشتنی نامە جوانەکانی تۆ بووین وە ڕۆژنامەمان بەهەر ناونیشانێ بۆت ناردووە، گەڕاوەتەوە، زۆر سەرمان سوور مابوو، کە چۆن ئەبێ ئەستێرەیێکی رووناکی وەکو تۆ، لە ژێر هەوری چڵکنی گومناوی دا داپۆشرێ، وە کەسێ نەیناسێ، تا لەم دواییەدا بە ناونیشانی: (مهاباد، **آقای** سلێمان خان أمیری، کارمند بازنشتەی فرهنگ) ڕۆژنامەمان بۆ ناردی.

ئێستا کە لە پاش نزیکەی دووساڵ دیسان ئێمەت بە ناردنی نامە جوانەکەت و گەلێ هەڵبەست و هۆنراوەی بەنرخ سەربەرز کردووە، وادەی ناردنی وتار و هەڵبەستی ترت پێمان داوە، زۆر کەیف خۆش بووین، وە هیوامان وایە ئەم هاوکاری ئێوە، درێژەی ببێ.

نووسەرانی ڕۆژنامەی (**کوردستان**) بە هاوکاری وەها مرۆێکی زانا و نیشتمان ویست و خوێن خاوێن شانازی ئەکەن وە سەربەرزیی و پیرۆزییتان لە یەزدانی مەزن داوا ئەکەن.

مامۆستا گیان! بە راستی هەموو هەڵبەستەکانت بۆئەوە چاکن کە بە ئاوی زێڕ لەسەر تەختەی زیوەوە بنووسرێ، وە بۆ شانازیی و سەربەرزیی هەموو کوردێ هەتا هەتایە بمێنێتەوە. بەڕاستی ئێوە ئەستێرەیەکی رووناکن کە لە ئاسمانی وێژەی کوردیدا ئەدرەوشێتەوە وە دونیایێ بە پرشنگی جوانی شوێنە بەنرخەکانی خۆتان رووناك ئەکەنەوە. خودا بتانپارێزێ بۆ هیوادریی ئێمە و هەموو برا کوردە نیشتمان ویستەکان.

ئەوا لەم ژمارەوە دەس ئەکەینەوە بە بڵاوکردنەوەی گەوهەرە هۆنراوە بەنرخەکانتان کە بە دیاری بۆ ڕۆژنامەی (کوردستان)ت ناردووە، وە بە کڕیارانی پڕ بایی وێژەی کوردی یان ئەنوێنین[٧].

٦ ـ ڕۆڵەی ماد: شیعر، ژمارە (٩٥، ١٩٦١/٣/١)، ل٤، ٩. ئەم شیعرە لە **تاریك و روون** دا نییە:

کوردە! تۆ رۆڵەی دلێرانی — زادەی خاکی پاکی ئێرانی
ئاریایی نەژاد و خوێنپاکی — چاونەترس و بە جەرگ و بێ باکی
فەرخەی[8] شێری رۆڵەی مادی — نەبەز و سەربڵند و ئازادی
رۆژی سەخت و بەترس و تەنگانە — قەت نەترساوی تۆ لە بێگانە
ئیمتیحانی شوجاعەتت داوە — نەتەویی[9] قەت بە تۆ نەوێراوە
لەسەر ئەو خاکە، خوێنی پاکت رشت — نەبوو جارێ بکەی لە دوژمن پشت
لە پەلاماری دوژمنی ناڕاست — ئەو سنوورەت بە خوێنی خۆت پاراست
تۆ لە ڕێی ئیفتیخاری ئێرانا — لە هەموو عەسرێکا سەرت دانا
زەربی شمشێری تۆی ئەگەر نەدەچێشت — ((گزنەفۆن)) خاکی تۆی بەجێ نەدەهێشت
تۆ وەشاندت لە ئەرمەنا شمشێر — هەم لە یۆنان و ئاسیای سەغیر
تۆ بەئمری شەهنشەهی مەشهوور[10] (ئاشوور) — چوویتە مەیدانی (کەلدە) و
تۆ چەقاندت لە (بابل)ی وێران — پەرچەمی فەخر و قودرەتی ئێران
ئەوبەری (دەجلە) و کەناری (فورات) — کوردە! کوڕژنی ئەسپی تۆی لێ هات
تۆ لەگەڵ پادشاهی ساسانی — چوویتە (مصر) و (یەمەن) بە هاسانی
دۆخی شمشێرێ تۆ لە میسر و شام — حیفزی کردووە شەعائیری ئیسلام
تۆ نەگەییاتە عەرسەیێ مەیدان — دەنگی ناقووس دەهات لە باتی نەزان
زیپك و ئازایەتی (صلاح الدین) — دینی ئیسلامی گرتەوە بە یەقین
تۆ قبووڵت نەکرد نەنگی شکست — تۆ بەری هێرشی سەلیبت بەست
هەموو سەربازی (نادری)ی کورد بوون — بۆیە وا دوژمنی بەدەست و بردبوون
کورد بوو، ئەفغان و ئۆزبەکی تاراند — سوور و ساتی[11] لە (ہمبی)[12] ئەستاند
ئێستەکەش بۆ وەتەن وەفاداری — حازری بۆ هەموو فیداکاری
تاکو ئێران ہمێنێ، تۆش ماوی — سەر و ماڵت بنێ لە پێناوی
وون مەکە شوێنی باب و باپیرت — بوەشێنە لەسەر وەتەن شمشێرت
بەو هەموو زیپك و غیرەت و هێزە — وەتەنی ئاریا بپارێزە

((سەید محەمەد ئەمین شێخ الاسلامی ـ هێمن))

٧ ـ ژماره (٩٦)، ل٩، سێ شیعری (هێمن)ی تێدایە:

١ ـ دڵی شاعیر: ئەم شیعرە لە دیوانی (بارگەی یاران)ی سەرجەمی شیعری هێمن، ل١٨٥دا هەیە.

٢ ـ خونچەی سیس: ئەم شیعرەش لە دیوانی (بارگەی یاران)، ل ١١٠ ـ ١١دا هەیە.

٣ ـ زیپکی شاهانە: ئەم شیعرە لە (تاریك و روون) و (بارگەی یاران)یشدا نییە.

٨ ـ ژمارە (٩٧)، ل٣، شیعری (بەهاری لادێ)، ئەم شیعرە لە دیوانی (بارگەی یاران)، ل٦٦دا هەیە، هەر لە لاپەڕە (١٩)ی ئەم ژمارەیەدا، نامەی (هێمن) هەیە، کە ئەمە بەشێکی پێشەکی نامەکەیە:

سەرەتا، رۆژنامەکە ئەم چەند دێڕەی بۆ نامەکەی (هێمن) نووسیوە:

هۆنەری زمان پاراوی بیرتیژی دڵ رووناکی کورد، کاك سەید محەمەد ئەمین شێخ الاسلامی (هێمن)، نامەیەکی زۆر گەرم و گوڕی بۆمان ناردووە، وە لەبەرئەوە کە مەبەستەکانی ئەم نامەیە لە چاوی وێژەیی و کۆمەڵایەتییەوە، زۆر شیاوی چاودێریی و خوێندنەوەیە، کورتەیەکی بۆ خوێنەرە بەرێزەکان لە چاپ ئەدەین:

**«.. من لەوانەنیم کە دەگەڵ دوو قسەی لەتوپەتم کردو دوو شیعری لەنگ و لوێرم وت، پێم وابێ کە دونیا لە شەرافەتی منەوە دروست کراوە، وە چاوەڕوان بووم گەلەکەم دەستی رابگرێو ئەمن بەسەریدا بڕۆم، وەهەتا مابم کارێکی نەکا دڵم گەردێ بگرێ، وە پاش مردنیشم کۆتەڵم بۆ بڕازێنێتەوە، وە گومبەزم لەسەر گۆڕیان بۆ دروست بکاو ....**

**.. بەڵکو ئامانجم ئەوەبووە ئیستیعدادی خودادای خۆم، کەم یا زۆر، لە رێگای خزمەتی گەل و نیشتمانەکەم بەکار بهێنم، وە لە بەرانبەری ویجدانی خۆمەوە شەرمەزار نەبم. جا خەڵك کردەوەی منی پێ بەکەڵك بووە، یانە، کەیفی خۆیەتی..**

**..ژیانی خسوسیم خۆش بێ یا ناخۆش، تاڵ بێ یا شیرین، ئێستا خۆم گەلێك بەختەوەرو سەربەرز دەزانم کە لەسایەی.......»**

٩ ـ ژماره (٩٨)، ل٣: شیعری (گریانی نیوەشەو). ئەم شیعره له (بارگەی یاران)، ل ١٠٨ ـ ١٠٩دا بڵاوبۆتەوه. هەروەها: ل٦، شیعرێکی چوارینه به ناوی: (کۆچی یار). ئەم شیعرەش لەگەڵ چەند چوارینەیەکی تردا، له **بارگەی یاران**، ل(١١٧)دا، چوارەمین ئەو شیعرەیه، که ناوی نراوه: (موو ناپسێنم).

١٠ ـ ژماره (١٠٠)، ل(٣)، شیعری (بلوێری شوان)، ئەم شیعره له (بارگەی یاران)، ل(٨٨)دا هەیه. هەر له ژێر ئەم شیعرەدا، شیعرێکی تر به ناوی: (گۆمی خوێن) بڵاوکراوەتەوه، ئەم شیعرەش له (بارگەی یاران)، لاپەڕە (١١١)دا هەیه. سەیر ئەوەیه ئەم شیعره لەم ڕۆژنامەیەدا به ناوی شاعیری شاری (سەقز)، مامۆستا (نافیع مەزهەر ـ شپرزه)ەوه بڵاوبۆتەوه.

١١ ـ ژماره (١٠٦)، ل٢، نامەی هێمن بۆ ڕۆژنامەی کوردستان، به بۆنەی بڵاوکردنەوەی شیعرێکی (هەژار موکریانی)، بەناوونیشانی (کارخانەی قەندی، یا: سیلسیلەی مەشایخی نەقشبەندی)، که له ژماره (١٠٢) ل (٤، ٩، ١٠) و ژماره (١٠٣) ل (٣، ١٠)ی ڕۆژنامەی کوردستاندا بڵاوبۆتەوه و هێمن سوپاس و دەستخۆشیی له ڕۆژنامەکه دەکات و ئەمەش دەقی نامەکەیەتی:

# دیاری خوێنەران

# نامەی (هێمن)

"زۆر جێگای شانازییە، رۆژنامەی خۆشەویستی کوردستان کە ئەستێرەی گەش و روناکی هیوای هەموو کوردێکی پاك و دڵسۆز و شاهدۆست و نیشتمان ویستە، رۆژنامەی کوردستان کە ئاڵا هەڵ گری کورد و ناسیونالیزمی ئێرانە رۆژ بە چاکتر و تەواوتر دەبێ و خزمەتی گەورەتر بە مەبەستی خاوێن و ئامانجی بەرزی کوردستانی ئێرانی دەکا".

وادیارە، کە کاربەدەستانی ئەو رۆژنامە لە رێگای پەرەپێ دانی رۆژنامەکەیان و لە پێناوی خزمەتی گەل و نیشتمان دا، خۆیان بۆ هەموو چەشنە تێ کۆشان و فیدارکارێیك ئامادەکردووە و ئاسایشی خۆیان لە پێناو ئاسایش و حەسانەوەی گەل داناوە.

یەکێك لە کارە گەورەکانی ئەوان چاپ و بڵاوکردنەوەی شوێنەواری بەنرخی هۆنەرە کوردەکانە. لەو دواییەدا رۆژنامەی کوردستان هەڵبەستێکی بەنرخی هۆنەری بەناوبانگی کورد کاك هەژاری لە چاپ داوە...

کارخانەی قەندی، یاسلسلەی مەشایخی نەقشبەندی یەکێکە لە جوانترین، بە کەڵکترین، وەپڕ ئیحساس ترین ئاثاری هەژار، وە تەنانەت دەتوانم بڵێم بە شاکاری وێژەی کوردی دەناسرێ. بڵاوبوونەوەی ئەو هەڵبەستە کە کەمە کەمە لە بیرمان دەچووەوە، سوودی زۆر گەورەی لێ وەردەگیرێ. ئەو هەڵبەستە بێجگەلەوەی کە لە چاو عیرفانەوە ئەثەرێکی بەرز و بێ وێنەیە، لە چاو کۆمەڵایەتییەوەش دەتوانین بەهرەی زۆری لێ وەرگرین. ئەوا بە کورتی سوودی کۆمەڵایەتی ئەوە دەخەمە بەرچاو:

**١ ـ چاپ کردنی ئەو هەڵبەستە بە کاك هەژار دەسەلمێنێ ـ با ئەو لە نێو ئێمەشدا نەبێ[1] با ئەو خۆمان لێ بشارێتەوە ـ هەر شتێکی بە قازانجی گەل و نیشتمان بە پێنووسی ئەو بنووسرێ ئێمە سوودی لێ وەردەگرین و بڵاوی دەکەینەوە.**

**٢ ـ بە برا شیعەکانمان دەسەلمێنێ کە: ئێمەش ئیمامەکانمان لە کن زۆر گەورە و پایە بەرز و ماقووڵن. وە شاعرەکانی ئێمە وا جوان بە ئیمامەکان و پێشوایانی دین هەڵدەڵێن.**

**٣ ـ بڵاوبوونەوەی ئەو پارچە شیعرە بەنرخە کە لەودا کاك هەژار ئیحساساتی مەزهەبی خۆی چاك دەرخستووە وە... ئەو تاقمە بە درۆوە ئەخاتەوە کە ئەڵێن هەژار شاعرێکی بێ دینە و لە مەکتەبی مادیدا پەروەوازە بووە... ئایا کەسێ کە وەها بە سۆزەوە لە خودا بپارێتەوە و بڵێ:**

**ئیتر من هەر بەوە ئومێدەوارم**
**کە تۆ نێوت کەریمە و من هەژارم**

**پیاوێکی مادی و بێ دینە؟! تا ئەو جێگایەی ئەمن تێ دەگەم، وە تا ئەو زەمانەی ئەمن هەژارم دەناسی، هەژار ئێرانی بوو، کورد بوو، خودانـاس و موسڵمان بوو... دەبێ هەموومان پشت لەیەك ببەستین، تێ کۆشین، هەوڵ بدەین و بە رابەری(....)[1] خۆشەویست و مەزن ئێران بکەینەوە. ئێرانێك کە چاوی کوێری پێ ڕووناك ببێتەوە.**

ژمارە (١٠٧) ل(٤، ٩)، شیعری (چارەنووسی شاعیر)، (٨) بەیتە، بەڵام لە (بارگەی یاران، ل١١٩)دا، (١١) بەیتە، کە بەیتی (٥، ٦، ١٠)ی (بارگەی یاران) زیادکراون و ئەمانە:

---

(١) لەو کاتەدا (هەژار) لە شاری بەغداد نیشتەجێ بووە.

(١) بۆ ڕێزهێشتنەوەی هێمن، ئەو جێگایەم بە چۆڵیی هێشتەوە و نەمنووسی.

**١ ـ لەسەر بەفرێ بەکارنایە، وەکو بیستوومە داوی رەش**
**لەسەر کولمەت ئەدی بۆ دلگرە ئەو بسکە تاتایە؟**
**٢ ـ هونەر ناتوانێ جوانی تۆ بە هیچ شێوێکی بنوێنێ**

**لە مەرمەڕ چۆن دەتاشرێ هەیکەلی ئەم بەژن و بالایە؟**
**٣ ـ بەتوو تووش تووشی مەکتەب بۆ دەهاتم من کە زانیبام**
**خەفەت، مەینەت، کەسەر، حەسرەت، بەشی ئینسانی زانایە**

١٣ ـ ژمارە (١٢٢) ل(٣، ٤)، شیعری (ماچی شیرین)، (بارگەی یاران) ل١٢١، بەڵام لە رۆژنامەی (کوردستان)دا، ئەم پێشەکییە بۆ ئەم شیعرە نووسیوە

**((.... ئاوالێکم دوو شیعری ـ ئەنوەری ـ بۆ خوێندمەوە، کە:**
**هر بلائی کز آسمان آید          گرچه بر دیگران قضا باشد**
**بزمین نارسیده میپرسد:          خانەی أنوری کجا باشد؟**

چونکە وەصفەلحالی برای خۆتان بوو، ویستم وەری گێڕمەوە سەر کوردی و بۆتانی بنێرم، وە ئەوا، وام بەسەرهێنا:

**هەر بەلاییك لە ئاسمانەوە بێ          با، لەوێش را نەهاتبێ بۆ من**
**کە گەیشتە زەوین، دەکا پرسیار          ئەرێ لە کوێ یە ماڵی کاك (هێمن)؟**

١٤ ـ ژمارە (١٢٣) ل١٠، شیعری (کەم تەرخەمی)، (٥) چوارینەیە، بەڵام لە (بارگەی یاران، ل١١١٨)دا، جگەلەوەی ناوی شیعرەکەی بۆتە (تووڕەیی)، هاوکات کۆپلەی پێنجەمیشی بواردووە، کە ئەمەیە:

**هێنده کێشاومه ڕەنجی بێهوده**
**پیربووم و تواموه، وەك شەم**
**شەرته تازه نەخۆم غەمی خەڵکی**
**خۆم بکەم شێت و مەست وکەم تەرخەم**

١٥ ـ ژماره (١٣٠)، ل(٢)، وتارێکی زۆر درێژی (هێمن)ی بـه ناوونیشـانی: (هەر له سایەی ئەمنیەتەوه، به هەموو ئاواتی بەرزی خۆمان دەگەین) تێدایه، که ڕۆژنامەکه ئەم چەند دێڕەی بۆ سەرەتای ئەو وتارەی (هێمن) نووسیوه:

هۆنەری بەناوبانگ و نووسەری تەواناى کورد، کاك ((سەید محەمەد ئەمین شێخ الاسـلامی ـ هـێمن)) وتـارێکی زۆر جـوانی سـەبارەت بـه پێشـکەوتنی شـاره خۆشەویستەکەی، یانێ شاری مەهاباد (سابلاغ) نووسیوه و بۆمانی نـاردووه، کـه له چاپی بدەین، تاوەکو هەموو برا کوردەکانمان لـه ئێـران و لـه دەرەوەی سـنووری نیشتماندا بزانن که شاری مەهاباد چۆن چـۆته پـێش، لـەم ژمـارەوه دەسـتی پـێ ئەکەین(١٣).

١٦ ـ ژمـاره (١٣١)، ل(٧) و (١١)، پاشمـاوەی وتارەکـەی ژمـاره (١٣٠)ی پێشوو.

١٧ ـ ژماره (١٣٢)، ل(١١)، پاشماوەی وتارەکەی ژماره (١٣١)ی پێشوو.

١٨ ـ ژماره (١٣٣) ل٤، دوو شیعر، یەکەمیان (هێلانەی بەتاڵ)، (٧) بەیته و له (بارگەی یاران، ل١٢٢)، (٩) بەیته، که ئەم دوو بەیته، له (بارگـەی یـاران)دا، بۆ شیعرەکه زیادکراوه:

**١ ـ ئەرێ ئەی ئاسکی ناسك، هەتا کەی دەستەمۆ نابی؟**
**ئەرێ پیرۆزەکەی خۆشفەڕ، هەتا کەی نایهماڵی من؟**
**٢ ـ گوتت: بۆت دێمه جێژوانێ، هەزار سوێندت به شاڵم خوارد**
**له ئاهی عاشقانەی من بترسه، نەك له شاڵی من**

هەروەها ئەم بەیتەی (٤)ی رۆژنامەی (کوردستان)یش:

**لە مێژە چاوەڕێی مەرگم، کەچی نایێ نەجاتم دا**
**شەوی هیجرانە بۆچی؟ وا درێژە ژینی تاڵی من؟**

لە (بارگەی یاران)دا، کە بۆتە دوابەیت، ئاوای لێکراوە:

**رەش و تار و درێژ و پڕ لە ئازار و خەم و دەردە**
**بەشی شەوگاری دووری بوو، سەراسەر ژینی تاڵی من**

پارچە شیعری دووەمی هەمان ئەم ژمارەیەش، بە ناوی (پەیمان شکێنی)یە و لە (بارگەی یاران، ل١١٧)دا، بۆتە کۆپلەی سێیەمی شیعری (موو ناپسێنم).
١٩ ـ ژمارە (١٣٤)، ل(١٢)، شیعرێکە لەم رۆژنامەیەدا بە بێ ناوونیشان بڵاوبۆتەوە، بەڵام لە دیوانی (بارگەی یاران)، ل(١٢٣)دا، بە ناوونیشانی: (گلێنەی شاعیر)ەوە بڵاوبۆتەوە و لەگەڵ ئەم دەقەی ناو رۆژنامەی (کوردستان)دا، جێگەگۆڕکێی هەندێ بەیتی پێکراوە.
٢٠ ـ ژمارە (١٣٨) ل٨، شیعری (ژیانم پڕ لە دەردە و نامرادی)، کە لە (بارگەی یاران، ل١١٧)دا، بۆتە کۆپلەی یەکەم و دووەمی شیعری (موو ناپسێنم).
٢١ ـ ژمارە (١٤٣) ل٣، شیعری (وڕێنەی رۆژوو)، کە لە (بارگەی یاران)دا نییە و ئەمە دەقەکەیەتی:

## وڕێنەی ڕۆژو

ئەمن ئەوڕۆکە پەیدام کردوە بۆ خۆم یەکی دیکە
بڕۆ خوێڕی! نەکەی تۆ بێ یە ئەو جێی ژوانە چی دیکە
بەڵی گرتۆمە یارێکی لەبار و ژیکەڵە و تازە
ئەتۆم ناوێ بەخێرهاتی، بڕۆ هەرچی دەکەی بیکە
کچێکی چاردەساڵەی نازەنینم دیتەوە بۆ خۆم
ئەتۆ کەڵکت نەماوە، هێندە پیری  بوویە ئەنتیکە
ئەمن ماچی دەم و لێوی ئەوم بۆ هەڵکەوێ ئاخر
چلۆن وازم دەچێتە تۆ، دەم و لەوست هەمووی لییکە
ئەتۆ پێت وایە لاجاینگ بە ڕشك و چاو بەڕیپۆقە
وەکوو تۆ، یارەکەی من، نایچووێنێ تە، نێزیکە
تەماشاکە سەر و بسکی، تەماشاکە دەم و چاوی
ببینە ئەو هەموو صابوون و پودر و ڕۆژ و ماتیکە
خەیاڵی وەی نەکەی، یارم وەکوو تۆ کورتەباڵایە
درێژ و خان و مان و نازەنین شووش باریکە
وەکوو تۆ گێژ و ناقۆلا و خوار و خێچ نییە هەی هوو
ئەوەندە راست و لیك لووس و قیتە، هەر دەڵێی پیکە
ڕەش و رووت و ڕەجاڵ وپیس و بێ دەرپێ نییە وەك تۆ
سەر و بەرگێکی خاوێنی هەیە، ئەڵبەتتە زۆر شیکە
لە وێنەی بەختەکەی من نێرگسی مەستی لە خەودایە
سەر و زوڵفی وەکو ڕۆژی منی بێچارە تاریکە
وەکوو خاسەکەوی کوێستانی کوردستان دەقاسپێنێ
ئەو و قوربان ئەتۆش لێت دێ وەکوو مەشکە دڕەزیکە
وەکوو دۆدانە دۆیە مەمکی تۆ ئەمما بە مەرگی تۆ
مەمۆڵەی ئەو کچەتیوە وەکوو لامپی ئەلکتریکە

**ئەگەر ووستەی بکەی ورتە لە زاری بێتە دەر ئاوجار**
**دەبێ منداڵی ئەو دێ یەت وە دووخەم بۆت بکەن فیکە**

***   *   ***

**وڕێنەی رۆژووە ئەو شیعرە بێ تامەی کە فەرمووتە**
**ئەگەر پێت ناحەزە کاکە ئەتۆ تێری دە چاکی کە**
**نیشانی کاك (.....) گەر بدەی ئەو پارچە هەڵبەستەم**
**دەڵێ ئەو شیعرە نەزمی تۆ نییە سەبکی کلاسیکە**
**شیعر لوطفی هەبێ، جا تازە بێ یا کۆن بێ هەر باشە**
**نیشانەی شاعری طـەبعی ڕەوان و فیکری باریکە**
**ئەمن دڵ بەستەیی هەڵبەستەکانی نالی و کوردیم**
**بلاّ، ئەو شاعیرە لاوە  بلێ (هێمن) فناتیکە**

ساڵێکی لە مانگی رەمەزان دا، دوو میوانم بوون کە هەمیشە لەسەر شـیعرەی تازە و کۆن کێشەیان بوو، ئەمنیش کە رۆژوو، نیـوە عـومر و شـپرزە و کەلـەلای کردبووم، ئەو پارچە هەڵبەستەم بۆ پێ کەنین نووسی

**مەهاباد ـ سید محمد امین شیخ الاسلامی (هێمن)**

٢٢ ـ ژمـاره (١٧٢)، ل(٣) و (١٠)، نامەیـەکی (هـێمن)ە، کـە ئەمـە دەقەکەیەتی:

**برا بەڕێزەکانم، نووسەرانی گەورەی ڕۆژنامەی خۆشەویستی کوردستان**

**لە پاش سڵاوی گەرم و سوپاسی زۆر: چەند ڕۆژ لـەوێ پـێش، چـوومە شـاری مەهاباد، لە ئاواڵێکی کۆن و لەمێژ و دۆستێکی نیزیك و بە ئەمەگم بیست، کە ئێوە لە نەگەیشتنی دیاری و نامەی من، پەشـێو و دڵگیربـوون. بـە راسـتی زۆر سوپاستان دەکەم و هەتا دەژیم، مەمنوونتانم، چـونکوو لـەو کوردسـتانە دوور و درێژەدا، بەڵکە لەو دونیا پان و بەرینەدا هەر ئێوەن، کە جاروبارە یادم دەکـەن و فەرامۆشتان نەکردووم.**

**لەوەی کە ساڵی ئەوساڵ هـیچ دیارییـەکم بـۆ ئێـوە نـەناردووە، بـە راسـتی شەرمەزارم، بەڵام بیر نەکەنەوە کە ئەمن لە خزمەتکردنی زمان و ئەدەبیاتەکـەم دڵسارد بوومەوە، هەتا رەگێکی تەڕم مابێ، هەرچی لە دەسم بێ، کۆتایی ناکەم، ئەمما داخەکەم سەرچـاوەی تـەبعم ویشـك بـووە، تەسـدیق دەفـەرموون: شـاعیر ئینسانێکی عادی نییە، نازانم شێت و نەزانە، یا ژیر و وریایە، هەرچی هەیە، وەك خەڵکی دی ناچێ. هەست و بیری دەگەڵ مەردم جیاوازە، وە ئەگەر وەك خەڵك بیر بکاتەوە، ناتوانێ شوێنەواری بە کەڵك لە پاش خۆی بەجێ بهێڵێ، ئـەمن جـاران شاعیر بووم و هیچم وەك خەڵك نەدەچوو.**

**دیتنی دیمەنێکی جوانی تـەبیعی، لەنجـەولاری کیـژێك، سـەیری هەڵپـەڕین و رەشبەڵەك، تەماشای گوڵ و شینکە، تیشکەی مانگ، گزینگی هەتاو، گوێ لـێ بوونی ئاهەنگی مووسیقا، قاسپەی کەو، ورینگەی بولبول بۆ من، ئیلهام بەخش بوون. وە هەروەها فرمێسکی ژنی زك سووتاو، کوڕووزەی هەتیوی بێ باب، فیزی دەوڵەمەند، ناڵەی هەژار، هەستی منیان دەهێنا جۆششەوە. بە کورتی بە هەموو شتی جوان و دزێوی ئەو جیهانە موتەئەثیر دەبووم، وە ئەو تەئەثـورە بـوو هـانی ئەدام هەستی خۆم دەربڕم و شیعر بڵێم، بەڵام بەداخەوە ئێستا پێ لێ دەنـێم کـە بوومەتە پیاوێکی عادی و شاعیر نیم، نەدەتوانم پێبکـەنم و نـەدەتوانم فرمێسـك هەڵوەرێنم. بۆچی وام لێ هاتووە نازانم؟ (....)[١٤] دەس تەنگی، لـێ قـەومان و تاڵی ژیان، ناهومێدی، بوونە هۆی ئەوە، یا شتێکی تر، بۆم لێك نادرێتەوە.**

**خۆشەویستەکانم! ئینصاف بدەن، کەسێکی مەجبوور بێ لە گوندێکی چووکی (٢٠) ماڵیدا، کە تاقە خوێندەوارێکی تێدا نەبێ، بژی و هیچ دڵ و خۆشێکی نەبێ، نە تەنیا هیچی تازە فێرنابێ، بەڵکە ئەوی دەشی زانێ، فەرامۆشی دەکا.**

**ئەوە حاڵی منی هەژارە، بەو حاڵەشەوە هیوادارم لە دوارۆژدا بتوانم زیاتر خزمەت بە زمان و ئەدەبیاتی کوردی بکەم، ئەوە دەگەڵ ئەو نامە، چەند پارچە هەڵبەستەی کۆن و تازەی خۆمم بۆ ناردن.**

٢٣ ـ ژمارە (١٧٣)، ل(٢)، پاشماوەی نامەکەی ژمارەی پێشووی (هێمن)ە، کە دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی (کوردستان)، ئەم پۆزشەیان لەو بارەیەوە نووسیوە:

(لێمان ببوورن کە لە نامەکەی مامۆستا هێمن، کە لە ژمارەی پێشوودا لە چاپمان دا، ئەم چەند واتەی خوارەوە داکەوتبوو):

**رۆژێك پۆلێك لە لاوە تازەپێگەیشتوو وە خوێندەوارەکانی شارەکەمان دەورەیان دابووم، وە رەخنەیان لێ دەگرتم، کە بۆچی هەڵبەستەی تازە دروست ناکەی؟ گوتم: براکانم مەسئەلەی مەشهوورە!! هەرکەس گوێزان لە هەنبانەی خۆی دەژمێری))، ئێوە ئاگاتان لە حاڵی من نییە و نازانن لە چ مەحروومییەت و چارەڕەشیدا دەژیم.**

**دوای ئەوە پرسیم: مەگەر ئێوە عەلاقەتان بە ئاثاری من هەیە؟ تێکڕا بەسەریاندا قیژاندم و گوتیان: جا چۆن وا دەفەرمووی؟ مامۆستا! گوتم: ئەگەر راست دەکەن، هەریەك لە ئێوە چەند کتێبێکم بە ئەمانەت بۆ بنێرن، کە پاش خوێندنەوە، بە ئەحمەقیشم بزانن، بۆتانی دەنێرمەوە، بەڵکە موتالا بتوانێ کەمێك لە نارەحەتی و تەنیایی من کەم بکاتەوە. هەموویان گوتیان: بەچاوان، بەڵام بە گیانی ئێوە هەردوو کتێبم پێ گەیشتووە.**

هەر لە هەمان لاپەڕەدا و دوای تەواوبوونی ئەو نامەیە، شیعرێکی (هێمن)ی تێدایە، بە ناوی: (سایەی غەم) کە هەر ئەم شیعرە (لەگەڵ هەندێ جیاوازییدا)، لە (بارگەی یاران)، ل(١١٩)دا، بە ناوی: (بۆسەی رۆژگار)ەوە بڵاوبۆتەوە، بەڵام لە (بارگەی یاران)دا، بەیتی (٣ و ٤)ی پێ زیادکراوە و بۆتە (٩) بەیت و بەیتی ژمارە (٥)ی ئەوەی رۆژنامەی (کوردستان)یشی لێ دەرهاوێژراوە، کە ئەم بەیتەیە:

**دەردی بێ دەرمانی من، چارەی بە هیچ کەس ناکرێ**
**چونکو دەرمانی نییە، بێجگە لە: ماچی دەم نەبێ**

٢٤ ـ ژمارە (١٧٤)، ل (٣ و ٤)، شیعرێکی (هێمن)ی بە ناوی (خاوەنی زێـڕ) تێدایە، کە ئەم شیعرە (بە جیاوازییەکی زۆرەوە) لـە (بارگـەی یـاران)، ل (٦١)دا هەیە. بەڵام هەردوو شیعرەکە، لە هەردوو جێگەکەدا، هەر تەنیا ناوونیشانەکەیان: (خاوەنی زێڕ) وەك یەکە، ئەگینا سەرومڕی هـەردوو دەقەکـە، زۆر جیـاوازن و بـۆ ئەوەش خوێنەران زۆر بە وردەکاریی جیاوازییەکانییەوە خەریك نەکەین، دەقەکـەی رۆژنامـەی (کوردستان) بۆ ئێرە دەگوێزینەوە، تا خۆیان لەگـەڵ دەقەکـەی (بارگـەی یاران)دا بەراوردی بکەن:

**((خاوەنی زێڕ))**

**ججێل چاك و لەبارە، خاوەنی زێڕ**
**ئەگەر پیرێکی خوێن تاڵە و ورگ تێر**
**رەزا شیرینە، شۆخە، قیت و قۆزە**
**ئەگەر خینگە زلە و خوار و شەل و گێڕ**

**قسەزانە، ئەدیبە، خوێندەوارە**
**ئەگەر نەی خوێندبێ، شەش پیت و دوو دێڕ**

**سڵاوی لێ دەکەن، سەر دادەخەن بۆی**
**لە رێ باز و لە کۆڵان و لە بازێڕ**

**بەڵام زێڕت نەبێ، سووکی، ئەگەر تۆ**
**بڵێی دەرسی هەزاری وەك (شکسپێر)**

٢٥ ـ ژمـاره (١٧٥) ل١١، شـيعری (ئـارەزووی فـڕین)، (٧) کۆپلەیـە، لـە (بارگەی یاران، ل١٠٩)دا، (٦) کۆپلەیە، کە ئەم کۆپلەیەی تێدا نییە:

**خێوی بیرێکی بەرز و رووناکم**
**کەچی لە لایان پەستم و نەوی**
**ئەمن کە دەڵێی ئاوونگی پاکم**
**نازانم بۆچی هاتمە سەر زەوی؟**

٢٦ ـ ژمارە (١٨٤)، ل (٤، ٩، ١٠)، لەو چەند لاپەڕەیـەی ئـەم ژمارەیـەدا (هێمن) چیرۆکێکی بە ناوی (کوڕ) تەرجەمە کردووە، کە رۆژنامەکە و (هـێمن)یش ئاماژەیان بە سەرچاوەی وەرگێڕان و زمانی دەقەکـە نـەکردووە[١٥]. مـن بـە بـیرم نایەت ئەم تەرجەمەیەی (هێمن)م لە سەرچاوەیەکی تردا بەرچاو کەوتبێ، بۆیە پێم باش بوو بۆ ئێرەی راگوێزم:

# کوڕ

## وەرگێڕاو لە کتێبی هەفتە ـ بە پێنووسی: مامۆستا هێمن

بەرەبەیانی رۆژێکی رەش و تاڵ بوو، هەموویان بە ڕیز لە لێواری کەنداڵێکدا راگرتبوون، دە کەس بوون کە بڕیاری کوژرانیان درابوو، لە نێو ئەوان را کوڕ و بابێك هەبوون کە دەستی هەردووکیان پێکەوە بەسترابوو. دەستی راستەی باب و دەستی چەپەی کوڕ بەرەڵلا بوو. بێدەنگ سەریان داخستبوو، ماندوو و شەکەت دەهاتنە بەرچاو، لە تەنیشت یەکتر راگیرابوون، مچ و مۆڕ و بەسام بوون، ردێنیان نەتاشیبوو.

ئەفسەری فاشیست گوتی: دەی بیرت کردووەتەوە.

کوڕ گوتی: نا.

ئوستاشا[١٦] بە رقەوە لێی مۆن بووەوە، کوڕ تێکۆشا خۆی ئازا و نەبەز نیشان بدا، بەڵام سەر و ملی دەلەرزی، شان و پیلی دێشا، زۆر ماندوو و شپرزە بوو، ئەفسەر سەربازەکانی لە بیست هەنگاوی کەنداڵەکەوە بە ریز راگرتن، وە فەرمانی دا فیشەك بخەنە تفەنگ، دەنگی چەخماخان هات، کوڕ ئاوڕی بۆ لای کەنداڵ داوە، کەندناڵ لەبەر چاوی ئەو، قوڵ و پان و پڕ لە لیتە بوو، هەموویان لێرەدا دەنێژرێن. کوڕ لەبەر خۆیەوە گوتی: لێرەدا...

لەرزی و پتر لەوە نەیوێرا چاو لە کەنداڵ بکا، باب بەژنێکی بەرز و نێوچاوانێکی مۆن و گرژی هەبوو، بە هەموو هێزی خۆی هەوڵی دەدا کۆم نەبێتەوەن زۆریان لێدابوو، جەزرەبە درابوون لە لەش و چڕ و چاویدا نیشانەی جەزرەبە دیاربوو ـ سەربازەکان بەرەو رووی کەنداڵ بە ریز راوەستابوون تفەنگیان لە دەسدا بوو، چاوەنۆڕی فەرمانی ئەفسەری خۆیان بوون تا دەسرێژ بکەن، دەیانویست

هەرچی زووتر ئەو کارەساتە دوایی بێن. لە چاوی هێندێکیاندا بێزاری و ماندوویی وە لە چاوی ئەوانی تردا دڵسۆزی و بەزەیی دەبیندرا.

دەی بیرت کردۆتەوە؟

کوڕ گوتی: نا!

ئەفسەر پێکەنی و گوتی: بە جەهەننەم ... لەبەر تۆمە، کوڕ بە قینەوە چاوی لێ کرد، لەو چاو لێکردنەدا رق. بێزاری دەبیندرا، وەك سەگ و گورگ تێك دەفکرین.

هەموویان لە لێواری کەنداڵ، لە لێواری گۆڕ کۆکردبوونەوە، لە تاو ژان و ماندوویی توانای راوەستانیان نەمابوو، شتومەکیان بزگوڕ، بزگوڕ بوو، زۆرداران جل و بەرگی ئەوانیان بە ئامرازی جەزرەبە شڕۆپەتۆڕ کردبوو، بە میلی ئاسن لێیان راکێشابوون، چارەڕەش و بێهیوا، بە جل و بەرگی شڕ و کڵاوی دڕاوەوە رێزێکی خوارو خێچ و بەرز و نەوییان پێکهێنابوو، هەموو دەمێك بیردەکراوە لەبەر ماندوویی سللار ببنەوە، باب کڵاوێکی لە پێستی بزنی رەش لەسەر بوو، کڵاوی کوڕی لە خوری سپی بوو، سمێڵی باب رەش و ئەستوور بوو، نووکی بادرا بوو، کوڕ لە مێژبوو ردێنی نەتاشیبوو، تووکی زەرد و تەنك سەر و رووی داپۆشی بوو، ئەفسەر لە پشت سەربازەکان راوەستا و فەرمانی دا ئامادە ...... لە پاشان گوتی:

لە چەپەوە بۆ راست سێ، سێ، تیرەبارانیان بکەن، دوایی قیژاندی: هەرسێ سەربازی، یەکێك بکەنە نیشانە.

دیسان وەك دڵنیا نەبووبێ کە سەربازەکان لە فەرمانی ئەو گەیشتبن، دووپاتی کردەوە: لە چەپەوە بۆ راست، سەربازەکان سێرەیان گرت ((ئاوڕ)).

تەقەی گوللە هات، دووکەڵی رەش لە لوولەی تفەنگەکان هاتەدەر، سێ کەس کەوتنە کەنداڵ، خەریك بوو چوارەمیش دەگەڵ خۆیان سەر و نخوون بکەن، هەرچۆنێك بوو خۆی راگرت، یەکجار پەشێو بوو، دەتگوت: پێی خۆش بوو ئەویش مردبا، کاری تەواوبووبا، ئەوە کوڕەکە بوو.

ئەفسەر پرسیاری کرد: دەی؟

کوڕ گوتی: نا!

ئەفسەر فەرمانی دا تفەنگ پڕ بکەنەوە، دەس بە جێ قیژاندی: ئامادە! لوولەی سێ تفەنگ بۆ لای سینگی کوڕ راداشترا.
لەسەرەخۆبە!...
ئەفسەر بە سەربازەکانی گوت: دەسڕێژ مەکەن، دەتگوت بە ئاواتەوە بۆ کوڕێکی تازەپێگەیشتوو لە مردن رزگار بکا، تەنانەت دڵخۆشیش بوو، وە لەوەی کە کوڕ بیری خۆی گۆڕیوە، رازی دەهاتە پێش چاو، کوڕ باڵابەرز و لاواز بوو، رەنگی بزرکابوو، پاڵتۆیەکی کەسکی درێژی لەبەردابوو، گوێزینگی دەگرت.
وەك چارەنووس، بێ بەزەیی و دڵ رەق بوون، ئەفسەر بە سەربازەکانی گوت: بحەسێنەوە، دەنگی لەرزۆك بوو:
دەی؟ دە رۆژ بوو لەسەریەك ئەوەی بە کوڕەکە گوتبوو، وەڵامی ((نا))ی پێ درابۆوە، هەر گوتبووی:
دەی؟ وە کوڕ وەڵامی دابوەوە: نا!... دە رۆژی تەواو وەخت و بێ وەخت ئەو پرسیار و وەڵامە دووپات کرابۆوە، هەردووك لاسارییان دەکرد. هیچ کامیان لە بیروڕای خۆیان لانەدەدا و ئێستا کوڕ بەزیبوو. وە دەیگوت:
لەسەرەخۆبە!....
ئەفسەر لە کوڕی ویستبوو بە دەستی خۆی بابی بکوژێ و لەباتی ئەو کارە، ئازاد دەبێ و لە مردن رزگار بکرێن، ئاواتی ئەوەبوو بەندییەکان یەکتر بکوژن، نەخۆشی رۆحی هەبوو، کاتێ ئەوان بەگژیەکدا دەچوون، شاگەشکە دەبوو و پێدەکەنی کە خۆی ئەوەندە بەزاکون دەدیت، زۆر شاد دەبوو، وە ئێستا لە هەمیشە زیاتر، چونکو دەیدیت بە فەرمانی ئەو، کوڕێك خەریکە بابی خۆی بکوژێ. ئەفسەر لە پێشدا لە بابی ویستبوو کە بە دەستی خۆی رۆڵەی لاوی لە خوێناو وەردا و لە پاداشتی ئەو کارەدا ئازاد بکرێن، بەڵام پیرەپیاو تورە ببوو، وە تەنانەت تفی لە نێو چاوان کوتابوو، ئەفسەر لە پاشان بیروڕای خۆی گۆڕی و ئەو کارەی لە کوڕ ویست و گوتی: (ئەتۆ ئازاد دەکەم).
کوڕ دە رۆژی تەواو خۆی راگرتبوو و نەچۆبووە ژێربار و ئێستا جارێکی تر ئەفسەر لێی دەپرسێ: دەی؟ کوڕ لاڵ و پاڵ بوو.

ئەفسەر گوتی: لە بیرتە چ وادێکم پێ داوی؟ توندی دەدواند تا هەموویان گوێیان لێ بێ و لە مەبەستی بگەن. کوڕ چاوێکی پڕ لە ناهومێدی لە باب کرد و لەبەر خۆیەوە گوتی: ناتوانم...

باب بە بەژنێکی راست و هەروا بێ دەنگ راوەستابوو، دەتگوت تارمایی لەعنەت و بێزارییە.

ئەفسەر رووی لە سەربازەکان کرد و فەرمانی دا: ((ئامادە)). کوڕ نالاندی لەسەرەخۆبە...

جا بۆ؟ کوڕ گوتی: کوتکم وێدە، ئەفسەر قیژاندی: ئەگەر مێشکی پرژ و بڵاو بکەی لە مردن رزگار دەبێ، کوڕ دووپاتی کردەوە: کوتکم وێدە، زۆری لە خۆی دەکرد، وەك شێتان نەقیژێنێ.

ئەفسەر، دەستوری دا، دەستی کوڕ بکەنەوە سەربازێك کوتکی هێنا، کوڕ لێوی کورۆت، رەنگی بە روودا نەمابوو.

باب چاوێکی سووکی لە لای کوڕ کرد، بەڵام کوڕ بەری هەڵنەهێنا، تا چاوی بە چاوی باب نەکەوێ ـ وێ دەچوو لە دڵی خۆیدا بڵێ، بابم زۆریش بێ تاوان نییە، چەندی لە دایکم دەدا، هۆی گیرانی ئێمە ئەوبوو، ئەو ئەمنی تووشی ئەو داوە کرد، ئەفسەر دەستی لەسەر شانی کوڕ دانا!...

باب بە تەنێ ماوە. فرمێسکی لە چاودا قەتیس ما، دڵۆپێك فرمێسکی لە چاوی هاتە خوار و بە کوڵمیدا خولۆر بووەوە و لە نێو مووی سمێڵیدا شاردراوە.

ئەفسەر بە پێکەنینەوە گوتی: کوتك هەڵگرە، نیشانەی شادی لە سیمایدا دەبیندرا، کاتێکی خۆشی رادەبوارد.

لەبەرئەوەی کە توانیبووی یەکێك لە بەندییەکان ئەوەندە بچووك و پەست بکاتەوە، شایی لە دڵدا دەگەڕا. کوڕ کوتکی بەدەستەوە گرت، ئەفسەر گوتی: بە زەبرێك، سەربازەکان بە بێزاری تەماشای ئەو کارەساتە دزێوەیان دەکرد، ئەفسەر گوتی: بە هەردوو دەست، کوڕ گوتی زۆر چاکە... دەتگوت: هێزی لێ بڕاوە.

دەست و هەموو گیانی دەلەرزی. کوتك ئارام بە دەوری سەری کوڕدا هەڵسوڕا، ئەفسەر هەڵسوڕانی کوتکی تەماشا دەکرد، لەو کاتەدا چاوی بە باب کەوت، پیرەپیاو بێ دەنگ و بێ جووڵە جووڵ راوەستابوو.

ژیان، تێیگەیاندبوو کە تازە نابێ هیوای بە هیچ هەبێ، کوتك بە توندی لە هەوادا هەڵدەسوڕا، ئەفسەر و پیرەپیاو هەردوو چاویان تێبڕیبوو. لە پڕ هەموو ئەو کەسانەی کە چاویان لەو کارە پڕ لەسامە بوو، لە جێگای خۆیان وشك بوون، کوڕ کە رق و بێزاری هەموو لەشی داگرتبوو، زۆر بە چالاکی بە دەوری خۆیدا سوڕا وە بە هەموو هێزی خۆی کوتکی لە تۆقی سەری ئەفسەر دا، ئەوجار دوو زەبری دیشی لێدا، کوتکی خوێناوی بۆ لای سەربازەکان هاویشت و بە دەنگی بە سامەوە قیژاندی: ئەوجار دەسڕێژ بکەن، بزەیەکی پڕ لە دەرد، لێوی بابی لێك کردەوە.

* * *

## مانای وشەی کوڕ

مچ و مۆڕ: رووگرژ و نێوچاو تاڵ
ردێن: ریش
شپڕێو: شپرزە
ئاوڕ: لاکردنەوە
پتر: زۆرتر
بزرگوڕ، بزگور: پژگ و بڵاو
ئامراز: وەسیلەی جەزرەبە و ئەشکەنجە
خوار و خێچ: لار و چەوت
سللار: هاتنە لا و مردن
دوپاتە: دووبارە
سێرە: نیشانە
راداشتن: روو بە روو راگرتن
رەنگ بزڕکان: رەنگ پەڕین
کەسك: سەبز
گوێزنگ: قولاپەی پێ
بێ بەزەیی: بێ رەحم
لاسار: لەنج، پێداگرتن
زا کون، زۆردار، بەدەسەڵات
وێ دە: بدە
قەتیس: گیر، بەند
دزێو: پیس و ناشرین

٢٧ ـ ژماره (١٨٥) ل٦، شیعری (کیژی لادێی)، (١٧) بەیتە و لە (بارگەی یاران، ل٧٠)دا، (١٥) بەیتە، کە ئەم دوو بەیتەی (٦) و (١١)ی تێدا نییە:

**٦ ـ گەردنت وەکو مینای بلوورە**
**بێ ڕۆژ و ماتیك، لێوی تۆ سوورە**
**١١ ـ بێ فڕ و فێڵ و پاك و خاوێنی**
**کچێکی وەك تۆ، پاکە داوێنی**

٢٨ ـ ژماره (١٨٦) ل٣، شیعری (تۆم هەر لە بیرە). (بارگەی یاران، ل٦٩).

٢٩ ـ ژماره (١٨٧) ل(٣، ١٠)، شیعرێکی بێ ناوونیشانە و لە (بارگەی یاران)دا نییەو ئەمە دەقکەیەتی:

**گوڵی گەش بە بای شەماڵی بەهار، ئەشنێتەوە**
**قاسپەی کەوی کەژ، بەرانبەر نزار، بەرز ئەبێتەوە**
**من کە دیم لەرەی شەپۆلی شنەی....[1] کوردستان**
**تێکەڵاو ئەبێ لەگەڵ جریوەی ئەستێرەی بەیان**
**ئەوکاتە هیوا و ئامانجی دوورم، هەردوو پێکەوە**
**ئەبن بە پرشنگ، گوڵاڵەی سوورم، ئەگەشێتەوە**

٣٠ ـ ژماره (١٩٤) ل١١، شیعری (گێژەڵوکەی خەزان)[2]، (٢٥) بەیتە و لە (بارگەی یاران، ل١٢٣)دا، (٢١) بەیتە، کە ئەم بەیتانەی (٣، ٦، ١٠، ١٣، ١٤)ی ڕۆژنامەکە، لە (بارگەی یاران)دا نین و ئەمانەن:

---

(١) لە دەقەکەدا ئەو جێگەیە هەروا چۆڵ بوو، پێدەچێ وشەی (ئاڵا) بێ، کە لەگەڵ وشەی دواییدا، دەبنە (ئاڵای کوردستان).

**١ ـ هەڵ دەوێزنێ بیساتی دڵ خۆشی**
**دای دەمەزرێنی حوزن و خامۆشی**
**٢ ـ بێ ئەوەی هەر مچوڕکی پێدا بێ**
**کوڕ لە گریان دەکا لە سوێی بابێ**
**٣ ـ بزەێیك نابینی لەسەر لێوێ**
**چاوە، فرمێسکی خوێن دەپاڵێوێ**
**٤ ـ نەبوو قەت فاجعەی ئەوەندە بەسام**
**سێ برا، پێکەوە بڕن ناکام**
**٥ ـ دەستی تەقدیر لەت لەتی کردن**
**گورگی برسی ئەجەل هەمووی بردن**

٣١ ـ ژمارە (٢٠٠) ل١١، شیعری (شینی گۆران)ی شاعیر، (٢٥) بەیتە و لە (بارگەی یاران، ل١٣٢)دا، (٢٦) بەیتە و وردە جیاوازییەکی زۆریش لە هەردوو دەقەکەدا هەیە، بۆیە پێم باشە، بە مەبەستی بەراورد، دەقەکەی رۆژنامەی (کوردستان) بۆ ئێرە راگوێزم:

---

(٢) لە رۆژنامەکەدا بۆنەی شیعرەکەی ئاوا نووسیوە: بە بۆنە پێشاتە ناگەوارەکەی مەهاباد و کوژرانی سێ براکەوە.

## شینی گۆران

**مامۆستا: هێمن**

**هەر لە بۆتانەوە هەتا سۆران**
**هەموو سۆرانی شینە: بۆ (گۆران)**
**هەر لە کوێستانەوە هەتا گەرمێن**
**یەخەمان دادڕییوە تا دامێن**
**لە جزیرە هەتاکوو دەریای رەش**
**نییە کوردێك سەری نەنابێ لە هەش**
**لە دیاربەکرەوە هەتا ورمێ**
**شان بە قوڕ، مل بە کوێنە، نێر و مێ**
**هەر لە ئامێدەوە هەتاکوو سنە**
**کوردە غەمناکە، چ پیاو چ ژنە**
**لە مەریوانەوە هەتا زرێبار**
**وەك زرێ بارە چاوی کوردی هەژار**
**هەر لە بۆکانەوە هەتا جوانڕۆ**
**جوان و پیر پێکەوە دەڵێن: ئەی رۆ!**
**لە دەهۆکا هەتاکوو هەورامان**
**هەرچی دەی بینی هەر دەڵێ: ئامان**
**هەر لە زاگرۆسەوە هەتا ئاگری**
**کێ یە کورد بێ و ئەتۆ بلێی ناگری**
**لە سولێمانیا، هەتا سابلاخ**

دیارە تێدا نییە دڵی بێ داخ
هەر لە بیجاڕەوە هەتا شەمزین
کچ و کوڕ لاو و پیری کورد، شەمزین
لە شنۆوە هەتاکوو سەنجابی
تووشی کوردێکی شادمان نابی
هەر لە هەولێرەوە هەتا پاوە
گەلی ئێمە پەشێو و داماوە
لە هەڵەبجە هەتا دەگاتە سەقز
هەموو غەمبارە، ڕەنجەڕۆیە و کز
هەر لە بتلیسەوە هەتا سونقور
ژن و پیاو پێکەوە دەپێون قوڕ
لە نووسبینەوە، هەتا کەرکووك
شینی گۆران دەکەن، چ گەورە و چ چووك
ئەوەیە حاڵ ـ وەکو ئێرە، وان
خەبەرم نییە چلۆنە ئێرەوان

* * *

جا، چلۆن دڵ بەغەم نەبین، نەگرین؟
جا چلۆن کۆڕی شینی بۆ نەگرین؟
شاعرێك بوو، بەنرخ و بێ وێنە
بیری روون تر بوو زۆر لە ئاوێنە
خاوەنی بیر و ذەوق و حیسس و هەست
ڕەنگ بوو نێوی بنێن: (خودای هەڵبەست)
فەخری کوردانە گەنجی ئاثاری
شیعری شیرین و ورد و ساکاری
داخەکەم ئەو بلێسە دامرکا

که خەریك بوو: وڵاتی روونترکا
گڵی پێدا کرا، هەتا دامرد
ئەو گڕەی کوردەواری رۆشن کرد
پێم پەری شیعر و مۆسیقا تۆران
بۆیە بردیانەوە بەهەشت گۆران
یا خودای گەورە، توڕەبوو لێمان
ئەو چرایەی رەوا نەدی پێ مان

شیلان ئاوێ ـ سابلاخ ـ ١٦ی رەشەمێی ٢٥٧٤

## پەراوێز:

(١) ئـەم لێكۆڵینەوەیـە لـە ژمـارە (٣٠)ی ڕۆژنامەكـەوە تـا دوا ژمـارەی ڕۆژنامەكە (جگـە لـە یـەك دوو ژمـارە)ی، واتـە: (١٧٩) ژمـارەی ڕۆنامەكـەی گرتۆتەوە و ئێستا ئەو لێكۆڵینەوەیەم كۆكردۆتەوە و ئامادەی چاپم كردووە.

(٢) دكتۆر محەمەد سدیق مـوفتی زادە، سـەرنج و پێشـنیاری زۆر زیرەكانـە و زانستانەی لەسەر ڕێنووسی كوردی نووسیوە، وەك ئـەوەی لـەجیاتی (واو) و (ی)ی درێژ، (سەر: فەتحە)ی بۆ پێشنیار كردووە، كە (كـۆڕی زانیـاری كـورد)، لـە دوای دروستبوونی (١٩٧٠)، لە بارەی ئەو دوو پیتەوە، پێشنیارە دێرینەكـەی (مـوفتی زادە)یان پەسەند كردووە و لەسەر لەبەری بەرهەمی چـاپكراوی ئـەو قۆناغەیانـدا، پیادە و پیڕەویان كردووە.

(٣) بۆ زیاتر زانیاریی، بنوارە: بارگەی یاران، سەرجەمی شیعری هێمن (واتـە: چاپی دووەمی: تاریك روون)، چاپەمەنی دەسگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٤٠.

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٤.

(٥) دواتریش: بارگەی یاران.

(٦) شوێن: مەبەست لە (بەرهەم)ی نووسینە. كە دیارە تەرجەمەكراوی (**أثر**)ی فارسییە.

(٧) دەقی نووسینەكەم وەك خۆی بۆ ئێرە ڕاگواستووە.

(٨) فەرخە: بێچوو، بەچكە.

(٩) نەتەویی، دوژمنت (لە دەقەكەدا ئاماژەی ـ پەراوێز ـ ی لەسەر ئەم وشەیە داناوە، بەڵام پەراوێزەكەی بۆ نەنووسیوە.

(١٠) مەبەسـت لـە (كـورش: ٥٥٩ ـ ٥٢٩ پـێش زایـین)ی شـای (هەمەخامەنشی)ییە.

(١١) سووروسـات: مەسـرەفی ئالیـك و پێویسـتی وڵاخـی باربـەری جـەنگ و لەشكركێشی.

(١٢) بمبی: مەبەست شاری (بۆمبی)ی هیندستانە.

(١٣) بەشێکی وتارەکەی (هێمن) لەم ژمارەیەی رۆژنامەکەدایە و پاشماوەکـەی لە دوو ژمارەی داهاتوودا بڵاوبووەتەوە، ئەم وتارەی (هـێمن) سـەبارەت بـە بـاری پێشکەوتن و ئاوەدانی شاری (مەهاباد) ە.

(١٤) ئەو وشەیە کاڵ بوو، نەخوێندرایەوە.

(١٥) بەڵام رۆژنامەکە هەر ئەوەنـدەی نووسـیوە، کـە لـە (کتـێبی هەفتـە)وە تەرجەمە کراوە!

(١٦) (خەڵکی یۆگسلاوی بە فاشیستەکانیان دەگوت: ئوستاش).

(١٧) هێمن ئەم چەند وشـەیەی خـوارەوەی راڤـە کـردووە، کـە لـە تـەك ئـەم وەرگێڕانەدا، ئەو وشانەشمان بۆ ئێرە گواستۆتەوە.

## بەرهەمی چاپکراوی نووسەر

١. ژووان، شیعر، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، (١٩٨٠).
٢. گەشتی ریچ بۆ سلێمانی، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، بەرگەلوو، (١٩٨٤).
٣. کێشەی کورد، وەرگێڕان چاپی یەکەم، یاخ سەمەر، (١٩٨٦).
چاپی دووەم، ئێران، تەورێز، (١٩٩٠).
چاپی سێیەم، هەولێر، (١٩٩٢).
٤. گوڵەکانی دۆزەخ، شیعر، چاپی یەکەم، ئێران، تەورێز، (١٩٩٠).
چاپی دووەم، هەولێر، (١٩٩٢).
٥. گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، ئێران، تەورێز، (١٩٩٢).
چاپی دووەم، ئێران، تەورێز، (١٩٩٥).
چاپی سێیەم، هەولێر، (٢٠٠٢).
چاپی چوارەم، هەولێر، (٢٠١١).
٦. ئەفسانەی ئەدونیس، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، ئێران، تەورێز، (١٩٩٤).
٧. گۆرانی کوردی، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، ئێران، تەورێز، (١٩٩٤).
٨. مێژووی مۆسیقای کوردی، چاپی یەکەم، ئێران، شەهری کورد، (١٩٩٤).
چاپی دووەم، هەولێر، (٢٠٠٢)، دەزگای ئاراس.
چاپی سێیەم، هەولێر، (٢٠٠٨)، دەزگای موزیك و کەلەپووری کورد.
چاپی چوارەم، هەولێر، (٢٠١٣)، دەزگای موزیك و کەلەپووری کورد.
٩. سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانی، چاپی یەکەم، هەولێر، (١٩٩٨).
چاپی دووەم، هەولێر، (٢٠٠٢)، دەزگای ئاراس.
١٠. راوە گزنگ، وتار و رەخنەی ئەدەبیی، چاپی یەکەم، هەولێر، (١٩٩٨).
١١. بیرەوەرییەکانی وەفایی (تحفه المریدین)، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (١٩٩٩). ،چاپی دووەم ، هەولێر، (٢٠١١).
١٢. کەروێشکی زیرەك و گورگی دانا، چیرۆکی منداڵان، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، سلێمانی، (٢٠٠٠).

١٣.  شۆرشی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، چاپەمەنی موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٠).

١٤.  میرنشینی ئەردەڵان، بابان، سۆران، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٠).

١٥.  راپەڕینی هەمزائاغای مەنگور، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٠).

١٦.  کەروێشك و تانجی، چیرۆکە شیعر بۆ منداڵان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٥).

١٧.  دیوانی ئەدەب (عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان)، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٦).

١٨.  أفتتاح ناسری، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، نووسینی عەلی ئەکبەر سەرهەنگ، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٧).

١٩.  شۆرشی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، نووسینی عەلی خان گۆنەخان ئەفشار، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٧).

٢٠.  شۆرشی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، ئینگلیزی و ئەمەریکاییدا، نووسینی وەدیع جوەیدە، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٧).

٢١.  شۆرشی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، نامەی دەرباری و سەربازییانە. نووسینی حەسەن عەلی خان، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٧).

٢٢.  شۆرشی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە بەڵگەنامەی قاجارییدا، بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٧).

٢٣.  شۆرشی شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری، لە بەڵگەنامەی ئەرمەنیدا، نووسینی ئەسکەندەر غۆریاس، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠٠٧).

٢٤.  موزیك و گۆرانی کوردی، کۆمەڵە وتار، چاپی یەکەم، هەولێر، (٢٠١١).

٢٥.  بیرەوەرییەکانی د. سەیید عەزیزی شەمزینی (ئامادەکردن و پەراوێز بۆ نووسینی) محەمەد حەمەباقی.

٢٦.  سەفەرنامەی ژان ئۆتەر، وەرگێڕان لە فارسییەوە، خانەی موکریانی، هەولێر (٢٠١٣)

٢٧.  ئەفسانە و تەم، (کۆمەڵە وتارێکی تەرجەمەکراو).

## بەرهەمی داهاتوو

١- مەولانا خالید ـ خوێندنەوەیەکی نوێ

٢- مەولەوی تاوەگۆزی ـ خوێندنەوەیەکی نوێ

٣- سمکۆی شکاك ـ لە بەڵگەنامەی ئێرانیدا

٤- نامە و بەڵگەنامەی بەجێماوی عەبدوڵڵابەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب.

٥- چاپی نوێی دیوانی عەبدوڵڵابەگی میسباح دیوان ـ ئەدەب.

٦- دیوانی مەولەوی تاوەگۆزی

٧- کورد لە سەفەرنامەی بیانیدا

٨- بیرەوەرییەکانی لیتن ـ کونسوڵی ئەڵمانیا لە تەورێز ـ ١٩١٤

٩- مەولەوی رۆمی ـ بەسەرکردنەوەی ژیان و بەرهەمی

١٠-کورد لە بەڵگەنامەی ئێرانیدا

١١-کۆمەڵێك بەرهەمی وەرگێڕدراو ـ لە فارسی و عەرەبییەوە.

١٢-نالی و زمانی نالی ـ خوێندنەوەیەکی نوێ